# پێشەکی

ئەم بەرهەمەی بەردەستتان بەتەنیا لێکۆڵینەوەیەک نییە، کە بۆ زەمەنێکی دیاریکراو و لەسەر بابەتێکی دیاریکراو نووسرابێت، ئەوەندەی پرۆژەیەکی گەورەی بیرکردنەوەیە، کە ئێمە لە ژیانی رۆژانەی خۆماندا درێژەی پێ دەدەین و رۆژانە لەسەر ئەم تیۆرییانە لە هەوڵداین، ئەم بنەما گشتییانە بخەینە بەردەم رای جیاواز و تاقیکردنەوەی جیاواز. هەتا تەواو دڵنیا بین و بە بەڵگەی عەقڵی ئەم بنەمایانە پشتراست بکەینەوە، یاخۆ دەستی لێ بەربدەین. بۆیە لێرەوە بانگەوازی خۆمان رادەگەیێنین بە رووی ئەوانەی ئەم بەرهەمە دەخوێننەوە دواتر هەست دەکەن بەڵگەی عەقڵانییان لایە لەسەر پووچەڵکردنەوەی ئەم بیرکردنەوانە، کۆمەکی ئەو بۆ ئێمە گەورەترین خزمەت بەبیرکردنەوەمان دەکات و دەستی ماندووبوونی دەگوشین. چونکە ئێمە لەسەر ئەم تیۆرییانە خەونی گەورەمان بنیات ناوە، بەئاگا لەوەی کەوا ئەم بەرهەمە یەکێکە لە رایەکان و شیمانەیەکە. بۆ خوێنەری رۆشنبیریمان، هەتا بزانین ئەم بیرکردنەوەیە هەتا کوێ بڕ دەکات و تا چەند جێپێی خۆی دەگرێت.

چونکە بەراستی ئێمە وەک خوێنەرێکی وردی رۆشنبیریی کوردی بەتایبەت دوای راپەرین و ئەم دە ساڵەی دوایی. بەردەوام لە خوێندنەوەی ئەم رەوتەدا بووین و چاوەڕێی ئەوە بووین ئەم شەپۆلە رۆشنبیرییە روو وەرگێرێت لە مەسەلەی دەسەڵات و شەڕ و بابەتەکانی دەرەوەی مرۆڤ. بگەرێتەوە ناو مرۆڤ و ئیتر لە کایەی مرۆڤناسی و جەوهەرناسیدا جێدەستی خۆی نیشان بدات. بەڵام بەراستی نەک هەر ئاسۆی ئەم پێشبینییە تاریک بوو، بگرە هەوڵێکی سەرسەختانەش هەبوو بۆ کوێرکردنەوە و سەرکوتکردنی ئەو رەوتەی مۆژدەی ئەم خۆرەی پێ بوو. جا دەستەیەکیان بەدژایەتیکردنی ئەم جۆرە لە بیرکردنەوە هەوڵەکانی خۆیان تۆخ کردووەتەوە. دەستەیەکی تریان بەناوی نوێنەرایەتیکردنی ئەم جۆرە لە رۆشنبیر و رۆشنبیری زیانی گەورەیان داوە لەم شێوازە لە لێکۆڵینەوە و باس لای خوێنەری

کورد. چونکە هەردوو دەستەکە لەوێدا لەیەک دەچوون کە پاشەکشەیان بەخودی بیرکردنەوە کرد و ئەو هیوایەشیان کوژاندەوە کە لە کایەکەدا هەبوو. بۆیە ئێمە وەک خوێنەرێکی ئەم رۆشنبیرییە ئەم هەوڵەمان وەک شیمانەک دەخەینە ناو کایەی رۆشنبیریی کوردی. هیوادارم ئەم نووسینە رێگەی ئەو نووسەرەمان بۆ رۆشن بکات یاخۆ موژدەمان بداتێ لەبارەی ئەو رۆشنبیرییەی کە دێت. کەوا قۆناغێکی تر و نەوەیەکی ترمان پێشان دەدات لەسەر بیرکردنەوە. چونکە بەڕاستی تێپەڕاندنی نەوەیەک بەبیرکردنەوە دیاری دەکرێت نەک بە کات و شوێن و شتی تر. ئەوەش روونە سەرهەڵدانی قۆناغێکی تر لە رۆشنبیریی کوردی بووەتە پێویستییەکی ناچاری و دەبێت ئەم رووداوە روو بدات. جا ئیتر نازانین زەمەنی روودانی ئەم رووداوە کەیە؟ وەلێ ئەگەرچی لە سەیری کایەکەدا هیچ بەدی ناکەین و ئەوەی هەیە لە ئاستی رۆژنامە و لە چوارچێوەی دەسەڵات تێپەڕ ناکات. بەڵام ئێمە بێ هیوا نین و دەزانین وەک تاکەکەس رۆشناییی هەیە، هیوادارین ئەم تاکانە یەکتر بدۆزنەوە و وەک پرۆژەیەک خزمەت بەیەکتر بکەن لە پێناوی گەیشتن بە قۆناغێکی تری بیرکردنەوە. گەر ئەم رووداوە روو بدات لەسەر ئاستی سیاسی و ئابووریش گۆڕانی جەوهەری بەخۆمانەوە دەبینین و ئەمەش دەبێتە یەکەمین رووداوی دەرکەوتنی کورد بۆ خۆی و دەرەوەی خۆی. چونکە رۆشنبیریی کوردی وەک بازنەیەک خۆی دارشتووەتەوە. پێخستنە ناو عەقڵ و بیرکردنەوەی رەسەن، کە ئەوە یەکێکە لە خەونەکانی ئێمە و ئەم نووسینە وەک ئامانج لە هەناوی خۆیدا هەڵی گرتووە، دەمانباتە ئەو شوێنە. بەئاگا لەوەی زۆرجار لەم نووسینەدا گوتەیەکی هەمەکیمان گوتووە و باسێکی وا تێروتەسەلمان نەکردووە کەوا ئەم گوتەیە شی بکەینەوە و بیبەینە ناو کۆمەڵە بەشێکی جیاوازەوە لە پێناو ئاشکرابوون و رۆشنبوونەوەیدا. جاریش هەیە باسێکی دوور و درێژمان کردووە لە پێناوی ئەوەی یەک گوتەی جەوهەری هەیە بیڵێین بەڵام، نەمانتوانیوە ئەو گوتەیە کە هەیە وەک خۆی گوزارشتی لێ بکەین. دیارە ئەمە بۆ پرۆژەیەک شتێکی ئاسایی و تا رادەیەک کەمتەرخەمیشە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموو کات بنەمایەک و هێڵێکی گشتی خۆی درێژ دەکاتەوە بەدرێژاییی بەش و بابەتە جیاوازەکانی ئەم نووسینە. کە خوێنەر دەتوانێ هەستی پێ بکات. بۆ ئێمە کە ئێستا واین لە رێی گەڕان بەشوێن جەوهەرەکاندا و ئەوەی لەودیوی ئەم نووسینەدا هەیە، ئێمە وەک

ڕایەک بەیانی دەکەین. بەڵام تا ئەو شوێنەی بەڵگەی عەقڵی تەواومان لە دەست بێت، کە وەک ڕووتەختێک داشەکانی خۆمانمان لەسەر بڵاو کردووەتەوە. بەڵام هەر ڕایەکی تر بەدی بکەین کە بە بەڵگەی عاقڵانەتر گوزارشتی لەو بیرە کردبێت، ئیتر ڕایەکەی خۆمان بەردەدەین و دەست دەگرین بەو ڕایەوە. پاڵپشت بەوەی وەک ئایدۆلۆجیا وەری نەگرین و لەناو خۆماندا هەمان ڕا وەک ئایدیاڵ بدۆزینەوە. چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵ بەکارهێنانی سەرچاوەکاندا شێوازێکی ترمان بەکار بردووە، کە کۆلاژکردنی کۆمەڵێک بیروڕا نییە بەسەریەکەوە. بگرە بابەتێک هەبوو ئێمە بیرمان لێ کردووەتەوە. کاتێک هەستمان کردووە هەمان بابەت لای بیرمەندێک یان فەیلەسووفێک هەیە. نەهاتووین ڕاکەی ئەومان پێش ڕای خۆمان خستبێت و لە دوورەوە هەڵهێنجانمان کردبێت بۆ نووسینەکە. نەخێر ! سەرەتا هاتووین بیرکردنەوەی خۆمان خستووەتە ڕوو دواتر هاتووین ئەم بیرکردنەوەیەمان بەراورد کردووە بە بیرکردنەوەی ئەو فەیلەسووفە. ئیتر لێرەدا کەوتووینەتە بەردەم دوو حاڵەت، یان ئەوەتا ئێمە بەشێکی ئەو باسەمان ئاشکرا کردووە ئەویش پانتاییەکی تری درک پێ کردووە. دواتر هاتووین هەردوو بەشەکەمان لێک داوە لە پێناوی پەیبردنی ئایدیاڵەکان. یان ئەوەتا تووشی لێکگیربوون بووین. لەم بارەیاندا بیرکردنەوەکانمان ڕووبەڕووی یەک کردووەتەوە و بەڵگەمان بۆ بیرکردنەوەی خۆمان هێناوەتەوە، لە بەرامبەر بیرکردنەوەی ئەودا. ئەمەیان زۆر خزمەتی بەکارەکەی ئێمە کردووە، چونکە ناچار بووین بەڵگە بهێنینەوە بۆ ئەو شیمانەی خستوومانەتە ناو بوارەوە. جا یان بیرکردنەوەکە تێک شکاوە، یان زیاتر خۆی چەسپاندووە لەلامان. جار هەبووە وشەیەکی ئاساییمان کردووە بە چەمک، دیارە پاڵپشت بەو بیرکردنەوەیەی کە لە پێشیەوە هەڵمان ڕشتووە. جاریش هەیە بیرکردنەوەمان خۆی وەک ماڵێک چەمکێکی داتاشیوە. هەتا پارێزگاری لە ڕاگوزەری خۆی بکات و تێیدا نیشتەجێ بێت. بەپێچەوانەی ڕۆشنبیریی کوردییەوە، کە لێشاوێک لە چەمکی فەلسەفی و فیکریی هێنایە ناو کایەی ڕۆشنبیریمان وەک (ئازادی، جیاوازی، هەقیقەت، دیالێکتیک... هتد) کەوا ئەم چەمکانەیان لەسەر ئاستی چەمکەوە برد بۆ سەر ئاستی (وشە). ئەمەش هەموو ئەو ناکاملییەی ڕۆشنبیری ئێمە بوو، کە ئەو نەهات بیرکردنەوەکان بدۆزێتەوە لە خۆیدا. هات پەلاماری میتافۆرەکانی دا و فۆرمەکانی وەک بیرکردنەوە فرۆشت

بەئێمە. هەتا گەیشتە ئەو حاڵە خراپەی چەمکەکان بوون بە وشە. بەئاگا لەوەی چەمک ناکرێتە وشە و ناتوانین کارێکی ڕۆژانەی پێ ڕایی بکەین. چونکە جەوهەری چەمک بیرکردنەوەیە نەک زمانەوانی و ڕەوانبێژی. زمانی کوردی بیری پێ نەکراوەتەوە وە ئەگەرنا نەک هەر زمانی کوردی بگرە هەر زمانێک ئەو ئامادەسازییەی تێدایە گوزارشت لە عەقڵ بکات. چونکە هەموو مرۆڤێک عەقڵێک لە ناویدا دانیشتووە و کەرەستە و ڕێگەشی پێ دراوە بۆ دەرکەوتن و بەشەکی بوونەوەی. هەر بەم بەڵگەیە قسەی ئەوانە دەبرین کە پێیان وایە زمانی کوردی زمانێکی خێڵەکی و هەژارە. بۆ بەرچاوڕوونیی خوێنەر ئەم پەڕتووکە لە پێنج بەشی سەرەکی پێک هاتووە، بەشی یەکەم هەڵساوین بە داڕشتنی کۆمەڵێک چەمک، کە وابەستەن بەکرۆکی باسەکەوە. یاخۆ چەمکمان هێناوە بەڵام بیرکردنەوەیەکی ترمان پێ بداوە و ڕوونمان کردووەتەوە مەبەستمان چییە. بەشی دووەم باسی ژیانی واقیعی مرۆڤمان کردووە و دواتریش پێوەستبوونی بەچ بەشێکی پێکهاتەی مرۆڤەوە. بەشی سێیەم و چوارەم بەهەمان شێوە. لە بەشی پێنجەمدا باسی دۆخەکانی مرۆڤمان کردووە لەگەڵ جۆر و بەشەکانیان، دیارە زۆر بابەتی تر هەبوون دەمانتوانی بەدرێژی لەسەری بڕۆین، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ماوەیەکی زۆر سەرقاڵ و ماندووی کردین. بە ئومێدی ئەوەی لە نووسینی تردا لا بکەینەوە لە زۆر بابەتی شاراوە و دەست بۆ نەبردراو. هەروەک لێرەدا زۆر باسی شاراوە هەبوون هاتنە ڕێگەمان و ناچاریش بووین لەسەری بووەستین، چونکە گرفتی بۆ دروست کردین. کاتێک ئەو باسەمان بەرچاو نەکەوت لای بیرمەندێک یان فەیلەسووفێک. بۆیە بەناچاری لەسەر پێی خۆمان وەستاوین و خۆبەخۆ و بەتەنیا گوزارشتمان لەو بیرە کردووە. لە کۆتاییی ئەم نووسینەدا ئەوەندە دەڵێم جارێکی تر ئەمە ئەگەرێک و شیانێکە لە بەردەمماندا، ئەوەش ڕوونە هیچ کارێک بێ کەموکووڕی نابێت. بۆیە داوای بەخشینم هەیە لە خوێنەران هیوام بەختەوەریتانە.

پێشڕەو عەبدوڵڵا – ٢٠٠٩/١/٢١

بەشی یەکەم

# ڕۆنانی چەمکەکان

**١-یادگە (الذاکرة):**

ئێمە سەرەتا باسی مرۆڤ دەکەین، بەو پێیەی مرۆڤ هەر تەنیا بوونەوەرێکی بیرکەرەوە نییە، بەڵکو بەوەی خاوەنی جەستە و دەروونە ئەم دوو بەشەش بەشێکی گرینگن لە ژیانی مرۆڤ. مرۆڤ دواجار مەحکوومە بەوەی کە لەناو ئەم دوو جۆرە لە ژیانیشدا بگوزەرێت. ئەگەر بیرکردنەوە گەڕانی مرۆڤ بێت بەشوێن زانیندا بەمانا پەتییەکەی، ئەوا جەستە و دەروون هەردووکیان ڕێگەی پێوەستبوونی مرۆڤن بەدەوروبەری خۆیەوە. مرۆڤ لە ڕێگەیانەوە زانست و زانیاری دەست دەخات و خۆ نزیک دەکاتەوە لە سروشت و هەموو ئەوانەی لە دەوروبەریدان. جەستە بۆ خۆی وەک شارێکی جەنجاڵ وایە هەموو ئەوانە خاوەنی وەزیفە و سیفەتی جیا و کاری جیاوازن. هەموویان بۆ خزمەتی مرۆڤ هەن، بۆ ئەوەی مرۆڤ ئەگەر هاتوو کەوتە حاڵەتی زانینەوە ئەوا لە ڕێگەی ئەم بەشانەی جەستەی خۆیەوە ئەم زانینە بخاتە ناو فۆرمێکەوە و لە جیهانی هەستیدا بەدەر بکەوێت. هەروەک چۆن جەستەی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی شوێنی هەڵگرتنی ڕۆحە، ئەوا بۆ بیرکردنەوەش ئەم خەسڵەتەی خۆی لە دەست نادات. چون دارتاشێک دەکەوێتە ناو بیرکردنەوەوە هەست دەکات دەبێت شتێک دروست بکات، مرۆڤ بتوانێت لەسەری دابنیشێت. ئەم بیرە سەرەتا لەناو بیرکردنەوەدا پەیدا دەبێت دواتر مرۆڤ لە ڕێگەی جەستەی خۆیەوە ئەم بیرە لەباری پەتییەوە دەباتە باری عەینییەوە و واقیعی دەکاتەوە. بەمەش کورسی دروست دەکات. یاخۆ مرۆڤ دەکەوێتە حاڵەتی بیرکردنەوەوە لێرەدا زمان، جا زمان بێت لە ئاستە فیزیکییەکەیدا، یان ناوەکییەکەیدا. چۆن ئەم زمانە دەبێتە جەستەی ئەو بیرەی مرۆڤ ئەمەش هەر لە ڕێگەی جەستەی بایۆلۆجیی مرۆڤەوە دێتە کردن. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین مرۆڤ

جەوهەرەکەی جەستەکەیەتی، نەخێر ! بگرە دەمانەوێت ئەو لایەنە شاراوانەی جەستەی مرۆڤ ئاشکرا بکەین و وەزیفەکانی بەدیار بخەین. وە گەرنا جەوهەری مرۆڤ عەقڵە. یادگە بەوەدا شتەکان لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە و جارێکی تر توانای حازرکرنەوەی هەیە، بەشێکە لە جەستە و دەروونی مرۆڤ. یادگە وەک بەشێکی گرینگی پێکهاتەی مرۆڤ زۆرترین کاری بەردەکەوێت، کە بەردەوام حازر و ئامادەیە بۆتۆمارکردنی رووداوەکانی ژیانی مرۆڤ. لە راستیدا ئەگەر ناوی یادگە بنێن بەئەندام، ئەوا ئەندامێکی بێلایەنی مرۆڤە و هەر تەنیا وابەستە نییە بەخەزنکردنی رووداوەکانی مرۆڤ کە رووداوی واقیعین، بگرە رووداوی عەقڵی و رووداوی ناو خەوەکانی مرۆڤیش لە خۆیدا هەڵدەگرێت. بەئاگا لەوەی ئەو رووداوانەش تۆمار دەکات کە مرۆڤ بەرێگەوە یاخۆ لەناو پاسدا خەیاڵ دەیباتەوە و لەناو زەینیدا رووداوێک روو دەدات. ئەم رووداوانەش دەچنە ناو یادگەی مرۆڤەوە. یادگە لە راستیدا شوێنی هەڵگرتنی بیرەوەریی مرۆڤە، مرۆڤ لە یادگەی خۆیدا بیرەوەرییەکانی خۆی هەڵدەگرێت. جا دوایی بە ویست و ناویست ئەم رووداوانە دووبارە دەبنەوە و بەیادی دێتەوە. ئێستا با ئەو پرسیارە بکەین ئاخۆ یادگە ئەندامێکی بایۆلۆجییە یان سایکۆلۆجییە؟ لە راستیدا یادگە لەناو زانستی بایۆلۆجیدا بەشێکە لە مێشکی مرۆڤ، بەڵام مێشک کاری بەرێکخستنی بایۆلۆجیی مرۆڤەوە هەیە. مێشک وەک فەرماندارێک فەرماندەیی چۆنیەتیی ئیشکردنی بەشەکانی جەستە دەکات. وەک جووڵە و خوێن و گەشەکردن و هەستە جەستەییەکانی مرۆڤ. مێشک لەبەر ئەوە، ئەندامێکی بایەلۆجیی مرۆڤە. لێ لە زانستی سایکۆلۆجیدا یادگە بە(نەست) گوزارشتی لێ کراوە، بەڵام نەست بەشێکە لە سایکۆلۆجیا و هەموو نییە. یادگە وەک ئەندامێکی بایۆلۆجیی بوونی نییە، بەڵام لە رێگەی مێشکەوە بەدیار دەکەوێت. واتا بوون و دەرکەوتنی وابەستەیە بەبوون و دەرکەوتنی مێشکەوە. کەوابێ لێرەدا رووبەرووی ئەوە دەبینەوە ئاخۆ یادگە (رۆح- عەقڵ)ە ؟ ئاخۆ مادام خۆی وەک ئەندامێکی واقیعی بوونی نییە و لەرێگەی ئەندامێکی واقیعییەوە بوونی ئاشکرا دەبێت، ئاخۆ بەشێک نییە لە (رۆح-عەقڵ)؟ لە راستیدا ئێمە لە بەشەکانی تری ئەم باسەدا ئەمە بەتەواوی روون دەکەینەوە، بەڵام بۆ ئێرە بەوەدا مرۆڤ خاوەنی دەروونە و دەروونیش بۆ خۆی دنیایەکی تری مرۆڤە و ئەویش وەک دەرکەوتنی واقیعی بەتەنیا نییە. یادگەش خۆی

بەشێکە لە ئەو، بەڵام لە ڕێگەی جەستەوە کارا دەبن و کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن. دەروون و جەستەی مرۆڤ هەردووکیان وابەستەن بەیەکترەوە، بەڵام جەستە لە پێشترە لە دەروون. چونکە بە نەمانی جەستە دەروون لەناو دەچێت. دەروون شوێنی وێنەی شتەکانە، واتە کاتێ مرۆڤ سەیری شەڕێک دەکات لە ژیانی واقیعی خۆیدا ئەم شەڕە کاتێک دێتە ناو یادگەوە، واقیعییەتی شەڕوان و کەلوپەلی شەڕەکە نایەنە ناو یادگەی مرۆڤەوە، بگرە وێنەی ئەو شتانە دێنە ناو یادگەوە. ئەمەش بە یارمەتیی جەستە ڕوو دەدات. بۆ نموونە ئەگەر هاتوو یەکێک لەو شەڕەدا خەوتبێت ئەو کاتە جەستەی حازر نابێت و ناتوانێت یادگەی پڕ بکات لە ڕووداوەکانی ئەم شەڕە. بە پێچەوانەشەوە زۆرجار دەروونی مرۆڤ خەوی لێ دەکەوێت. لێرەدا جەستە ئامادەیە بەڵام ناتوانێت کاری خۆی بکات، هەروەک ئەوەی دەروونی مرۆڤێک کاتێک ئامادە نەبێت بۆ ئەوەی سێکس ئەنجام بدات، ئەو کاتە جەستەی ئەو مرۆڤە ناتوانێت ئەو کارە ڕاپەڕێنێت، واتە کارەکە دوو لایەنە و پێکەوە کۆ دەبنەوە بۆ ئەنجامدانی کارێک. وەک کوشتنی پیاوێک لەلایەن یەکێکی ترەوە. لێرەدا هەم دەروون ئامادەییی هەیە و هەم جەستەی مرۆڤیش. بەڵام دەروون بزوێنەری ئەو کارەیە، هاوکات سەرەتا جەستە ئەو زانیارییەی داوەتە دەروون لەسەر ئەو مرۆڤە هەتا ئەو کارە ئەنجام بدات. حاڵەتی تریش هەیە جەستە بزوێنەری ئەم کارەیە. ئەوەی وابەستەیە بەیادگەی مرۆڤەوە ئەوەیە یادگە وەک ئەندامێکی بێلایەن کاری بەسەر جیاوازیی دنیاکانەوە نییە. ئەو بەردەوام یەک کار ئەنجام دەدات ئەویش هەڵگرتنی بیرەوەریی ڕووداوەکانی ژیانی مرۆڤە.

لەناو یادگەی مرۆڤیشدا بەشی جیاجیا هەیە، ڕووداوە واقیعییەکان لە بەشێکی جیاوازدا هەڵدەگیرێن و جودان لە ڕووداوەکانی ناو خەو و دەروونی مرۆڤ. وەک ئەوەی مرۆڤێک غەدری لێ دەکرێت لەلایەن کەسێکی ترەوە، ڕووداوی ئەم غەدرە وەک بیرەوەری دێتە ناو یادگەی مرۆڤەوە دواتر ئەم مرۆڤە حیکایەت دروست دەکات لە خەیاڵی خۆیدا، بۆ تۆڵەسەندنەوەی لە کەسەکە، ئەم ڕووداوانەش بەجیا جێگەی خۆیان هەن لەناو یادگەی مرۆڤدا. بەشێکی تری یادگە پێوەستە بەو ڕووداوانەی پێوەستن بەزانینەوە، یاخۆ با بڵێین حاڵەتی فەلسەفیی مرۆڤەوە. مرۆڤ لە حاڵەتی فەلسەفیدا دەکەوێتە بەرامبەر زانینەوە، دەکەوێتە ناو ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئایدیاڵی شتێک ببێتەوە. ئاشکرابوونی ئەو ئایدیاڵە دوای تەواوبوون

وەک بیرەوەری شـوێنی تایبەتی خۆی هەیە لە یادگەی مرۆڤدا. هـەموو ئەم ڕووداوە جیاجیایانەی مـرۆڤ بەدەرەکی و ناوەکییـەوە لەناو یادگەدا شـوێنی خـۆیان هەیە، بەڵام ئـەم ڕووداوانە بـەبێ جـووڵـە دانانیـشـن و بەوەسـتـاوی نـامـێننەوە. بگرە شیمانەی بەجوولەخستنەوەیان هەیە جارێکی تر. واتا لە ململانێی بەردەوام دان. زۆرجار یەکێ لەم بەشانە حزوور پـەیدا دەکات و ئەوانی تر دادەپۆشـێت. لە دوای تەواوبوونیـشی ئـەو بەشـە دەرکەوتووە دەچێتـەوە شـوێنی خـۆی. حزور پەیداکرنی بەشەکان پێوەستە بە مرۆڤەکە خۆیەوە، واتا ئەو مرۆڤە دەکەوێتە ناو لایەنگیری بۆ کـام لەم بەشـانـەی ژیانی خـۆی. ئەوا ئەو بـەشـە زیاتر حـزوور پەیدا دەکـات لەناو یادگـەی ئەودا. حـاڵەتی یادهێنانـەوە حـازرکـردنەوەی ڕووداوەکـانی ناو یادگـەی مرۆڤە.

ئێستا با ئەو پرسیارە بکەین ئاخۆ خەزنکردنی ئەم ڕووداوانە لە کوێدا بۆ مرۆڤ گرینگن یاخۆ لە کوێی ژیانی مرۆڤدا کاریگەری خۆیان هەیە؟

بۆ ژیانی واقیعی مرۆڤ سوودی واقیعیی هەیە، وەک ئەوەی مرۆڤ لە ڕێگەی ئەو یادگـەیەوە دەتوانێت ئێـوارە بگەڕێتـەوە مـاڵەوە. واتـا دووبارە ناسـینـەوەی ئەو شتانەی کە پێشتر مرۆڤ دیویەتی. لە ژیانی دەروونی مرۆڤدا زۆر کاریگەرە بەوەی کاتێک مرۆڤ دەیـەوێت دوژمنەکەی خۆی بکوژێت، ئەو کـاتە یادگە ئەو ڕووداوانەی بۆ حـازر دەکاتەوە کە ئـەو مـرۆڤە پێشـتر دروسـتی کردوون لەسـەر کوشـتنی ئەو پیـاوە. لێـرەدا ئـەم بەشـە کـۆنتـڕۆڵی یادگـە دەکـات و جـەسـتـە دەبزوێنێت بۆ ئەنجامدانی کارەکە. یاخۆ بۆ بەشـەکەی تری یادگە، زۆرجـار مرۆڤ زانینێکی درک کردووە بەرامـبەر بە شـتێک ئەم زانـینە کـاتێک وەک ڕووداوێکی ناوەکی ڕووی داوە لە یادگەدا هەڵگیـراوە مـرۆڤ دەتوانێت وەک دووبارەکـردنەوەی زانیـاری دووبارەی بکاتەوە، یـاخۆ کـۆمـەکی بکات لـەسـەر ئەوەی قـسـە لەبارەی ئـەو شـتـەوە بکات. لە ڕاسـتـیدا لە هـەمـوو بارەکاندا یادگە وەزیفـەیەکی جەسـتـەییی هەیە نەک عـەقڵی. چونکە عەقڵ وەک جیهانێکی سەربەخۆ نەزانراوە. مرۆڤ کاتێک هەست بە جیهانی عـەقڵ دەکـات کـە حـزوور پەیدا دەکـات ئـەویش کـەوتنە نـاو حـاڵەتی فـەلسـەفی و زانینەوە. بەڵام یادگـە وەک دنیـایەکی تر زانراوە. هەمـوو شـتـەکـان لە یادگـەدا زانراون و حازرە. یادگە مێژووی مرۆڤە. واتا شتەکان ڕوویان داوە و لێ بوونەتەوە، گـەر ڕوو بدەنـەوە هـەردەم دووبارەکردنەوەن نەک ڕووداوێکی تازە. بەڵام بۆ عـەقڵی

مرۆڤ هەموو شتەکان تازەن، تازەن بەو مانایەی مرۆڤ پێشتر لە ژیانی خۆیدا ئەم شتانەی نەزانیوە. بەڵام ئەم دوو جیهانە زۆر لەیەک دەچن بۆیە دەبێت زۆر وریا بین لەسەر جیاکردنەوە و ئیشکردنیان. لە ڕاستیدا لە زانستی دەروونناسیدا بەتایبەت (سیگمۆند فرۆید) جەوهەری مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ یادگە و عەقڵ لە بیر دەکات. هەر بۆیە زانستی دەروونناسی زۆر بێ دەست و قاچە لە ئاست فەلسەفەدا، لە ڕاستیدا فەلسەفە دایکی دەروونناسییە.

دەروونناسی بەبێ فەلسەفە هەرگیز ناتوانێت قسە لەسەر خۆی بکات. ئەم بەرچاو تاریکییە پەڕیوەتە ناو ڕۆشنبیرانی ئێمەش، کاتێک دەکەونە حوکمدان لەسەر چییەتیی کورد، ئەو کاتە دێن لە ڕێگەی دەرکەوتە دەروونییەکانی کۆمەڵگەی کوردی چییەتیی کورد بە دەردەخەن. لەویادا ڕاستن بنەمای ئەو کارانەی کۆمەڵگە دەروونین. بەڵام لەویادا هەڵەن کە لەسەر ئەم بنەمایە چییەتی کورد بناسێنن. بۆیە سەیر دەکەی تێکەڵی هەیە لە ڕا و بۆچوونەکانیان لەبارەی تاکی کوردی و ڕۆحی کوردیەوە. دەمێک مێژووی کورد بەمێژوویەکی شەڕانگێزی و دەمێک بەپیاوەتی و دەمێک بەخۆشەویستی وەسف دەکەن. هەموو ئەمانەش لەوێوە سەر هەڵدەدەن کە شوێن بنەماکان ناکەون. تۆ ناتوانی لەسەر بنەمای دەروون چییەتیی شتێک کەشف بکەیت. کورد دەبێت لە ڕێگەی ڕۆحی خۆیەوە کە ڕۆحی نەتەوەیە چییەتییەکەی دیاری بکرێت، نەک دەرکەوتە دەروونییەکانی ئێستا وەک بنەمایەکی سەرەتایی کەم تا زۆر یادگەمان روون کردەوە، کە دواتر بۆ بەشەکانی تری ئەم باسە کاری پێ دەکەین.

۲-بیرەوەری:

لە باسی پێشوودا باسی یادگەمان کرد، کە وەک کۆگایەک وایە لەناو جەستەی مرۆڤدا بۆ هەڵگرتنی بیرەوەری. یادگە جیاوازە لە بیرەوەری چونکە بیرەوەری ئەگەری لەبیرچوون و لەیادچوونی هەیە، بەڵام یادگە لەبیرچوونی نییە بەڵکو لەناو دەبرێت. ئەویش بەهۆی نەمانی جەستەی مرۆڤەوە، بەڵام بیرەوەری وەک کۆمەڵێک ڕووداوی نەناسراو لە یادگەدا ئەگەری بەربوونەوەی لە پێشە. لە زانستی دەروونناسیدا بەتایبەت ئەوەی لەناو ڕۆشنبیریی کوردی و ئەکادیمییەکان هەیە بیرەوەری و یادگە جیا نەکراونەتەوە و تێکەڵ کراون. باسی بیرەوەری وەک یادگە

کراوە و باسی یادگەش وەک بیرەوەری هاتووەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ئەمەش هەموو دەگەڕێتەوە ئەو پرەنسیپە نادیارەی ناو مرۆڤی ئێمە، کە هەردەم لەوی ترەوە بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕێت. نایەت لەناو خۆیدا بۆی بگەڕێت و لە ڕێگەی عەقڵی خۆیەوە شتەکان هەست پێ بکات. هەر بۆیە سەیر دەکەی لەناو کورددا تا ئێستا هەر دووبارەکردنەوەمان هەیە لەسەر نووسینی فەیلەسووفان و نوسەرانی تر. ئەمەش وەک خۆی نەگوازراوەتەوە و بەوێناکردنێکی سەپێنراو بیروڕای نووسەرەکە شێوێنراوە. تا ئێستا ئاسۆی ئەو نووسەرە لە ئێمەوە دوورە، کە دێت و شتەکان لەناو عەقڵی خۆیدا هەست پێ دەکات. دواتر ئەم هەستکردنەی خۆی کاتێک بەراورد دەکات بەهەمان هەست، کە لەلایەن فەیلەسووفێکەوە هەیە نەک هەر ئەو فەیلەسووفە ڕۆشن دەکاتەوە وەک خۆی، بگرە پانتاییەکی ئەو شتەش ڕۆشن دەکاتەوە، کە لەلای فەیلەسووفەکە بە تاریکی ماوەتەوە. ڕۆشنبیریی کوردی تا ئێرە هاتووە و ئەوەی لە دوای ئەو دەستە لە ڕۆشنبیرەوە دێت بەبێ ئەم بیرکردنەوە خودییە، نە ئومێدێک هەیە ئاشنای بین بەفەیلەسووفان نە ئومێدی ئەوەش هەیە بیرکردنەوە جارێکی تر سەرقاڵ بێت بەخۆیەوە. لە ڕاستیدا بیرەوەری لەویادا تێکەڵ کراوە بەیادگە، کە هاتوون بیرەوەرییان بە یادگە کردووە و ئەو کاتە مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە. بۆ نموونە ناولێنانێک هەن بۆ بیرەوەری بەڵام بەناوی یادگەوە ناوزەند کراوە. (لندال دافیدوف) لە کتێبی (مدخل علم النفس) دێت یادگە دابەش دەکات بۆ "یادگەی کورتخایەن و یادگەی درێژخایەن"[1] لە ڕاستیدا یادگە وەک پێشتر باسمان کرد بۆ خۆی وەک شوێن حزووری هەیە لەناو جەستەدا، ئەم شوێنە بێ سنوورە لە وەرگرتنی زانیاری و هەڵگرتنی ڕووداوەکان، بەڵام ئەوە بیرەوەرییە کەوا کورت و درێژە، یانی بیرەوەریی خۆی وەک ڕووداو هەندێک جار لەبەر گرینگیی زیاتر هەوڵی مانەوەی خۆی دەدات لەناو یادگەدا. نەک ئەوە یادگە بێت کە کورت و درێژە. لندال دافیدوف لە باسی یادگەدا دەڵێت "بۆ نموونە کاتێک برادەرێک گفتوگۆت لەگەڵ دەکات تۆش ئەو کات سەرقاڵی کارێکی تری ئەو پرسیارێکت لێ دەکات و تۆش لەبەر سەرقاڵبوونت وەڵام نادەیتەوە، ئەو دەڵێت کوا وەڵامەکە. تۆش دەڵێت چیت گوت........"[2] لە ڕاستیدا ئەم حاڵەتە بەوە دەناسێنێت، کە یادگەی کورتخایەن کارا بووە بۆیە مرۆڤەکە ئاگەدار نییە. ئەوەی لێرەدا تێکەڵ کراوە بیرەوەری و یادگەیە. ئەوە یادگەیە لە کاتی ئەو گفتوگۆیەدا

سەرقاڵە بەڕووداوێکی ترەوە، نەک ناوی بنێن یادگەی کورتخایەن و درێژخایەن. لێرەدا دوو شت هەیە دەبێت لە یەکتری جیا بکەینەوە، ڕووداو وەک ڕووداو. بیرەوەری وەک ڕووداوی تەواو بوو. ڕووداو وەک ڕووداو ئەویش هەموو ئەو ڕووداوانە دەگرێتەوە کە هێشتا لە گەشەکردن و تەواوبووندان، ئەمە وەک ڕووداو دەکەوێتە هەرسێ لایەنەکانی ژیانی مرۆڤەوە. هەروەک ڕووداوەکانی ژیانی واقیعی و دەروونی و ڕووداوە ناوەکەیەکانی مرۆڤ. ئەم ڕووداوانە بۆ خۆیان زیندوون و بەردەوام لە گەشەکردندان، بەڵام کاتێک تەواو دەبن و کۆتایان پێ دێت، وەک بیرەوەری دەچنە ناو یادگەی مرۆڤەوە. یادگەی مرۆڤ کاتێ هەڵیان دەگرێت دەبنە بیرەوەری. واتا بیرەوەری مردوویەتی ڕووداوەکانی مرۆڤە. ڕووداوەکان کاتێک دەبنە بیرەوەری ئەو کاتە لە تەواوبووندان، ئەم ڕووداوانە زۆر جیاوازن لە یادگە خۆی. ئەوە مرۆڤەکەیە ئەوە دیاری دەکات کام لەم ڕووداوانەی ژیانی زۆرتر لە یادگەدا هەڵبگیرێت. بیرەوەریی مرۆڤ وەک ئەوەی لە حاڵەتی ڕووداودا جیاوازە وەک ئەوە لەناو یادگەدایە. یەکێکی تر لەو شارەزایانەی بواری دەروونناسی "دکتور عبدالعلي الجسماني"[٣]و "دكتور الزين عباس عمارة"[٤] هەردووکیان لە کتێبەکەیاندا زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە یادگەی مرۆڤ گەورەترین بەشی مرۆڤە، نەک هەر ئەمە بگرە زۆربەی زانایانی تریش تەواو جەخت دەکەنە سەر یادگەی مرۆڤ. ئەم یادگەیە هەر بەتەنیا ناوی نابەن، بگرە بە هێزی تێبینی و هێزی وردبینی و هێزی وەرگرتن. با لێرەدا ئەو پرسیارە بکەین بۆچی دەروونناسی تەواو جەخت لەسەر یادگە دەکات؟ لە زانستی دەروونناسیدا شتەکان هەموو وابەستەن بەدەرەوەی مرۆڤەوە. ئەو مرۆڤە دانایە کە زیاتر توانای ئەوەی هەیە ئەوەی وەری دەگرێت بتوانێت بیداتەوە. (بۆ ئەم بابەتە یادگەش گەورەترین کاری بەردەکەوێت) بۆ. بەڵام لە فەلسەفەدا یادگە ئەو گرینگییەی نییە چونکە بنەمای فەلسەفە لەسەر دووبارەبوونەوە بنیات نەنراوە و فەلسەفەش نابێتە کولتوور. بەداخەوە ڕۆشنبیرانی ئێمە باسی کولتووری فەلسەفی دەکەن،[٥] فەلسەفە لە ڕێگەی یادگەوە نایەتە ناو مرۆڤەوە یاخۆ شتێکی دەرەکیی مرۆڤ نییە هەتا یادگە چالاک بکرێت بۆ ئەوەی زیاتر بتوانێت ئەم زانیارییانە وەربگرێت. بەڵکو فەلسەفە سەر بەجیهانێکی ترەو لە ناوەوەی مرۆڤدا هەڵدەقووڵێت و دێتە دەرەوەی مرۆڤەوە. یادگەش هەر دەرەوەی مرۆڤە. بەوەدا دەرەوەی مرۆڤە کە جەوهەری مرۆڤ جەستە و دەروون نییە، بەڵکو

عەقڵە. هەرچی دەکەوێتە دەرەوەی ئەم عەقڵە دەکەوێتە دەرەوەی مرۆڤیش. مرۆڤیش بەدابڕان لە ئەم عەقڵە دەکەوێتە ناو جیهانی ئەوانی ترەوە، دەکەوێتە ناو یادگەوە کە وەک شارێکی مۆمیاکراو هیچ جووڵەیەک لەناو شتەکاندا نەماوە. یادگەش شاری بیرەوەریی شتەکانە، شاری ڕابردووی ڕووداوەکانی مرۆڤە. ئێمە لەناو عەقڵدا لە بەردەم جیهانێکی تازە و دووبارەنەکراوداین. لە بەردەم جیهانێک کە شتەکان نوێن و ماناکان نوێن. لە جیهانی یادگەدا کە جیهانی ئەوانی ترە شتەکان بەناو دووبارەکردنەوەدا دەڕۆن، مرۆڤ کاتێک بالادەست نەبووە یاخۆ نەیتوانیوە ئەم جیهانە تێپەڕێنێت و بچێتە ناو عەقڵی خۆیەوە و لەم بیرەوەرییانە تێ بگات و بزانێت مۆمیان.. لە ئەنجامی ئەم تێنەگەیشتن و بیرنەکردنەوەدا، مرۆڤ ئەو کات سەرقاڵی شتێکی تر بووە. سەرقاڵی ئەوە بووە بیرەوەریی ڕووداوەکانی ژیانی واقیعی و بیرەوەریی ڕووداوەکانی ژیانی دەروون پێکەوە گرێ بدات. بەردەوام شتێکی تر حازر بکات بەئومێدی ئەوەی دنیایەکی تر دروست بکات، کە ئەو وا دەزانێت جیاوازە. لە کاتێکدا کۆلاژکردنی هەر ئەو دوو دنیایەیە و بەس. شوێنێکی تر نییە، بگرە هەمان یادگەی مرۆڤە بەتێکەڵیی ئەو دوو جیهانە جیاوازە. ئەمە هەر لەو وێڵبوونەی مرۆڤدا ڕەنگی نەداوەتەوە، زۆرجار هاتووەتەوە ناو کاری ئەدەبیشەوە. مرۆڤ بووکی دەریا دروست دەکات یاخۆ شتانێکی ناواقیعی دێنێتە بەرهەم، کە زۆر بەداخەوە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا ئەم ناواقیعیبوونە بەتازەگەریی داهێنان زانراوە. ئەمەش ڕاستیی کورتبینی خوێنەری ئێمە و کورتبینی نووسەرانی ئێمەیە. بەوە ڕازی بوون کە ئێستا پێی گەیشتوون، ئەوان شوێن ئەوە کەوتوون کە وەریان گرتووە لە دەوروبەرەکەیان، بەلام بنەمای لە دایکبوونی ئەم شوێنەیان لە بیر چووە. لە بیریان چووە کە ئەم جێگەیە شوێنی ڕۆشنبیر نییە. شوێنی ڕۆشنبیر خوێنەر بۆی دیاری ناکرێت. شوێنی ئەو جێگەیەکی ترە. بوونی خۆیەتی ئەو دەبێت لە "بوون- عەقڵ"[6]ی خۆیدا دابنیشێت. هەتا بوونی شتەکانیش لە ئەودا دابنیشن. سایکۆلۆجیا وەک زانستێک سەرەتا لە فەلسەفەوە هاتووەتە دەر، بەلام کاتێک خۆی وەک زانستێکی جیا بنیات نا، ئەو کات کەوتە تەنگژەی مردنەوە. چونکە پشتی لە دایکی خۆی کرد. ئەوەی سایکۆلۆجیا بە شوێنیدا دەگەڕێت خودی ڕووداوەکانە، بیرەوەری دەکاتە بنەمای شتەکان. بەلام فەلسەفە بۆ جەوهەری ڕووداوەکان و شتەکان زۆر دوورتر دەڕوات. ئەو لە

شـوێنێکی تر بەشـوێن جـەوهەردا دەگـەڕێت. بیـرەوەریی مـرۆڤ ئەگـەر هـاتوو زانینیش بێت وەک حاڵەتێکی فەلسـەفی، کە دەچێـتە ناو یادگـەوە لە ڕووداوییەتی ڕووداو دەکەوێت و دەبێـتە بیرەوەری. ئەو کات ئـەمەش هەروەک بیرەوەری حیسابی بۆ دەکرێت، مرۆڤ هەر ئـەو کاتە تووشـی ئایدۆلۆجـیا نایەت کـە بیـری ئەوانی تر دووباره بکاتـەوە، بەڵکو ئەو کـاتەش ئایدۆلۆجـیایە، کـە خـۆی لـەناو خـۆیدا دەگـاتە زانینێک و دوایی ئـەم زانینـە دووباره دەکـاتەوە. چونکە ئەوکـات لاسـاییی خـۆی دەکاتەوە.

بەوەدا زانـین شـێـوەی جـیـاجـیـای هەیە، هەردەم ئـەم زانینـە کـە وەک ئـادیاڵ دەردەکـەوێت و دەچێـتـە باری زانینـەوە قـەد جـارێکی تر لـەو فـۆرمـەدا دووبارە نابێتـەوە. بەمەش عەقڵ پارێزگاری لە نـهێنیی خۆی دەکات. ئەوەی سـوکرات باسـی دەکات وەک بنـەمـا هـەر یەک شـتـە، بەڵام هـەر کـاتێک سـوکرات دەکەوێتـە حـاڵەتی فـەلسـەفـیـیـەوە ئەو بنەمـایە لە هـەر گـفـتـوگـۆیەکدا بەشـێـوازێک دەرکـەوتووە. ئەمـە دووبارەکـردنەوە نیـیـە، بگرە ڕۆشنکردنەوەی پاژێکی تری ئەو زانینەیە. بـەڵام بۆ بیـرەوەریی مـرۆڤ بەردەوام دووبارەکـردنەوە لە ئارادایـە یادگـەی مـرۆڤ کـاتێک ڕووداوەکان دەکاتە بیرەوەری، هەردەم مرۆڤ ئاراستە دەکات. بەدووبارەبوونەوەی لە شوێنی جیاجیادا یانی لە بەکارهێنانی جیاجیادا. مرۆڤی ئێستا کاتێک تەواو کۆمەڵایەتییە هەڵگری هەمان ئەخلاقیاتی مرۆڤی پێش خۆیەتی. ئەوەی ئەو دەیکات هەمـان شـتـە، هەمـان لاسـاییکردنەوەیە، بەڵام فـۆرمی جیـاوازی دووبارەکرنەوەش هـەیـە. لەم دووبارەبوونـەوەیەدا گـەشـەکـردن ڕوو نـادات، هەر بۆیـە گـۆڕانیش ڕوو نادات. چونکە جـەوهـەری گـۆڕان گـەشـەکـردنـە. هێـزی کـۆمـەڵایەتی هـەردەم هـەر خۆیەتی، بەڵام دەموچاوەکانی و هەڵگرەکانی خۆی دەگۆڕێت. بەڵام خۆی وەک خۆی دەپارێزێت لەناو مـرۆڤدا. وێرانی مرۆڤ ئەو کاتە دەست پێ دەکات کـە جـەسـتـەی خـۆی بکاتە ماڵی ئەم هێزە و ئاراستـە و هـەنگاوەکانی هاوئاهـەنگ بکات لەگەڵیدا. ئەخلاقیاتی کۆمەڵایەتی ئەخلاقیاتێکی مۆمیاکراو و مردووە. مێژووییەکە ئێمە لەناو خـۆمـانـدا دەیگێـڕینەوە و دەست بـەدەست دەیدەین بە یەکـتـر. بیـرەوەرییـەکی خـەزنکراوی ناو یادگـەیە لە دەروونی ئێمـەدا. دەبێت ئامـاژە بەوە بدەین کە مرۆڤ خاوەنی یەک بیرەوەری نییـە بە تەنیا، چونکی مرۆڤ تەنیا ژیانی واقیـعی نـاژیت، بگرە ژیانی خـەیاڵی و ژیانی عـەقڵیشی هەیە. بیرەوەری وابـەسـتـەیە بەکارابوونی

شوێنەکانی مرۆڤەوە. گەر ژیانی خەیاڵیی مرۆڤ بکەوێتە جووڵە، ئەوا ئاکامەکەی بیرەوەرییەکە کە جیاوازە لە بیرەوەریی ژیانی واقیعی. بۆ ژیانی عەقڵیش بەهەمان بنەما. بۆیە دەبێت بیرەوەرییەکان جیا بکەینەوە لە یەکتر.

**٣- جەستەی بایەلۆجی:**

دیارە ئەم چەمکە وابەستەیە بەبابەتێکی گەورە و گرانەوە، ئەویش جەستەی بایەلۆجییە. چونکە ئەمڕۆ وەک ئاگەدارین، کە بایەلۆجی وەک زانستێک زۆرترین پانتاییی داگیر کردووە. ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ بایەخی مرۆڤ بۆ جەستەی خۆی. بەجۆرێک کە لە جیهاندا پەیمانگە و سەنتەری تایبەت هەن بۆ راییکردن و جوانکردن و گرینگیدان بەجەستە. دیارە جەستەی بایەلۆجی ئەو جەستەیە کە هەموومان هەمانە و خاوەنین. ئەمەش لە سەرەتای پیتاندنی تۆوی پیاو و ئافرەت دەکەوێتە ناو گەشەکردن هەتا بەهەموو قۆناغەکانی خۆیدا دەڕوات و دەگاتە پلەی کامڵبوون. هەموو پێکهاتەکانی ئەم جەستەیە لەناو ئەو تۆوە پیتێنراوەدا هەیە. واتا ئەم تۆوە پنتی سەرەکیی جەستەکەیە و ئەم جەستەیە بەدوو قۆناغی جیاوازدا دەڕوات قۆناغی ناو سکی دایک و قۆناغی دەرەوەی سکی دایک، کە قۆناغی شێوە گرتنی تۆوەکەیە. قۆناغی دەرەوەی سکی دایک قۆناغی گەشەکردنی ئەو شێوەیەیە. ئەوەش دەبێت دیاری بکەین کە ئایدیاڵی هەر جەستەیەک لەناو تۆوەکەدا هەیە. ئایدیاڵەکە چۆنایەتیی جەستەکەی لە خۆیدا هەڵگرتووە. لەگەڵ ئەو تەوژمە ژیانەی کە جەستەکە ئاراستە دەکات. دیارە مرۆڤ دەکەوێتە ناو کاری خواردنەوە، ئەو خواردنەش و ئەو دەوروبەرەی کە هەیە، زەوینەن بۆ ئەوەی جەستە گەشە بکات. تۆوەکە لەگەڵ خۆراک هەردووکیان بە جیا بۆ خۆیان توخمێکی سەربەخۆن، کاتێک دەکەونە ناو هارمۆنیەت و تێکەڵبوونەوە توخمی سێیەم پێک دێت، کە نە خۆراکەکەیە نە تۆوەکەیە. بگرە جەستەکە خۆیەتی. بەڵام لێرەدا ئەوەی ئاراستەی توخمی سێیەم دەکات و چۆنایەتیی پێ دەدا ئایدیاڵەکەیە. چونکە ئاگەدارین کە چۆنایەتیی جەستەی مرۆڤ جیاوازە لە چۆنایەتیی جەستەی بوونەوەرانی تر. هاوکات چۆنایەتی جەستەی هەر مرۆڤێک جیاوازە لە هەر مرۆڤێکی تر. دواتر تۆوەکە شی دەبێتەوە و بەدەرکەوتنی هەموو بەشەکانی بۆ خۆی لەناو دەچێت و دەچێتە ناو ئەو چۆنایەتییەوە کە داویەتی.

هەموو مرۆڤێک دوای کامڵبوون و دەرکەوتن شێوەی جەستەکەی دەردەکەوێت. لێرەدا هەوڵ دەدەین چەمکی (جەستەی بایەلۆجی) جیا بکەینەوە و تەواو روونی بکەینەوە لە پێناوی باسەکەدا، چونکە دواتر ئەم چەمکە بەکار دەهێنین بەو پێیەی لەم تیۆرییەدا روون دەکرێتەوە. لەبەرئەوەی جەستەی بایەلۆجی بابەتێکی فراوانە و ناتوانین کەوا بەئاسانی بەسەریدا برۆین، بەڵام لێرەدا جەخت دەکەینە سەر ئەو بەشانەی کە وابەستەن بەباسەکەوە.

(١-٣) جەستەی بایەلۆجی وەک رایەڵی پێوەندیی مرۆڤ بەدنیاوە:

ئاشکرایە کەوا جەستەی بایەلۆجی لەناو خۆیدا خاوەن یاسا و رێسایەکی تایبەتە، واتا لەبارێکەوە سەربەخۆیە و لەبارێکی ترەوە وابەستەیە بە بەشەکانی تری مرۆڤەوە. جەستە وەک ئاشکرایە سەرەتاکانی رایەڵی بەریەککەوتنی مرۆڤە بە دەوروبەرەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو هێزە ئاگەدارکەرەوە وەرگرانەی مرۆڤە، کە خۆی لە هەستە جەستەیەکاندا دەبینێتەوە. هەموو ئەمانە کۆمەڵە هێزێکن لەناو جەستەدا مرۆڤ لە رێگەیانەوە پێوەندی دەبەستێت لەگەڵ دنیادا و زانیاریی دەست دەکەوێت لەسەر شتەکان. دیارە ئەم هێزانە راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ شتانی بەرجەستەدا دەکەن، واتا هەموو ئەو تەن و شتانەی وەک جەستە هەن. جەستەی بایەلۆجی دەتوانی لەگەڵیدا هەڵبکات و هەستیان پێ بکات. ئەمەش راستەوخۆ پێوەندیی هەیە بەیادگەی مرۆڤەوە. جەستەی بایەلۆجی پێوەندییەکی بەتینی هەیە لەگەڵ یادگەدا مرۆڤ تووشی حاڵەتی ناسینەوەی شتەکان دەکات. ئەمەش راستەوخۆ ئەم کاتە دەبێت کە جەستە تەواو دەگاتە رادەی کامڵبوونی خۆی، واتە مرۆڤ لە تەمەنی منداڵی توانای ئەوەی نییە بەباشی شتەکان بناسێتەوە، بەڵام کە ئەو قۆناغەی تێ دەپەڕێنێت زانیاری وەردەگرێت لەسەر شتەکان. ئەوەشی وەری دەگرێت لە شتەکاندا بەشی دەرکەوتەی ئەو شتەیە. بۆ نموونە ئاو، کاتێک جەستە دەکەوێتە مامەڵە لەگەڵ ئاودا ئەوە دەست دەخات کە ئاو تەڕە و ناگیرێت و رەنگی تایبەتی هەیە و جۆرێک لە خەسڵەتی هەیە، کە لە هیچ شتێکی تردا نییە. جەستەی بایەلۆجیی مرۆڤ هەتا ئێرە بڕ دەکات. ئەوەی کە ئاو قانوونێکی هەیە کەوا لە سەد پلەی سەدی دێتە کوڵ یان دۆخی جیاجیای هەیە ئەوەش وابەستەیە بەجەستەوە پاڵپشت بەو جۆرە لە بیرکردنەوە کە هەوڵی زانینی خەسڵەتی تری شتەکان دەدات.

جیا لەو خەسڵەتانەی کە لەباری ئاسییدا هەیەتی. مرۆڤ لێرەدا جیا دەبێتەوە لە بوونەوەرانی تر، چونکە بوونەوەرانیش ئەو جۆرە لە درککردنیان هەیە کە ئاو تەڕ و هەندێکیان ئەگەر بکەونە ئاوەوە هەست بەمەترسی دەکەن. ئەم هێزانە کەوا لەناو جەستەی مرۆڤدا هەن هەروەها لەناو جەستەی گیانەوەرانیشدا هەن. ئەگەر دەرزییەکی تیژ بکەین لە جەستەی هەریەک لە مرۆڤ و هەر گیانەوەرێکدا ئەوا تووشی ڕاچڵەکین دێت. ئەمە خاڵی هاوبەشی مرۆڤ و گیانەوەرانە. هەردووکیان هەوڵی پاراستنی جەستەی خۆیان دەدەن، هەردووکیان لانە و خانوو دروست دەکەن بۆ ژیانی تایبەتی و پاراستنی جەستەی خۆیان. لێرەدا جەستە وەک دیوارێک و وەک یەکەمین ڕایەڵی پێوەندیی مرۆڤ بەدنیاوە دەردەکەوێت، چونکە مرۆڤ لە ڕێگەی جەستەوە دەکەوێتە ناو کۆمەڵگە و شتەکان دەبینێت و هەستیان پێ دەکات. بەڵام ئەگەر بیرکردنەوە دابڕین لە مرۆڤ ئەو کاتە هەستە جەستەییەکانی مرۆڤ لە هەموو کات و لە هەموو شوێنێکدا ورد نییە بۆ بەدەستخستنی زانیاری. بۆ نموونە ئەگەر سەیری خۆر بکەیت ئەوا دەبێت بڵێین زۆر بچووکە، بەڵام ئەگەر بیرمان کردەوە و ئەو یاسایەمان پێ زانی کە هەر شتێک لێمان دوورکەوتەوە ئەوا بچووکتر دەیبینین وەک لە خۆی. ناتوانین بڵێین بچوکە. جەستە ئەگەرچی وردە لە هەندێ زانیاری لەبارەی هەندێ لە شتەکان، بەڵام لە زۆر شوێنی تر بە هەڵەمان دەبات. ئەمەش بوو وای لە فەیلەسوفی فەرەنسایی ڕینێ دیکارت کرد کە گومان لە جەستەی خۆی بکات و حیسابی بۆ نەکات لە وەدەستخستنی یەقیندا "ئەو شتانەی تایبەتن بە جەستەکان واتا شتە زۆر هەستییەکان هەقی ئەوەیان نییە حیسابیان بۆ بکرێت"[٨] لێرەوە جەستە وەک ڕایەڵی دەستخستنی زانیاری لەبارەی ڕاستی جێگەی گومانە. دیارە دیکارت تەنیا جەختی لەسەر ئەم لایەنەی جەستە نەکردەوە و کە ورد نییە لە گواستنەوەی شتە واقیعییەکان بۆ ناو یادگە. بگرە لە شوێنێکی تریشەوە کە مەبەستی دیکارت بوو گومانی خستە سەر جەستە، کە ناتوانێت هیچ زانیارییەکمان بداتێ لەسەر جەوهەری شتەکان هەروەک لە نموونەی پارچە مێوەکەدا باسی دەکات و دەڵێت "ئێمە تەنیا لە ڕێگەی ئیدراکەوە دەزانین ئەو پارچە مێوە چییە"[٩] بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا جەستەی بایەلۆجی یەکەمین وێستگە و ڕایەڵی بەستنەوەی مرۆڤە بەدنیاوە، واتا بۆ دەستپێکردن گرینگترین شتێکە کە دەبێت مرۆڤ بایەخی پێ

بدات بۆ ئەوەی گەشە بکات و بکەوێتە باری کامڵبوونەوە.

(٢-٣) جەستەی بایەلۆجی و پێوەندیی بەدەروونەوە:

جەستەی بایەلۆجی لە پێوەندییەکی توندوتۆڵدایە لەگەڵ دەروون، چونکە جەستە و دەروون هەردووکیان هاوسەنگیی باری مرۆڤ دەپارێزن. بەجۆرێک جەستە کەرەستەی دەروونە و دەروونیش کەرەستەی جەستەیە. ئێمە ئەوە دەزانین لەبارێکدا جەستە فەرمانەکانی دەروون جێبەجێ دەکات، وەک ئەنجامدانی تاوان. کە دەبێت سایکۆلۆجیای تاوانبار تەواو ئامادەکاریی کردبێت و فەرمان بدات ئەو کاتە جەستەی ئەو کەسە دەکەوێتە ناو ئەو جوولانەی کە دەروونی دەیەوێت. لەبارێکی تردا دەروون فەرمانەکانی جەستە جێبەجێ دەکات، وەک پڕبوونی جەستە کاتێک بیەوێت خۆی بەتاڵ بکاتەوە. ئەوا دەروون ناچارە حیکایەت دروست بکات بۆ بەتاڵبوونەوەی جەستە وەک (شەیتانی بوون). جەستە زۆرجار کردارێک دەکات کە دەروون بکەوێتە باری ئاسایی خۆیەوە، وەک ئەوەی زۆرجار دەروونی مرۆڤ دەشڵەژێت بەهۆی دەوروبەر و ئەو ئاریشە کۆمەڵایەتی و خودیانەی خۆیەوە. جەستە دێت بەشوێن کارێکدا دەگەڕێت کە دەروونی کەسەکە بکەوێتە باری ئارامییەوە. وەک جۆرێک لە نووسین هەیە، کە بۆ ئارامکردنەوەی باری دەروونیی نووسەر دەنووسرێت. کە بۆ خۆی حاڵەتێکی ناجێگیری هەیە دێت کرداری نووسین ئەنجام دەدات. کە هەمووی ڕاگرتنی حاڵەتی ئاسایی دەروونی خۆیەتی. (فرۆید) هەر خۆی پێی وایە نووسین بەتایبەتی ئەدەب پڕکردنەوەی گرێ دەروونییەکانی مرۆڤە. بۆ ئێرە ئەم ڕایەی فرۆید تەواو ڕاستە. وەگەرنا جۆری تریش لە نووسین هەیە. بۆ ئەو پێوەندییە گەر جەستە بکەوێتە حاڵێکی نائاساییەوە ئەوا سایکۆلۆجیاش لەناو خۆیدا هەوڵی ئاساییکردنەوەی باری جەستە دەدات. ئەمەش ڕاستی لە کردەی خەیاڵکردن یان خەو و زیندەخەو دێتە ئاراوە. بۆ نموونە ئەگەر بێتو ئێمە ئێوارەیەک خواردنێکی سوێر بخۆین ئەوا شەو لە خەوماندا ئاو دەخۆینەوە. یان ئەگەر لە تاقیکردنەوە دەرنەچین، ئەوا لە زیندە خەوەکانماندا بەردەوام خەیاڵی ئەوە دەکەین دەرچووین و چووینەتە قۆناغێکی تر. ئەم پێوەنییانەی جەستە و دەروون پێوەستە بەیەکترەوە، تەنانەت جەستە زۆربەی کات لەژێر فەرمانەکانی دەرووندا کار دەکات. خاڵێکی تر هەیە دەبێت ڕوونی بکەینەوە،

جەستە فەرمانەکانی دەروون تاوتوێ دەکات و فۆرمی تایبەتی بۆ دەدۆزێتەوە، کە چۆن ئەو فەرمانە جێبەجێ بکات. چونکە زۆرجار فەرمانەکانی دەروون لەناو واقیعدا رێپێدراو نین و نابێت بکرێت. بۆیە جەستە دەبێت فۆرمی رێپێدراو بدۆزێتەوە بۆ فەرمانەکانی دەروون. فرۆید بە(من) ناوی دەبات. دیارە کاتێک جەستەی بایەلۆجی دەکەوێتە ناو مامەڵەوە لەگەڵ دنیا و دەوروبەردا ئەوا بەهۆی هێزەکانی خۆیەوە زانیاری دەست دەخات لەسەر شتەکان. هەموو ئەو زانیارییانەی کە بەدەستی دەخات لە دەوروبەردا دەیگوازێتەوە بۆ ناو یادگەی مرۆڤ. لە پرۆسەی گواستنەوەیدا شتەکان کە لەباری واقیعی خۆیاندان لە کەرەستەیەکی واقیعی و بەرجەستەوە دەگۆڕێن بۆ (وێنە) واتا درەختێک لە واقیعێتیی خۆیەوە دەگۆڕێت بۆ وێنەی درەخت لە یادگەدا، کە بەکۆدێکی تایبەت هەڵی دەگرێت لەناو خۆیدا. کاتێک باسی درەختمان کردەوە جارێکی تر، هێزی خەیاڵ ئەم کۆدە دەباتە سەر شاشەی زەین و وێنەی درەختەکە حازر دەکاتەوە. ئەوەی هەیە لێرەدا جەستەی بایەلۆجی مامەڵە لەگەڵ واقیع دەکات و دواتر ئەم واقیعە دەکاتە واقیعێکی ڕەمزی و وێنەیی لە یادگەدا.

(٣-٣) جەستەی بایەلۆجی و ڕۆح:

باسکردن لە جەستە و ڕۆح باسکردنن لە دوو شتی جیاواز، چونکە یەکیان بەرجەستە و دیارە ئەو تریان کە ڕۆحە شتێکی نادیارە و ئەو بەشە شاراوەی مرۆڤە کە زانینی لەبارەی زۆر کەمە و مرۆڤ لە توانایدا نییە هەمەکیەتی ڕۆح درک پێ بکات. ئەوەی هەیە ڕۆح دەبێت لە ڕێگەی دەرکەوتەکانیەوە پرسیاری ئاراستە بکەین. بەئاگەداری ئەوەی کە ڕۆح تاکە شوێنێک بۆ نواندنی خۆی و دابەزینی لە باری پەتییەوە بۆ ناو واقیع، جەستەیە. جەستەی بایەلۆجی یەکەمین وێستگەی دابەزینی ڕۆحە، ئێستا با بپرسین ئاخۆ ڕۆح ئەو جووڵەیەیە کە لەناو جەستەدا هەیە؟ لە ڕاستیدا گیانەوەرانیش خاوەنی ئەو جووڵەیەن و جەستەیان هەیە. ئەو جۆرە لە جووڵەیە کە لە ژیانی جەستەی بایەلۆجیی ئەو ڕێکخستنە دروستەی هەیە، هەموو وابەستەیە بە جەستەوە و هیچ پێوەندیی نییە بەڕۆحەوە. بگرە ڕۆح دەتوانین بڵێین لەناو جەستەدایە و لەناو جەستەشدا نییە. بەوەی زۆرجار لەناو جەستە خۆی دەردەخات و دەردەکەوێ لەناو جەستەشدا نییە، بەوەی کە ئەو جۆرە

لە زیندوویێتی لە مرۆڤدا هەیە، رۆح نییە. هاوتەریب بەمە گیانەوەرانیش رۆحیان نییە، چونکە تاکە وشەیەک لە بەرامبەر رۆحدا هەبێت عەقڵە. رۆح وابەستەیە بە بیرکردنەوە و زانینەوە ئەو بەشە نادیارەیە کە لە ڕێگەی مرۆڤەوە دادەبەزێتە ناو دنیاوە. ئەم دابەزینەش کە هەیە هەمووی لە ڕێگەی جەستەی بایەلۆجیی مرۆڤەوە دەبێت. وەگەرنا بەدەر لەم وێستگەیە وێستگەیەکی تر نییە بۆ دەرکەوتنی (رۆح/عەقڵ) لەناو مرۆڤدا. جەستەی بایلۆجیش ڕێگە و دەریچەی جیاجیای هەیە بۆ دەرکەوتنی ئەم رۆحە و لە یەک دەرگە و لە یەک ڕێگەوە ئەم رۆحە نایەتە ناو دنیاوە. دیارە ئەم هەڵبژاردنی دەرگە و چۆن دەرکەوتنە هەموو رۆحە کە خۆی دیاری دەکات.

واتا لە یەکەمین پێوەندیی رۆح بە جەستەوە ئەوەیە، رۆح پێویستی بە جەستەیەکە بۆ دەرکەوتن. ئەم باسە لای هێگڵ بە دیالێکتیک ناونراوە، دیالێکتیکی هیگڵی خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەوا هەر توخمێکی رۆحی پێویستی بەتوخمێکی جەستەیی هەیە بۆ دەرکەوتن. واتا هەموو توخمێکی موجەب توخمێکی سالبی دەوێت. بۆ نموونە زێڕ. دیارە زێڕی پەتی خۆڵە و توانای شکڵ گرتنی نییە، بۆ ئەم مەبەستە پێویستی بەمادەیەک هەیە کە توانای شکڵ گرتنی هەبێت وەک مس. وەگەر نا زێڕ لە خۆیدا توانای ئەوەی نییە لە فۆرمێکدا دەرکەوێت. هەروەک رۆحی مرۆڤ لەڕێگەی جەستەوە شکڵ دەگرێت. دیالێکتیک لای هێگڵ دەقاودەق ئەم حاڵەتەی رۆحە بەداخەوە کە بەهەڵە تێگەیشتن هەیە بۆ دیالێکتیکی هێگڵی تەنانەت لای مارکسیش. ئێستا با ئەو پرسیارە بکەین ئاخۆ ئێمە چۆن و بەچیدا بزانین رۆح چییە ؟ دیارە ئەم پرسیارە بۆ خۆی توانای هەڵگرتنی بابەتەکەی نییە چونکە کاتێک دەڵێین ڕۆح چییە، رۆح چەمکێکی هەمەکییە و وەکو شت نییە واتا تەنێکی واقیعی و بەرجەستە نییە. هەر بۆیە ناچارین لە ڕێگەی دەرکەوتەکانیەوە بزانین چییە. ئێمە لێرەدا زۆر ناڕۆین، چونکە بەشێکی گرینکی ئەم باسەمان تایبەتە بە رۆح. بەڵام ئەوەندەی هەیە کە وابەستەیە بە جەستەی بایەلۆەییەوە باسی دەکەین. یەکێک لە دەرکەوتەکانی رۆح زمانە. بەو مانایەی ئەوە پاڵەپەستۆی رۆحە بۆ سەر مرۆڤ کاتێک دەیەوێت دەرکەوێت. ئەو کاتە توانای خوڵقانی زمان لە مرۆڤدا دەردەکەوێت و زمان وەک جەستەیەک دەبێتە ماڵی رۆح و رۆح پێشکێش دەکات. زمانیش جۆری جیاجیای هەیە وەک زمانی فەلسەفی و زمانی کۆمەڵایەتی

و زمانی شیعری... تاد.

مەبەستمان ئەو مجۆرە لە ئەدب و نووسینە کە رۆح دێتە ناویەوە. وەگەرنا نووسین هەیە جەستە و دەروون دەنووسنەوە. ئێمە لەو دەرکەوتەیەوە دەتوانین باسی رۆح بکەین، یاخۆ هونەر کە کەرەستەکانی واقیعین و رۆحی دێتە ناو. یاخۆ ئەخلاق بەمانا (کانت)ییەکەی، کەوا بنەمایەکی عەقڵیی هەیە وەک تیۆری واقیعی دەبێتەوە. لە هەموو ئەم بارانەی خوارەوەدا شتێک هەیە رۆحییە دنیایی دەبێتەوە. واتا شتێکی عەقڵی لە باری پەتییەوە لە ڕێگەی جەستەوە دەبێتە شتێکی واقیعی. هەروەک هیگڵ کاتێک ئاماژە بەوە دەکات "ئەوەی عەقڵییە واقیعییە، ئەوەی واقیعییە عەقڵییە"[(١٠)] لێرەدا پێوەندیی رۆحی مرۆڤ بەجەستەی بایەلۆجییەوە تەواو پێچەوانەی پێوەندیی جەستەی بایەلۆجییە بەواقیعەوە. لە پێوەندیی جەستە بەدنیاوە واقیع لەباری بەرجەستەیەوە دەگۆڕا بۆ باری وێنەیی و زەینی، بەڵام لە پێوەندیی بەرۆحەوە بنەما عەقڵییەکان، یاخۆ ئایدیاکان کەوا لەناو ڕۆحدا وەک کاتیگۆری پەتی هەن. وەک تیۆریەک ئامادەی ئەوەن ببنە پراکتیک و بێنە دنیاوە. ئەو کاتەی هارمۆنیەت دروست دەبێت لە نێوان رۆح و جەستەدا ئەم ئایدیایانە لەباری پەتییەوە دەبنە واقیعی. واتا جەستەی بایەلۆجی دوو کاری تەواو بەرامبەریەک جێبەجێ دەکات. وەک لە پێوەندی بە دنیا و پێوەندی بە ڕۆحەوە. گەرچی دەروون و رۆح هەردووکیان لێکچوونیان هەیە، چونکە لە ڕێگەی جەستەی بایەلۆجییەوە خۆیان دەردەخەن، بەڵام جیاوازن. دەروون بەردەوام بڕیارێکی پێشوەختەیە و شتێکی زانراوە کە دەردەکەوێت. بەڵام رۆح شتێکی نەزانراوە و دوای دەرکەوتن ئێمە دەتوانین پەی پێ بەرین و هەستی پێ بکەین. واتا لە جیهانی عەقڵییەوە دێتە ناو جیهانی هەستییەوە. ئێستا لە دوای ئەم وردبوونەوەیە تێگەیشتین کە پێوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان جەستە و رۆحدا هەیە. وەک لێرەدا روونمان کردەوە.

(٤-٣) جەستەی بایەلۆجی و زانستی پزیشکی:

"زانست بە کەمترخەمی و پێنەکەوتنێکی زەبەندەوە دەست لەو شتە هەڵدەگرێت، کە نابوونە و نییە."[(١١)] هایدگەر لێرەدا شتێکی گرینگمان پێ دەڵێت لەسەر زانست، ئەویش ئەوەیە کە زانست خۆی سەرقاڵ دەکات بەشتانێکەوە کە

هەن. واتا (هەبوو – موجود)، واتا ئەو شتانەی کە وەک جەستەیەکی واقیعی هەن و لە شکڵێکدا شێوەگیر بوون و لە گەشەکردن وەستاون. ئەم کۆنکرێتبوونی شتەکان و نەگۆڕانیان وای کردووە کە ئەم شتە وەک جەستەی خۆی بەیان بکات. زانست لێرەدا کارایە و هەوڵەکانی خۆی چڕ دەکاتەوە، هەر بەوەندەش ناوەستێت کە وەسفی ئەو شتە بکات، بەڵکو هەموو ئەو خەسڵەتە شاراوانەش دەدۆزێتەوە کە ئەو شتە هەیەتی. وەک جەستەی بایەلۆجی ئاگەدارین کە تەنێکە و هەیە، کاتێک زانستی پزیشکی هەموو توێژینەوەکانی خۆی ئاراستەی ئەم جەستەیە دەکات، دیارە هەر بەوەندە ناوەستێت کە ئەم جەستەیە بناسێ و ورد و درشتی بخاتە بەرچاو. بگرە هاتووە جەستەشی خستووەتە کۆمەڵێ بواری جیاجیا وە هەتا زانیاریی دەست کەوێت لەسەر جەستە لە بوارە جیاجیاکاندا. واتا تەواو ئەو گۆڕانکارییانە بزانێت کە جەستە بەسەریدا دێت لە حاڵەتە جیاجیاکاندا، هەتا هیچ شتێک بەشاراوەیی نەمێنێتەوە. دیارە لەم خستنە باری جەستەدا کۆمەڵێک دەرکەوتەی جەستە بەدەردەکەوێت هەموو ئەم دەرکەوتنانە حاڵەتێک بەجەستە دەدەن، کەچ بارێک وەربگرێت. ئەمەش هەموو بەتاقیکردنەوە ڕوو دەدات. لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی تاقیکردنەوەکاندا زانستی پزیشکی بەشوێن ئەو حاڵەتە دووبارەبووانانەدا دەگەڕێت کە ڕوو دەدات لەسەر جەستە. ئەم حاڵەتە دووبارەبووانەش ڕێگەی سەرەتاین بۆ دانانی قانوونێکی گشتی لەناو جەستەدا. یاخۆ بۆ دۆزینەوەی ئەم یاسا گشتییانە. گەر ئێمە سەیر بکەین جەستەمان خاوەن کۆمەڵێک یاسای گشتییە، کە لە بوارە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت. بۆ نموونە ئێمە نەخۆشیی ئەنفلۆنزامان هەیە، لە ڕێگەی دووبارەبوونەوەی ئەم نەخۆشییە بە تاقیکردنەوە قانوونێکی گشتی کەشف کراوە. کە بە چ دەرمانێک جەستە لەو حاڵەتەدا ئاسایی دەبێتەوە، ئەم قانوونە بەسەر تەواوی جەستەکاندا دەچەسپێت. بەهەموو جیاوازیی جەستەی مرۆڤەکانەوە، ئەم قانوونانەش ڕاستی بە خستنە ناو بواری جەستەوە کەشف دەکرێت. لێرەدا زانستی پزیشکی وەک هەموو زانستێکی تر سەرکەوتوویی خۆی لەوەدا بەدەست دەهێنێت کەوا گشتیترین یاسای جەستە کەشف بکات، هەتا بتوانێت بڵاو بکرێتەوە بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا. چەندە زانستی پزیشکی بەرەو بەشەکی بڕوات ئەوەندە دەکەوێتە ناو گومانەوە. ئێستا با ئەوە بپرسین بۆچی زانستی پزیشکی دەیەوێت هەموو قانوونەکانی جەستە

بزانێت؟ دیاره ئێمە باش دەزانین کە مرۆڤ هەر جەستە نییە، بەڵکو دەروون و ڕۆحیشە. زانستی پزیشکی هەروەک هەموو زانستەکانی تر سەرەتاترین مەبەستی کۆنترۆڵکردنی جەستەیە، بگرە لەوەش دەترسێ کە نەتوانێت جەستە کۆنترۆڵ بکات. دیارە زانستی پزیشکی بەبێ غیابی ڕۆح ناتوانێت ئیش لەناو جەستەدا بکات، بۆیە سەرەتا مرۆڤ وەک جەستەیەکی ڕووت دەهێڵێتەوە هەتا بتوانێت بە ئارەزووی خۆی کاری تێدا بکات. (بەنج) یەکێکە لە ڕێگەکانی غافڵکردنی ڕۆحی مرۆڤ لە جەستە، هەتا جەستەی مرۆڤە کە خۆی بداتە دەست ئەم زانستە و کاری تێدا بکات. ئێمە نامانەوێت باسی خراپە و چاکەی ئەم زانستە بکەین، بەڵام دەمانەوێت بزانین جەوهەری جەستە ئەوەیە کە لە زانستی پزیشکیدا هەیە یان نا؟ ئاخۆ جەستە وەک هەر مادەیەکی تر جەوهەری هەیە ؟ دیارە دەبێت ئێمە ئەوە لە بەرچاو بگرین جەستە هەر ئەوە نییە کە لە زانستی پزیشکیدا هەیە، هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێ داوە جەستە پێوەندییەکی گەورەی هەیە بەدەروون و ڕۆحەوە. بەڵام زانستی پزیشکی لە یەکەم هەنگاویدا ئەم پێوەندییانە دەپچڕێنێت و جەستە بەتەنیا وەردەگرێت. زانستی پزیشکی قانوونە گشتییەکانی ناو جەستە پێ دەزانێت و خەسڵەتە دیار و نادیارەکانی جەستە کەشف دەکات. وەگەرنا ناتوانێت لە جەوهەری جەستە نزیک بێتەوە. چونکە جەوهەری جەستە شتێکی مادی و بەرجەستە نییە و ئەندامێکی جەستە نییە هەتا زانستی پزیشکی بتوانێت کەشفی بکات. زانست لە بواری هەستەکی بەولاوە (هەبوو- موجود) ناتوانێت هیچمان بداتێت لەبارەی شتێکەوە کە ناشتە (بوون- وجود). هایدگەر لێرەدا زانست دەخاتە ژێر پرسیارەوە چونکە ناتوانێت لە ناشت تێ بگات.

زانست خۆی لە سەرەتادا بیرکردنەوە بووە لە بوون، بەڵام کاتێک خۆی جیا کردەوە لە فەلسەفە ئیدی بە هەبووەوە خۆی خەریک کردووە. هەر ئەوەندەش نا، بگرە بەردەوام ناشت وەک وەهم و وەک شتێکی نامۆ ڕەت دەکاتەوە. "مەڵۆ و مەیدانی زانستەکان زۆر لە یەکتری دوور و جیاوازن، جۆری توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی بابەتەکانیان لە بنەڕەتدا لە یەکتری جیان. ئەو شپرزەیی و پچڕپچڕیەی پەیرەوی زانستەکان تەنیا بە هۆی ڕێکخستنی تەکنیکانەی زانکۆ و کۆلێجەکانەوە ڕاگیر کراوە. بەپێچەوانەوە ڕەگ و ڕیشەی داکوتانی زانستەکان لە بنج و بناوانەوە وشک بووە"[١٢] هایدگەر لێرەدا بەوە لە زانست بێ تاقەتە، کە ڕەگ

و ڕیشەی خۆی کە فەلسەفەیە لە بیر کردووە. بەڵام کاتێش دەکەوێتە ناو ئەوەی بەرەو پووچەڵبـــوونەوە بڕوات جـــارێکی تر پەنای بۆ دەباتەوە "زانست دەیەوێ لەبارەی عـەدەم هـیچ نەزانێت، بەڵام شـتـێکی دڵنیـاکـراو هـەر دەمـێنێـتـەوە لەو جێگەیەی کە دەیەوێت زانینە تایبەتییەکەی خۆی دەرببڕێت. پەنا دەباتە بەر عەدەم و ئەوەی بەلای ناوە جارێکی تر دەگـەڕێتـەوە بۆ لای"(١٣) لە ڕاسـتـیـدا جـەوهـەری شتەکان لەو بەشەیاندا نییە، کە وەک شت دەردەکەوێت. بگرە هەموو کات لەوەدایە کە دەرنەکەوتووە. ئەوەی هەیە دەرکەوتووترین خـەسڵەتی ئەو شتەیە کە هاتووە تەدەر. بۆ نموونە ئاسن جـەوهـەرەکـەی ئەو حـاڵەتە ڕەقـیـیـەی نییـە کـە لـەباری ئاسـاییدا هەیەتی، واتا ئەوەی هەیە لەباری سروشتی ئاسندا جەوهەر نییە. بەڵام جەوهـەری ئاسن لەوێشـدا نییـە کە ئاسن بار هەیە تێیدا شل دەبێ و دەکشێ و سـوور دەبێتەوە. بەڵام لەناو هەموو ئەمـانەدا ئاسنیەتی ئاسن هەیە. واتا یەک شت هەیە کـە هـەمـوو ئەو بوارانە وەردەگرێت. ئەگەر بێتو وەک زانست جەخت بکەینە سەر ئەوەی کە هەیە ئەوکاتەی کە دەبینین ئاسن لەباری سروشتیدایە ئەوا دەبێت بڵـێین ئاسن ڕەقـە، بەڵام لەنـاو کـوورەدا دەبێت بڵـێین نـەرمـە. واتـا دەبێت بەپێی گۆڕینی بارەکانی مـاهیـەتیـشی دەگۆڕێت، بەڵام ئەوەی کە دەبێت و دەردەکـەوێت ئەوە جـەوهـەری ئەو شـتـەیە. جـەوهـەریش ناشـتـە و زانست لە توانایدا نییـە هیچ لەبارەیەوە بزانێت، بگرە زانست لە شتەکاندا دەتوانێت مـەیدانەکانی خۆی بخاتە کـار و لێکۆڵینـەوەکانی دەست پێ بکات. لەم بارەشـدا ئەوەی کـە چنگی دەکـەوێت خـەسڵەتەکانی ئەم شتەیە و جەوهەر نییە. زانستی پزیشکی ناتوانێت جـەوهـەری جەستـە بزانێت چونکە جـەوهـەری جـەستـە ناشـتـە و هـەردەم لە پشت جـەسـتـەوە جـەسـتـە تۆکمـە دەکات و بارەکانی پێ دەدات. ئەوەی لەو بارانەدا کە لە جـەسـتـە دەردەکـەوێت زانســـتی پزیشکیش دەتوانێت خـەسـڵـەتەکـانی بزانێت، چونکە دەرکەوتووە و هاتووەتە ناو دنیـاوە و بووە بە شـتێکی واقیـعی. ئیـتر ئـەم زانسـتـە خاسیەت و سیفەتەکانی ئەزموون دەکات، دواتر ئەم جەستەیە دەخاتەوە ناو هەمان بوار و بەرێگەی تاقـــیکردنـەوە ئەو گـــۆڕانـانەی کـــە دووبـارە دەبـنـەوە لـە تاقیکردنەوەکاندا زانستی پزیشکی وەک یاسا ئەزموونی دەکات. لێرەوە جۆرەکانی نەخۆشی و جـۆرەکانی چارەسـەری دەدۆزێتـەوە. زانسـتی پزیشکی لـە دەرکـەوتنی خـاسیـەتەکانی جـەسـتـەدا کارایە و نیشانـەکانی کۆنکرێت دەکات، بەڵام نازانێت

ئەوەی کە لەهەموویاندا یەک شتە و هەر جارە و بەشێوە و فۆرمێک دەردەکەوێت چییە. چونکە جەوهەر هەردەم پەنهانە و زانستیش لەگەڵ پەنهاندا هەڵناکات. ئەوەی زانست لە مەیدانی شتدا چالاکە هەمووی بۆ کۆنترۆڵکردن و کۆنکرێتکردنی جەستەیە. هەتا بتوانێت ئیشی تیا بکات و هەموو زانیاریەکی دەست کەوێت. بەڵام بۆ ناشت فەلسەفە وەک دەقیقترین زانست دەکەوێتە وێزەی ناشتەوە هەموو کات پرسیار لە بەشی ناشتی شتەکان دەکات، ئەمەش بۆ ئەوە نییە کەوا کۆنترۆڵی ئەم شتە بکات، بگرە ئەو ناشتە وەک خەمێکی قووڵی مرۆڤ دەکەوێتە ناو کرانەوە و دەرکەوتنەوە. جەوهەر وەک خەمێکی گەورە و ڕەسەنی مرۆڤ دەبێتە خەون خەونێکی پڕ لە بەها و مانا دوور لە هەموو بێ مانایی و پووچی و بۆشییەک. لەوێدا لە حاڵەتی کرانەوەی ئەو شتە و مرۆڤدا، ئەو ناشتە لەباری ناشتەوە دێتە باری شتییەوە. واتا یەکەم جار وەک ناشت هەیە لەباری کرانەوەدا کە مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم زانینەوە، ئەم ناشتە دەبێتە شت ئەو چێژە قووڵەی مرۆڤیش بۆ زانین لەویادایە کە خۆی دەبینێتەوە لە بەرامبەر ئەم ناشتە. بەدوور لە چاوی هەموو ئەوی ترێک. یان ئەم کەشفکردنە و زانینە مرۆڤ بەرەو ئەوە دەبەن مەعریفەی دروستی هەبێت بەرامبەر بە شتەکان و جەوهەرەکانیان. ئەو کاتە مرۆڤ وەزیفەی خۆی و هەموو شتەکان دەزانێت. بۆیە فەلسەفە وەک قووڵترین و دەقیقترین زانست بێ مەبەستە لە هەموو پێبڕین و سوود و قازانجێک. فەلسەفەش نایەتە ناو ڕوحێکەوە کە خەمی ئەوەی هەبێت خۆی ببینێتەوە لە چاوی بەرامبەرەکاندا. فەلسەفە بۆ ڕۆحێکە کە خەمی قووڵی زانینە بەتەنیا و بەشوێن بوونی خۆیەتی، بەشوێن ئەوەیە کە خۆی چییە و بێباکە لەوەی چۆن دەردەکەوێت. بۆیە زۆر بەڕاشکاوانە دەڵێم فەلسەفە زۆر قووڵتر و وردترە لە زانستی پزیشکی نەک لەبارەی جەستەوە بگرە لەبارەی هەموو شتەکانەوە، بەڵام زانستی پزیشکی دەتوانێت دروست بێت بەو مەرجەی حاشا لە بنج و بنەمای خۆی نەکات کە فەلسەفەیە.

**٤- دەروون:**

جارێ با بزانین دەروون چییە؟ ئێمە زانیمان جەستەی بایەلۆجی رایەڵی پێوەندیی ئێمە بوو بەدنیاوە، واتە ئێمە لەگەڵ دنیادا دەکەوینە ناو بەریەککەوتن و

مـامـەڵەوە. هەر جەستەی بایلۆجیش خۆی خـاوەنـی کۆمـەڵە هێزێکی جیاواز بوو لەوەی ئەم واقـیـعـە بگوازێتـەوە بۆ نـاوچەیەکی تری مـرۆڤ ئەویش دەروونە. دیارە دەروون شوێنی ژیانی مـرۆڤە لەناو خۆیدا، واتا ژیانی مرۆڤ بەرابردوو و ئێستا و داهاتووەوە کە مرۆڤ خـەیاڵی دەکات لەناو دەرووندا هەیە. دەروون وەک جـەستـەی بایەلۆجی خـاوەنی بەش و هێـزی جـیـاوازە، وەک یادگـە و خـەیاڵ و زەین و... تاد هەمــوو ئـەمــانە بەشــەکـانی ئەم ناوچەیەی مــرۆڤن. لە کـاتێکدا لە زانســتی دەروونناسیدا هەمووی لە (نەست)دا کورت کراوەتەوە. بەئاگا لەوەی نەست بـەشـە و گشت نییـە، چونکە نەستی مرۆڤ بەرامـبەر بەیادگـە دەوەستێتـەوە کە شـۆنی بیرەوەریی مرۆڤە. بەڵام دەروون وەک چەمکێکی گشتی خـاوەنی کۆمەڵە بەشێک و هێـزی تایبـەت بـەخـۆیەتی کـە خـەریکە بەژیانـی ناوەوەی مـرۆڤـەوە، واتا گـەر مـرۆڤ ژیانی واقیعی خۆی بەجەستەی بایەلۆجی بەسـترابێتەوە و لە دەرەوە مـامەڵە لەگەڵ شـتـەکـاندا بکات ئەوا دەروون ژیانی مـرۆڤـە لەگـەڵ وێنـەی شـتـەکـان لە ناوەوەی خۆیدا. واتـا هەم خۆیەتی هەم ئەوی تریشـە. خۆیەتی بەوەی ڕووتەختی ئەوانی ترە ئەوی تریشە چونکە حزووری هـەیە لەناویدا. بۆیە کێشە دەروونییـەکانی مرۆڤ زۆر قورستر و سـەختترن لە کێشە واقـیعییـەکانی مرۆڤ، چونکە کێشـەی واقیعیی مـرۆڤ دەتوانێت خـۆی لێ بدزێتـەوە، لەبەرئەوەی سـەرچاوەی کێشـەکە لە دەرەوەی خۆیەتـی و زانراوە. بەڵام کێشـەی دەروونی لەناو مرۆڤدایە و مرۆڤ ناتوانێت خۆی لێ جـیـا بکاتەوە. بۆ نمـوونە ئێـمـە دوو جـۆر ترسـمـان هەیە ترسـێکمـان هـەیە لە دەرەوەی مرۆڤە وەک ترسانی مرۆڤ لە ئاژەڵێکی دڕندە، ئەم کەسـە دەتوانێت خۆی ڕزگـار بـکات لەم ئاژەڵە و ڕێوشـوێنی تایبـەت بگرێتـە بـەر بۆ دوورخسـتنەوەی ئەو ئـاژەڵە. بـەڵام ترسـێکی سـایکۆلۆجی هـەیە کــە لـە ناوەوەی مــرۆڤــدایە، وەک گیرۆدەبوونی مرۆڤێک بۆ ئەوەی هەموو کات وا بزانێت کەسێک بەشوێنیەوەیەتی لە ڕاسـتـیدا کـەسـەکە وەک واقیـع نییـە و بگرە وەک وێنە لەنـاو دەروونیدا هـەیە. بۆیە ڕزگـاربوون لەم ترسـە زۆر سـەخـتـترە لە ترسی یەکـەم، هەر لێرەوەشـەوە دەڵێین دەروون شـوێنی ژیانی مرۆڤە لەناو خـۆیدا مـامـەڵەی مـرۆڤە لەگەڵ دنیـایەکدا کە هـەمووی وێنەیە. واتا واقیعە بەڵام لەناو دەرووندا. لێرەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە هـەر نەست نیـیـە بەتـەنیـا بگرە خـەیاڵ و یادگـە و بیـرەوەری و زەین هەمـوو ئـەوانە وابەستەن بەم ناوچەیەی مرۆڤەوە. دەروون بۆ خۆی وەک بەشێکی مرۆڤ هەیە ئیتر

که مرۆڤ دەکەوێتە ناو واقیعەوە ئەم ناوچەیەش دەست بەگەشەکردن دەکات، واتا مرۆڤ لەگەڵ ژیانی واقیعیی خۆیدا ژیانی دەروونیشی دەست پێ دەکات. ئیتر مرۆڤ حزووری لە کامیان زیاترە، ئەوا لە بەشەکانی تردا ڕوونی دەکەینەوە. ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەوەیە کە بەشەکانی سایکۆلۆجیا وەک خەیاڵ و زەین و یادگە و بیرەوەری وەک یەکەیەکی سەربەخۆ هەن، بیرەوەری کە لە یادگەدایە مرۆڤ لە دەرەوە بۆی دروست دەبێت بەیارمەتیی جەستەی بایەلۆجی، یان لە ناوەوە بۆی دروست دەبێت بەیارمەتیی عەقڵ. لە ڕاستیدا بیرەوەری کە بەشە وەک سایکۆلۆجیا ناسراوە کە گشتە. چونکە هەموو ڕووداوەکانی مرۆڤ کە لە یادگەدا هەن وەک بیرەوەری حیکایەتی منداڵی و حیکایەتی گەنجی و پیری هەمووی لە یادگەدا وەک بیرەوەری هەیە. ئیتر مرۆڤ زۆرجار یان دەکەوێتە ناو دووبارەکردنەوەی ئەم حیکایەتانە یان لەناویاندا دەژیت و دادەبڕێت لە واقیع.

ئەم بیرەوەرییانە بەیارمەتیی یادگە و خەیاڵ و زەین جمووجۆڵ دەکەن و پاڵپەستۆ دەکەنە سەر جەستەی بایەلۆجی. دەروون دەتوانین وەک جەستە و مادەیەک مامەڵەی لەگەڵ بکەین، چونکە جەستە لێرەدا ئاماژەیە بۆ شتێکی حازر ئامادەبوو (هەبوو) واتا هەر شتێک لە گەشەی خۆی دەوەستێت و لە فۆرمێکی تایبەتدا شکڵ دەگرێت جەستەیە. چونکە دەکەوێتە بەر هەستەکان، جا ئەم هەستکردنە لە واقیعدا بێت یان لە دەرووندا، لە واقیعدا وەک ئەوەی کورسییەک دەبینین ئەم کورسییە سەرەتا حاڵەتی بیرکردنەوەی کەسێک بووە، دواتر بووەتە کورسییەک و دەرکەوتووە. ئەم دەرکەوتنە لەباری واقیعدا جەستەیە و لەو بارەشدا کە مرۆڤەکە وێنەی کورسییەکە لە یادگەیدا هەیە پێش دروستکردنەکە هەر جەستەیە، بەڵام جەستەیەکی وێنەیی و سایکۆلۆجی. ئا لێرەدا دەتوانین دەروون وەک جەستە و مادە ناوی بنێین، چونکە شتەکان کە دەبنە بیرەوەری وەک جەستەیەک هەن لەناو یادگەدا واتا کۆنکرێت بوو. چونکە گەشە و بیرکردنەوەی تێدا نەماوە هەر بۆیە سیفەتی کشان وەردەگرن و دەبنە مادە. لێرەدا چەمکی مادە مانایەکی فراوانتر وەردەگرێت کە بیرکردنەوەش دەگرێتەوە دوای تەواوبوون و کاملبوون. واتا لەباری هەبوویەتیدا. ئایدۆلۆجیاش کە حاڵەتی دووبارەکردنەوەی بیروباوەڕێکە هەر مادەیە. لێرەوە دەتوانین بڵێین دەروون مادەیەکی ناواقیعییە بەهێزەکانی جەستەی بایەلۆژی ناتوانین درکی پێ بکەین. بگرە بە هێزەکانی

دەروون دەتوانین مامەڵەی لەگەڵدا بکەین وەک خەیاڵ.

(١-٤) دەروون وەک تەبیعەتی مرۆڤ:

دیارە هەر مرۆڤێک تەبیعەتێکی دیاریکراوی هەیە، کە وەک حەز خۆی نمایش دەکات. ئەم تەبیعەتە نەک لەناو مرۆڤەکاندا بگرە لەناو گەل و میللەتەکانیشدا جیاوازە، هەر گەلێک خاوەنی سایکۆلۆجیا و تەبیعەتێکی جیاوازە. لە پاڵ ئەمەشدا هەر مرۆڤێک تەبیعەتی جیاوازە لە مرۆڤێکی تر. پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەوەی ئەم هەموو جیاوازییانە کۆ دەکاتەوە چییە؟ ئاخۆ چ هیوایەک هەیە بۆ کۆبوونەوەی گەلان لەگەڵ یەکتر، با واز لەو کۆبوونەوانە بێنین کە دنیای بەرژەوەندیی شتەکان ڕێک دەخات، چونکە لێرەدا هیچ زەمانەتێک لە ئارادا نییە. لێرەدا دەبێت زۆر قووڵتر بەرەو ئەو تیۆرە بڕۆین ئەویش گەڕانەوەیە بۆ عەقڵ. عەقڵ دواجار ئەو ماڵەیە کە شتەکان دەخاتە باری هارمۆنیەتەوە،عەقڵ لە پشت تەبیعەتەوە وەستاوە تەبیعەت و دەروون بەبێ عەقڵ تووشی پێکدادان و لێکدڕی دەبن. عەقڵ ئەو بنەمایەیە کە مرۆڤ وەک مرۆڤ سەیر دەکات دوور لە جیاوازیی خێڵ و ڕەنگ و.... تاد بەڵام پێوەندیی عەقڵ بە تەبیعەتەوە ئەوەیە کاتێک عەقڵ دێتە دنیاوە بەناو تەبیعەتدا دەڕوات ئەوجا دەچێتە سەر جەستەی بایەلۆجی. واتا عەقڵ بەناو دەروونیدا دەڕوات ئەوجا دەچێتە سەر جەستەی بایەلۆجی و دێتە دنیاوە. کاری گرینگی دەروون و تەبیعەت چۆنایەتیی دەرکەوتنی عەقڵ دەگۆڕن، دیارە لێرەدا هەر عەقڵ خۆی چۆنایەتی دیاری دەکات، بەڵام پێکهاتە و کەرەستەی ئەو چۆنایەتییە تەبیعەت دایدەڕێژێت. لێرەدا جیاوازی دێتە کایەوە. بەڵام بەبێ عەقڵ جیاوازی نییە ئەوەی هەیە لێکدڕی و بەگشتداچوون و سڵەمینەوەیە. عەقڵ کە دەردەکەوێت بەناو تەبیعەتدا دەڕوات و جیاوازی دەخاتەوە. گەر سەیری فەیلەسووفەکان بکەین بەتایبەتی ئایدیالیستەکان هەموو ئەمانە لە فەلسەفەکانیاندا گوزارشت لە عەقڵ دەکەن، بەڵام کاتێک ئەم عەقڵە بەناو تەبیعەتیاندا ڕۆیشتووە چۆنایەتییەکی وەرگرتووە کە جیاوازن لە یەکتر. دیارە تەبیعەت زمان و کولتوور دەگرێتەوە، بەڵام لەناو هەموویاندا یەک شت هەیە دەرکەوتووە ئەویش عەقڵە. بنەماکانی بیرکردنەوەی ئەم فەیلەسووفانەش هەموو تەبا دێتەوە لەگەڵ یەک بەڵام دەبێت لە عەقڵەوە سەیری بکەین نەک لە چۆنایەتییەکانەوە. چونکە سەیرکردن لە

چۆنایەتییەکانەوە تووشی کێشەمان دەکات، بەڵام لە عەقڵەوە ئەوە دەزانین کە چۆنایەتییەکان هیچ نین جگە لە کەرەستەی جیاجیای دەرکەوتنی عەقڵ. لێرەدا گرینگیی دەروونمان بۆ دەردەکەوێت کە چەندە کاریگەری هەیە لە دنیاییبوونەوەی عەقڵدا. تەنانەت ئاینە ئاسمانییەکان بۆ خۆیان هەموویان تەعبیر لە یەک بنەما دەکەن، هیچ ئاینێک بنەماکەی دژی ئەوی تر نییە، بگرە تەبا و گونجاوە. بەڵام هەریەکەیان چۆنایەتییەکی جیاوازی هەیە ئەوەش تەبیعەت لێرەدا ئەو کارە گرینگەی بەردەکەوێت کەوا عەقڵ بار دەکات بەکەرەستەکانی خۆی. جا زمان بێت یان کولتوور. تەنانەت لە هونەریشدا بەمانا هایدگەرییەکەی هەموو یەک شتە ئەویش بەڕووداوکردنی هەقیقەتە، ئیتر ئەو رووداوە لە تەبیعەتدا دەگۆڕێت وەک ڕوودان لەناو ڕەنگدا یان زماندا یان هەر کەرەستەیەکی تر. ئێستا با بپرسین بۆچی تەبیعەتەکان و جیاوازییەکانی هەن؟ دیارە بەبڕوای ئێمە بەدەر لەوەی هەر مرۆڤێک بۆ خۆی شتێکە جیاوازە لە ئەوی تر. هەر مرۆڤێک خولیای یاخۆ دارای شتێکە کە بەختەوەریی ئەو لەوەدایە ئەو شتە وەدی بێت. مرۆڤ کە دەگاتە ئەو شتە، یان ئەو خەونە ئەنتۆلۆجییەی تەحقیق بێت دەگاتە بەختەوەریی ڕاستەقینە. بەئاگا لەوەش هەر کۆمەڵگەیە یان هەر نەتەوەیەک کە جیاوازن لە تەبیعەت و سایکۆلۆجیادا هەمووشیان بۆ ئەوە هاتوون کەوا عەقڵ دابەزێننە ناو دنیاوە. جیهان لەسەر بنەمای عەقڵ ئاوەدان بکەنەوە بەو جیاوازییانەی خۆیانەوە کە عەقڵ دەردەکەوێت لەناویاندا. وەزیفەیەکی گەردوونی هەیە مرۆڤایەتی بۆی دەژیت بەڵام گرینگ ئەوەیە کە هەر نەتەوەیەک وەزیفەکەی خۆی ئەدا بکات، هەتا تەبا بێتەوە لەگەڵ وەزیفە گەردوونییەکەدا. وەک ئەوەی هەموومان خەریکی دروستکرنی خانوویەک بین هەمووومان ئایدیاڵی ئەم خانووەمان لە زەیندایە بەڵام بەشێکمان دیوار و بەشێکمان سەقف و بەشێکمان بناغە و..... تاد دروست دەکەین هەریەکەمان کە کاری بەشەکی خۆمان دەکەین کارە گشتییەکەشمان ئەنجام داوە.

ئەم جیهانەش ڕاستی لە جوولەی خۆی ناکەوێت بەرەو ئەو خەونە هەنگاو دەنێت. ئەمەش عەقڵ تێیدا حاکمە و عەقڵ بنەمای شتەکانە. نەک بەداخەوە لای ڕۆشنبیری ئەمەریکایی (فۆکۆیاما) کە لە کتێبەکەیدا بەناوی (کۆتاییی مێژوو دواین مرۆڤ) باسی ئەوە دەکات، کە ئیتر هیچ مۆدیلێکی تر نییە مرۆڤایەتی لە یادگەیدا مابێت هەتا وەدی بێت. ئەو مۆدیلە ئەمەریکاییەیە و ئەو جۆرە لە مرۆڤی

ئەمەریکایی دوایەمین دەرکەوتەی عەقڵ بێت لە جیهاندا. ڕاستی ئەم دیدە تەسکە بیرێکی تەواو کوێرە بەرامبەر بە عەقڵی مرۆڤ کە پێی وابێت دیموکراسییەتی لیبراڵ دوایەمین شتێک بێت کە عەقڵی مرۆڤایەتی تێیدا مابێت و لە ئەمەریکاشدا دەرکەوتبێت. وەک لە بەشی کۆتاییی کتێبەکەیدا دەڵێت "لە کۆتاییدا، پێم وایە ڕەگەزی مرۆیی وەکو کاروانێکی درێژی عەرەبانەی دار وایە کە کۆمەڵە ئەسپێک ڕای دەکێشن بە ڕێگەیەکی سارا و ناخۆشدا، هەندێک لەو عەرەبانانەی بەوردی ڕووگەی خۆیان دیاری کردووە و بەزووترین کاتیش دەگەنە شوێنی مەبەست، هەندێکی تریشیان دووچاری هێرشی هیندییە سوورەکان بوونەتەوە و ڕێگەیان ون کردووە، هەندێکی تریشیان ڕێگەی دوور هیلاکی کردوون و بڕیاریان داوە لە ناوەڕاستی ڕێگەکەدا و لەنێو سارادا جێنشین بن و دەستبەرداری بیرۆکەی گەیشتنە شار بوون، بۆیە مادام ڕێگەی شاریان ون کردووە، ئێستا هاتوون بەدوای ڕێگەی ئەلتەرناتیڤدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی لە میانەیدا بگەنەوە شار، لە کۆتاییشدا هەموو ناچارن هەمان ڕێگە بگرنە بەر- ئەگەر پێچاوپێچیش بێت- تاوەکو بگەنە ئامانج و مەبەستی خۆیان. بەڕاستیش زۆربەی ئەو عەرەبانانە لە کۆتاییدا دەگەنە شار، کاتێکیش دەگەنە جێ، هیچ شتێکیان لە یەکتر جیاواز نییە، تەنیا کاتی گەیشتن و درەنگ و زوویی نەبێت. درەنگ و زوویی گەیشتنی بەرەو دیموکراتییەتی لیبراڵی کاروانە درێژەکەی دەگاتە کۆتایی، کۆتاییی مێژوو."[١٤] ئێمە واز لەوە دەهێنین کە چۆن عەقڵی ئەمەریکایی و پیاوی ئەمەریکایی تووشی کێشەی گەورە گەورە هاتوون، هەر خۆی تەواوی ئەم کتێبە بە سوپەرمانکردنی ئەمەریکایە و بەردەوام سیستەمی ئەمەریکایی وەک ئایدیاڵ وێنا دەکات و پێی وایە ئەمەریکاییەکان یەکەمین گەلن گەیشتوونەتە کۆتاییی عەقڵ و هەموو گەلانیش بەرەو ئەوێ دەڕۆن. ئێمە بەداخەوە لە مێژوودا هیچ دەوڵەتێکمان نییە کە عەقڵی بێت، جا چۆن شتێک کە هێشتا دەرنەکەوتووە کۆتاییی دێت. وەلێ ئەو باسە باسێکی گەورە و قووڵە دەرفەتی ئەوەمان نییە لەگەڵی بڕۆین، بەڵام ئەوەی هەیە ئەم تەبیعەتە جیاوازیی شتەکان دەخوڵقێنێت ئەویش ئەو وەزیفە گەردوونییەیە ئاراستەی ئەم جیاوازی و لەیەکنەچوونی شتەکان دەکات لە پێناوی کامڵبوونی دنیا و دەرکەوتنی عەقڵدا.

(٢-٤) دەروون وەک جەستەیەک بە ڕووی دەرەوەدا:

ئەوەمــان زانی دەروون وەک جەستــەیەک لەناو مـرۆڤدا هەمـوو بەشـەکانـی خـۆی هەڵگرتووە، وەک خـەیاڵ و زەین و بیرەوەری و یادگە هەر بەوەندەش کۆتایی نایەت، بگرە دەرکەوتەشی هەیە لە دەرەوەی خۆی کە پەخش دەبێتـەوە بە ڕووی دەوروبەردا. کەسـایەتیی مـرۆڤ یەکێکە لە دەرکەوتەکانی دەروون، کە وەک جەسـتـەیەک بەیانی دەکـات بە ڕووی ئەوی تردا. کـەسـایەتیی کـۆمــەڵگەش بەشـێـوەیەکی گـشـتی وەک جـەســتــەی نەتەوە دەردەکــەوێت لە بەرامـبــەر نەتەوەکـانـی تردا، کـە هەردووکـیـان وێنەیەکی نەگۆڕە. وەک مرۆڤێکی موسڵمان و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی ئەم دوو وێنەیە وەک جەسـتەیەکی دەروونناسی نەتەوەکە دەگرنەوە. ئیتر ئەم وێنانە کاتێک دەکەونە بەرامـبەر یەک بەریەک دەکەون و دەکەونە ناو پێوەندییـەوە. هەروەک پێوەندیی نێوان مـرۆڤـەکان و کۆمــەڵگەکان، کە هەریـەکـەیان بە وێنەیـەکەوە دەچنە بەردەم یەکـتـر و لەســەر ئاسـتـی ئەم وێنانە دەکـەونـە ناو مـامــەڵەوە. زانسـتـی سـۆسـۆلۆجـیـا زیاتر وابەسـتـەیە بەجۆر و پشکنینی پێوەندیی ئەم جـەسـتـانە بەیەکتـرەوە. وەک پێوەندیی تاک و کۆمەڵگە پێوەندیی تاک و تاک لەسەر ئاسـتی خێزان و قوتابخـانە........ تاد. ڕاستیی ئەم زانستە چەند بتوانێت کە ئەم پێوەندییانە کەشف بکات ئەوەندە جێگەی باوەڕ و ئەوەندە وەک زانسـتێکی گشتگیر خۆی نمایندە دەکات. گرینگیی ئەم وێنانە لەگەڵ یەک وای کردووە مـرۆڤ قـوربـانی بدات لە پێناو چەسـپـاندنی وێنەی خـۆی لە زەینی بەرامـبـەرەکـانیدا. ئەم وێـنانەش هەردەم وەک مـوقـەدەسـێک چ لەلایەن تاک چ لەلایەن کۆمەڵگەوە گوزارشتی لێ کراوە.

(٣-٤) کەسایەتی وەک جەستەی دەروونی تاک:

ئاشـکرایە لەوەی دەروون بـەوەی کـە توانـای کـشــان و درێژبوونەوەی هــەیە وەک جـەسـتـەیەک دەردەکەوێت. واتا لەنـاو مرۆڤ دەردەچێت و دەچێتـە دەرەوەی مـرۆڤ. سایکۆلۆجیا لە ڕووی دەرەوەدا زیاتر ئەو حاڵەتەیە کە وێنەی خـۆی نیشـانی دەرەوە دەدات. ئێمـە هەمووماـن وێنەیەکمـان هەیە لەناو کۆمـەڵگەدا جا لە ئەنجـامی وەزیفە یان حـەز یان کـار و پیـشـە دروست بووە. وەک (مـامـۆسـتـا، هونەرمـەند، ئاسنگەر، سـەرۆکی عەشـیرەت... تـاد) هەمـوو ئەمـانە وێنەی مـرۆڤن نیشـانی دەرەوەی دەدەن، لە حاڵەتی ناردندا. واتا کەسەکە دەبێتـە مامۆستا لە دەرەوە ئەم وێنەیە وەردەگرێت

دواتر ئەم وێنەیە دەچێتە زەینی کەسەکەوە پانتاییەکی زۆر داگیر دەکات، بەوەی کەسەکە ئەم وێنەیە بەردەوام نیشانی بەرامبەر دەدات وەک جەستەیەک هەوڵی کشان و درێژبوونەوەی دەدات. گەر ئەم حاڵەتە لەناو چەمکێکدا کۆ بکەینەوە ئەوا پێش ئێمە ناونراوە لەلای فرۆید بە (من) گوزارشتی لێ کراوە یان کەسایەتی. دیارە ناونانی ئەم وێنەیە لای فرۆید بە من دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باوەڕەی فرۆید کە جەوهەری مرۆڤ و هەموو کار و کردەوەکانی دەبەستێت بەدەروونەوە. بۆیە ئەمە بە دوایەمین جەوهەری مرۆڤ دەزانێت. فرۆید لە باسی مندا دەڵێت "من لەناوەرۆکی خۆیدا نوێنەری جیهانی دەرەوەیە"[١٥] بەو مانایەی (ئەو) کە مانای غەریزەکان دەگەیەنێت لای فرۆید کە دەیەوێت بێتە دەر ئەوا دەبێت بە فلتەری مندا بڕوات، چونکە من ئاگەدارە بەوەی دەرەوە چۆن ئەم کردارەی دەوێت. ئەم منە باڵانسی وێنەی مرۆڤ ڕادەگرێت و هاوسەنگی دەپارێزێت "ئیدراکی ئەوە دەیکەین کە (من) ئەو بەشەیە لە (ئەو) کە هەندێک ڕاستکردنەوەی بۆ کراوە لەژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی جیهانی دەرەکی بەهۆی گونجانی ئیدراک و هەست. بەشێوەیەکی تر درێژکراوەی جیاکردنەوەی ڕووەکانە. ئەمەش هەوڵ دەدا درێژکراوەیەک بێت لە جیهانی دەرەوە بۆ ئەو و کێشەکانی"[١٦] ئێستا با پرسیاری ئەوە بکەین بۆچی ناومان ناوە کەسایەتی ؟ لە ڕاستیدا کەسایەتیی مرۆڤ ئەو وێنەیە کە مرۆڤ هەیەتی لەناو کۆمەڵگەدا، دیارە ئەم وێنەیە نەگۆڕەو وەک ئایدیاڵ لەناو ئەم کەسەدا هەیە، کەسەکە بەردەوام هەوڵی درێژکردنەوەی خودی خۆی دەدا، لێرەدا کەسایەتی دەچێتە ژێر بابی جەستەی دەروونییەوە. چونکە نەگۆڕە و وێنەیەکی نەجووڵاوە و دەرەوە دەستی هەیە لە دروستکردنیدا و بەدەرەوە کەسایەتی دروست بووە. مرۆڤ ئەوی تر ئەم خودەی پێ داوە، گەر سەیر بکەین ئەمڕۆ شەڕی مرۆڤ لەسەر کەسایەتییە، چونکە مرۆڤ لە حاڵەتی گەورەکردن و پاراستنیەتی لە کاتێکدا کەسایەتی تەعبیر لە جەوهەری مرۆڤ ناکات. بگرە وێنەیەکی کۆمەڵایەتییە کۆمەڵگە دەیدات بەمرۆڤەکان. بە ئاگا لەوەی مرۆڤ بەردەوام ئەم وێنەیەی ئاراستەی دەوروبەری دەکات و بەم وێنەیە دەچێتە ناو بوارەکانەوە. بۆ نموونە کابرایەک، کە کەسایەتییەکی دینیی هەیە لە جیاتیی ئەوەی جەوهەری دین ئەم وێنەیە ئاراستە بکات و بیخوڵقێنێت، ئەوا ئەم خودە کە وێنە کۆمەڵایەتییەکەیە دینەکەی ئاراستە دەکات. واتا نوێژ و حەج دەکات بۆ ئەوەی کەسایەتیی خۆی

بچەسپێنێ لە کۆمەڵگەدا، نەک بۆ ئەوەی خوا ڕازی بکات، بەڵکو دەیەوێت خەڵک ڕازی بکات. بۆیە ڕاستیی خود ئەمڕۆ لەسەر ئاستی تاک تێپەڕیوە و بووەتە گەورەترین پاڵنەری مرۆڤ. هەوڵەکانی مرۆڤی ئێمە لەبەر ئەوە نییە تا چی هەیە لە ئیمکانیدا وەدی بێت، بگرە بەردەوام داواکارییەکانی ئەم خودە جێبەجێ دەکات هەتا گەورەترین پانتایی لەسەر زەینی کۆمەڵگە داگیر بکات. دیارە پێوەندیی نێوان کۆمەڵگە و خود پێوەندییەکی دوولایەنە و گەرموگوڕە، کەوا کۆمەڵگە خۆی لە هێزێکی واقیعی و بەرجەستەوە کە خۆی لە دەموچاوی باوک مەلا و مامۆستا و.... تاد نمایش دەکات، دەکاتە هێزێکی نابەرجەستە و نادیار کە خۆی لە دەموچاوەکانی دەدزێتەوە وەک هێزێک دێتە ناو مرۆڤەوە جەستەی مرۆڤەکە دەکاتە دەموچاوی خۆی و ئاراستەی دەکات. مرۆڤەکەش لە حاڵەتی دانەوەی کۆمەڵگەدا خود دروست دەکات، واتا وێنەیەک دادەتاشێت بەم وێنەیە کۆمەڵگە هەڵدەگرێت لە خۆیدا و دواتر دەیداتە دەورویەرەکەی. لەم پێوەندییەدا کۆمەڵگە و تاک لەناو گرێبەستێکی گەورەدان، بەوەی مرۆڤەکە دەبێت ڕازی بێت بە عەقڵی کۆمەڵگە بجووڵێتەوە کۆمەڵگەش دوای قوربانیدانی ئەم کەسە کە عەقڵی خۆی فڕێ دەدات لە بەرامبەر عەقڵی کۆمەڵگەدا، کۆمەڵگە کەسایەتی یان خودی بۆ دروست دەکات. واتا خود لەلایەک قبووڵی کەسەکەیە بۆ دروستبوون هەم قوبووڵی کۆمەڵگەیە بۆ کەسەکە. دیارە مەسەلەی کەسایەتی و پاراستنی خود لە کۆمەڵگەی کوردیدا زۆر سەخت و دیارە تەنانەت پاراستنی ئەم خودەیە یاخۆ ترسان لە شکانی ئەم خودەیە لەناو کۆمەڵگەدا مرۆڤی کوردی بۆ دوژمنداری و کوشتار و هەرا ڕاپێچ کردووە. هەمووی لە پێناوی نەرووشانی خود و پاراستنی بووە. تەنانەت بەشێک لە مەسەلەی کوشتنی ژنان پێوەستە بەپاراستنی ئەم وێنە کۆمەڵایەتییەوە. واتا ئەو کۆمەڵگەیە ئەو کەسە ئاراستە دەکات ژنکوژی بکات. ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە کەسەکەش قبوڵی کۆمەڵگە دەکات ئاراستەی بکات. لێرەدا ئەوەی گرینگە ئەوەیە مرۆڤ بزانێت (خود- کەسایەتی) خۆی نییە و وێنەیەکە ئەوی تر بەخشیوویەتی بە ئێمە. تەنانەت گەر سەیری حیکایەتی پێغەمبەرەکان بکەین خوا زۆرجار پێغەمبەرانی بەرامبەر کردووەتەوە لە نێوان خود و منی خۆیاندا لە پێناوی ئەوەی کۆمەڵگە وەک هێزێکی ئاراستەکەر فێڵ لە پێغەمبەران نەکات و منی خۆیان ئاراستەیان بکات. لێرەدا تاقیکردنەوەی خوا بۆ پێغەمبەرەکان وەک (ئیبراهیم) و

سەربڕینی (ئیسماعیل)ی کوڕی هەموو ئەمانە بۆ ئەوەن مرۆڤ ئینتیمای بۆ ئەوە بێت هەقیقەت چۆنە ئەوها دەرکەوێت، نەک مرۆڤ خەیاڵی بەرەو ئەوە بڕوات سەیری دەوروبەر بکات کە چۆن ئەو کارە بکات. لێرەدا خود زاڵ دەبێت بەسەر مرۆڤدا، ئەم بنەمایە لای فەیلەسووفانیش هەیە، لەلای سوکرات زۆر بەئاشکرا باسی شکانی ئەم وێنەیە دەکات و جەخت دەکاتەوە کە نابێت مرۆڤ ئینتیمای هەبێت بۆ ئەم وێنەیە. چونکە ئینتیماکردن بۆ ئەم وێنەیە ئینتیماکردنە بۆ ئەوی تر و ئەو نوێنییە، بەڵام بۆ کەسێک کە لە بوونی ڕەسەنی خۆی دابڕاوە. هەموو خولیای ئەو گەورەکردن و کشان و درێژبوونەوەی خودی خۆیەتی کە ئەم خودەش کۆمەڵگە دەیدات بە مرۆڤ. مرۆڤیش دەبێت بەردەوام پاسەوانی بکات چونکە کۆمەڵگە دەتوانێت بیشێوێنێت و تێکی بدات. ئەو حیکایەتانە زۆرن کە چۆن کەسانی خودپەرست لە بەردەم کەسانی خۆنوێندا بچووک بوونەتەوە، وەک بچووکبوونەوەی (سەدام حوسێن) لە بەردەم (مەلا مستەفا)دا. بچووکبوونەوەی ئینگلیز لە بەردەم (شێخ مەحموود)دا. هەموو ئەمانە چ ئینگلیز چ سەدام بەو وێنە ساختەیە هاتوون مامەڵەیان کردووە، لە بەردەم ئەمەدا (شێخ مەحموود) و (مەلا مستەفا) تەعبیریان لە بوونی ڕەسەنی خۆیان کردووە و ساختەییی ئەوان لە بەردەم هەقیقەتی ئەماندا چۆکی داداوە. لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەرکەوتنی هەقیقەت و وێنەدا حاڵەتی ملکەچ بوون هەیە، ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە ئەخلاقێکی ناوەکی لەدایک دەبێت لە بەرامبەر ئەخلاقی کۆمەڵگەدا بەردەوام ئەخلاقی کۆمەڵگە دەکەوێتە حاڵەتی ملکەچبوون لە بەردەم ئەم ئەخلاقە ڕەسەنەدا. چونکە ئەخلاقی ڕەسەن بەبێ هیچ ئامانج و مەبەستێک لەدایک دەبێت و کەسەکە بەس خۆی دەبینێت و ئەوی تر نابینێت. بەڵام ئەخلاقی کۆمەڵایەتی دەبێت کۆمەڵگە قبووڵی بکات، واتا خود دەبێت ڕێوڕەسمی کۆمەڵگە بزانێت، هەتا ئەم مرۆڤە بۆی دەرکەوێت کە چۆن هەڵسوکەوت بکات. بەڵام ئەخلاقی ڕەسەن و ناوەکی بەقانوونی عەقڵ لەدایک دەبێت بۆیە هەموو کات پێکدادان هەیە لەسەر ئاشکرابوون و دەرکەوتنی هەقیقەت لەگەڵ عەقڵی کۆمەڵگەدا. بەردەوام کەسانی بیریار و فەیلەسووف کەسانێکن لە دەرەوەی کۆمەڵگە، کۆمەڵگە خۆشی ناوێن چونکە ئەم کەسانە ئینتامایان بۆ خودی خۆیان نییە بەڵکو بۆ عەقڵیانە. خود هەموو قانوونەکانی کۆمەڵگە و هەموو چۆنایەتییەکانی کۆمەڵگەی تێدا خەزن کراوە، بەڵام

عەقڵ بارە بە قانوونەکانی خۆی و مەرج نییە تەبا بێتەوە لەگەڵ عەقڵی کۆمەڵگەدا. ڕاستیی خود جەستەی سایکۆلۆجیی مرۆڤە، واتا کەسایەتیی مرۆڤ کە ئەمەش وێنەیە و لە ڕێگەی جەستەی بایلۆجییەوە خۆی نمایش دەکات. ئەم وێنەیەش وێنەیەکی وەستاو و نەگۆڕە لە یادگەی مرۆڤدا. مرۆڤ ئەم جەستەیەی درێژ دەکاتەوە و گەورەی دەکات. وەک ناوبانگ کۆکردنەوە و چەپڵە و داگیرکردنی زەینی کۆمەڵگە. لەبەرئەوەی خود جەستەیە و قابیلی بریندار‌بوون و لەناوچوونیشە وەک حەیاچوون و ئابڕووچوون و..... تاد.

(٤-٤) شوناسی نەتەوەیی وەک جەستەی دەروونی کۆمەڵ:

لە باسی پێشوودا باسی کەسایەتیمان کرد، کە مرۆڤ دروستی دەکات وەک وێنەیەک نیشانی دەرەوەی دەدات. بەڵام هەر دەرەوە بۆ خۆی سەرچاوەی ئەم وێنەیەشە، واتا مرۆڤەکە چاودێریی ناو کۆمەڵگە دەکات ئەم وێنەیە ئاراستەی عەقڵی کۆمەڵگە دەکات هەتا ئەو کەسە شوناس وەربگرێ لەناو کۆمەڵگەدا. دیارە ئەم وێنەیە کاتێک تووشی شکان و ڕووشان و بریندار‌بوون دێت تاکە ڕێگەیەک بۆ چاکبوونەوە و هاتنەوە سەر باری ئاسایی گەڕانەوەیە بۆ عەقڵ. دەبێت هەست بکات کە ئەوەی برینداره لەناو ئەودا خۆی نییە و خودی خۆیەتی کە چووەتە شوێنی منی ئەو، هەر ئەم جەستەیەشە وەک کەسایەتیی مرۆڤ دەردەکەوێت بە ڕووی دەرەوەدا. ئەمە لەسەر ئاستی تاک بەڵام بۆ کۆمەڵ هەروەک چۆن بیرەوەریی تاک هەیە کە سۆز و عاتیفەکانی تاک دیاری دەکات هەروەها بیرەوەریی گشتیش هەیە کە کۆی کۆمەڵگە تیایدا بەشدارە. واتا کۆمەڵێک تێی کەوتوون دواتر ئەم ڕووداوە بووەتە بیرەوەرییەکی گشتی بۆ ئەو کۆمەڵە. جەماوەرێک پێک دێت کە هەموو پێکەوە تووڕە دەبن و خۆشەویستی دەگۆڕنەوە، لە ئەنجامی گشتیبوونەوەی بیرەوەریی ئەو کۆمەڵە وێنەیەک دروست دەکات و وەک شتێکی موقەدەس و مەرجەع بەهای خۆی هەیە. کە دەتوانێت ناوی بنێین (کۆخود) کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١ یان هەڵەبجە یەکێکە لە بیرەوەرییە گشتییەکانی کورد، کەوا هەموومان بێ تاقەت دەبین گەر یەکێک سووکایەتی بەم بیرەوەرییە گشتییەمان بکات. ئەوا هەموومان دەکەوینە بەرگریکردن لەم بیرەوەرییە، ئەوەشی بریندار دەکرێت جەستەی گشتیی ئێمەیە. زانای فەرەنسایی گۆستاڤ لۆبۆن کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی دەروونزانی

کۆمەڵایەتی و بەوە لە فرۆید جیا دەکرێتەوە کە دەروونزانی لەسەر ئاستی کۆمەڵگە تاوتوێ کرد، لە بەشێکی کتێبەکەیدا بەناوی سایکۆلۆجیای جەماوەر دەڵێت "کۆی ئەو تایبەتمەندییە هاوبەشانەی کە لەلایەن هەریەک لە ژینگەی دەوروبەر و بۆماوە بەسەر هەموو تاکەکانی گەلێکدا دەسەپێت ڕۆحی ئەو گەلە پێک دەهێنن"(١٧) لۆبۆن لێرەدا زۆر بەوردی باسی رۆحی گەل دەکات کۆمەڵە دەستەواژەیەک هەن جێگەی تێرامانن (ژینگە – بۆماوە – تایبەتمەندیی هاوبەش)

هەموو ئەمانە بەجۆرێک بیرەوەریی گشتین. لای لۆبۆن نەتەوە کاتێک دروست دەبێت کە بیرەوەرییەکی هاوبەشیان هەبێت، دیارە ئەم دیدە لەناو تیۆری نەتەوەناسیدا تیۆرێکی گەورەیە و گەلێک نووسەر پشتگیریی دەکەن و پێیان وایە رۆحی گەل ئەو بیرەوەرییە هاوبەشە پێکی دەهێنێت کە ئەو کۆمەڵە هەیانە. ئەم تێڕوانینە گەر بیبەنە ناو پێوەندیی دەوڵەتان ئەوا تەواو دەچەسپێت لە واقیعدا. شەڕ و ئاژاوەی نێوان دەوڵەتان یان ناکۆکیی نێوان ئاینەکان سەرچاوەکەی ئەوە بووە کە کۆخودی یەکتریان بریندار کردووە. ئەو کاریکاتێرەی دەرهەق بەپێغەمبەری ئیسلام کرا، لێدان بوو لە جەستەی گشتیی موسڵمانەکان و ئەو جەماوەرەی دروست کرد. هەموو دنیای گرتەوە (کۆخود) ئەو جەستە گشتییەیە لە یادگەی کۆمەڵگەدا کە تەواوی رووداو و کارەساتەکانی لە خۆیدا هەڵگرتووە. واتا وەک جەستەیەکی گشتی بیرەوەریی گشتی هەڵدەگرێت. دواتر کۆخود وێنەیەک بەرجەستە دەکات بۆ دەرەوەی خۆی ئەم وێنەیە دەبێتە ڕەمزی بیرەوەرییە گشتییەکان. بۆ نموونە ئەم وێنەیە لە وڵاتێکی وەک ئێراندا وێنەیەکی دینییە. لە تورکیادا وێنەیەکی نەتەوەپەرستییە. ئەم وێنەیە وەک جەستەیەکی گشتی بووەتە بەرگی ئەم نەتەوانە بەڕووی دەرەوەدا. هەر سووکایەتیکردنێک بەم وێنەیە لێدانە لە ڕوحی جەماوەر بە مانا لۆبۆنییەکەی.

وەگەرنا لە ڕاستیدا لە بنەمادا لێدان لە جەستەی گشتیی ئەو کۆمەڵگەیەیە نەک رۆحی گەل. ئەم جەستە دەروونییە گشتییە خۆی وەک ڕۆحێکی وەهمی نیشان دەدات و هەموو ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە ئاراستە دەکات. ئەو ئەندامانە کاتێک بەرگری دەکەن بەرگری لەو وێنەیەی خۆیان دەکەن کە نیشانی دەرەوەیان داوە. ئەگەر بنۆڕین کاتێک کچێک بەدوو دەکەوێت لە کۆمەڵگەی کوردیدا ئەوا جەستەی گشتی ئەو عەشیرەتە بریندار دەبێت، کاتێک براکەی ئەو کچە دەکوژێت تووشی

پەشیمانبوونەوە دێت، لەباری پەشیمانبوونەوەیدا کەسەکە دەزانێت کە ئەو کارەی پێ کراوە و خۆی نەبووە، بەڵکو ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە کە وەک وێنەیەک خۆی خزاندووەتە ناو بیرەوەریی ئەو کەسە و جەستەی بایەلۆجیی ئەو کەسەی ئاراستە کردووە، کە ڕووداوی کوشتن ئەنجام بدات. کاتێک کەسەکە کارەکە دەکات ئەو کاتە هەست بەو هێزە دەکات کە ئاراستەی کردووە. لێرەدا دەردەکەوێت ئەم کۆخودە جەستەیە و ڕۆح نییە، چونکە کەشوهەوایەکی دەرەکی بۆ ئەم کەسەی دروست کردووە "بەڵام زاراوەی جەماوەر لە ڕوانگەی دەروونییەوە واتایەکی تەواو جیاوازی هەیە. لە هەندێک هەلومەرجی دیاریکراودا بەتایبەتیش لەو جۆرە هەلومەرجانەدا ڕەنگە کۆمەڵە خەڵکێک ببنە خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی نوێی ئەوتۆ کە زۆر جیاواز بن لە تایبەتمەندیی هەریەکەیان بە جیا لەو کاتەدا ئەوەی پێی دەگوترێت کەسایەتیی تاکی هۆشیار لە ئارادا نامێنێت و لە بریی ئەوە سۆزمەندیی بیر و بۆچوونەکانی ئەو یەکە بچووککراوانەی جەماوەر پێک دەهێنن". [18]

لێرەدا لۆبۆن باسی ئەوە دەکات تاک هۆشیاریی نامێنێت، چونکە یەکەمین پێوەندیی نێوان کۆمەڵگە و تاک لەم بارەدا ئەوەیە ئەو تاکە هۆشیاریی خۆی فڕێ بدات هەتا جەستەی بایەلۆجی تەواو ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگە وەک هێزێکی نادیار بێتە ناو ئەم جەستانەوە. کۆمەڵگە سەرەتا کۆمەڵێک بیروباوەڕ و کۆمەڵێک وێنە و ئایدیۆلۆجیا ئاراستەی دەروونی کەسەکە دەکات کەسەکەش وەک وەرگر یادگەی خۆی بار دەکات بە تەواوی ئەو بیرەوەرییانەی کە لە زەینی کۆمەڵگەدا هەیە. لە قۆناغی دووەمدا ئەم بیرەوەرییانە دادەبەزێتە ناو جەستەی بایەلۆجیی کەسەکە و ئاراستەی دەکات. بۆ نموونە ئەگەر یەکێک دین وەک حیکایەت وەربگرێت سەرەتا ئەم کەسە دین دەکاتە کۆمەڵێک ڕێوڕەسم و بیرەوەری و حیکایەت. واتا وەک بیرەوەری لە یادگەیدا دایدەنێت لە قۆناغی دووەمدا ئەم هێزە دینییە کە کۆمەڵایەتی بووەتەوە دادەبەزێتە سەر جەستەی بایەلۆجی. بۆ نموونە کەسەکە شێوازی جەستەی خۆی بەو شێوەیە لێ دەکات کە کەسە دینییەکان هەیانە پاشان هەر هێرشێک بکرێتە سەر ئەم ئاینە بە ئایدیۆلۆجیکراوە ئەوا ئەم کەسە بێ ئاگا لە خۆی دەکەوێتە بەرگریکردن لێیان. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم کەسە نەک هەر لە دین تێ ناگات بگرە ناشگاتە بەختەوەری چونکە ئەم کەسە خۆی نییە و ئەوی ترە.

**٥- دەروون وەک جەستەیەک بە ڕووی ناوەوەدا:**

لە باسی پێشوودا باسی دەروونمان کرد کە وەک جەستەیەک دەردەکەوت بە ڕووی دەرەوەدا لەسەر ئاستی تاک دەبووە کەسایەتی و لەسەر ئاستی کۆمەڵیش وەک ناسنامە و شوناس دەردەکەوت. ئەم وێنەیە شتێکی بەرجەستە نییە بگرە شتێکی زەینییە و خۆی لە کۆمەڵێک بیروڕا و کۆمەڵێک وێنە و سروتا دەبینییەوە. لێرەدا ئەوە بزانین کە دەروون بە ڕووی ناوەوەشدا جەستەیەکە پانتاییەکی زۆری مرۆڤی داگیر کردووە لەناو یادگەی مرۆڤدا لێرەدا دوو جۆری ئەم جەستەیە دەخەینە ڕوو.

(١-٥) وێنەی ئێمە کە لە ئەوی ترەوە گەڕاوەتەوە ناومان:

ئەمەش ڕاستیی ئەو شوناسەیە کۆمەڵگە داویەتی بە ئێمە ئەم شوناسە ئەسڵ و فەسڵی دیار نییە، کە ئاخۆ خۆمانین یان نا. بەڵام ئەوەندە هەیە کەوا لەم حاڵەتی هاتنەوەی ئەم وێنەیە بۆ یادگەی مرۆڤ، ئەوە نییە ئەم وێنەیە وەستاوە و جێگیر بێت. بەڵکو ئەم وێنەی کە ئەوی تر داویەتی بەئێمە دەبێت جارێکی تر نیشانی دەرەوەی بدەینەوە کە خۆی لە کەسایەتیدا دەبینێتەوە. بەڵام لەناو یادگەی مرۆڤدا، بەردەوام پەل دەهاوێت بۆ ناو هەموو قسەو کردار و هەڵوێستەکانی مرۆڤ، چونکە بەردەوام دەبێت پاسەوانیی ئەم وێنەیە بکات و هەر کاتێک کەوتە پێوەندییەوە لەگەڵ دەوروبەردا ئەم وێنەیە نیشـان بدات، چونکە بەبزربوونی ئەم وێنەیە کەسەکەش بزر دەبێت لەناو کۆمەڵگەدا. پاراستن و دانەوەی ئەم وێنەیە هەمووی وەک پرۆسەیەک لەناو مرۆڤدا ڕوو دەدات لەم بارەدا مرۆڤ نابێت بەدڵی خۆی بکات بەڵکو دەبێت بەدڵی کۆمەڵگە بکات. هەموو هەڕەشەی کۆمەڵگەش لە مرۆڤ ئەوەیە مرۆڤەکە بێ مانا بکات، بۆیە مرۆڤ ناچارە لە ترسی بێ ماناکردنی خۆی لەلایەن کۆمەڵگەوە هەموو مەرجەکانی کۆمەڵگە قبووڵ بکات بەهەموو شەڕ و هەرا و ناخۆشییەکانی. کاتێک مرۆڤ گەیشتە ئەم قۆناغە بەردەوام لەو کەسانە نزیک دەبێتەوە کە دەزانن مامەڵە لەگەڵ ئەم وێنەی ئەو بکەن. ناچێتە ناو پێوەندیی دەوروبەرێکەوە کە خەتەریاتی هەبێت لەسەر ئەم شوناسە. لە کاتی مامەڵەشدا مرۆڤەکەش هەوڵی گواستنەوەی ئەم وێنەیەی دەدات بۆ زەینی بەرامبەرەکەی ڕێگەکانی گواستنەوەش زۆرن وەک ترساندن - چاکەکردن - هاوسۆزی.... تاد.

که هەموو ئەم ڕێگەیانە تۆخکردنەوەی وێنەی کەسەکەیە لە یادگەی بەرامبەردا. ئەوی تر و مرۆڤەکە لە حاڵەتی دان و دانەوەی ئەم وێنەیە و پێوەندییان لە یەک ئاست و لە یەک تایمدا جێگر دەبێت و گۆڕانکاری ڕوو نادات. چونکە ناچنە ناو شوێنێکەوە کە بزربن لە یەکتر. بەڵکو دەبێت هەموو کات ئەنجامی شتەکان بزانن ئینجا دەچنە بەردەمی یەکتر. ئەم جۆرە لە پێوەندییی ڕۆژانە لە نێوان حزبەکان و سیاسییەکان و عاشقەکان و ڕۆشنبیران و ژن و مێردەکاندا دەیبینین و هەستی پێ دەکەین.

(٢-٥) وێنەی ئەوانی تر لەناو ئێمەدا:

ئاگەدارین یادگەی ئێمە پڕە لە وێنەی کەسانی دەوروبەرمان جا هەر لە چۆنایەتیی کەسەکان و تەبیعەتیان. ئێمە لەناو خۆماندا مامەڵە لەگەڵ ئەم وێنانە دەکەین لە کاتی ئامادە و نائامادەییی کەسەکەدا. واتا هیچ جیاوازی نییە کەسەکە لێرە بێت یان لێرە نەبێت، چونکە لە هەردوو بارەکەدا مامەڵە لەگەڵ وێنە وەستاوەکە دەکرێت. کە لەناو یادگەماندایە ئەم حاڵەتەش تووشی کوێربوونمان دەکات، چونکە ئێمە کەسەکان یەک جۆر دەبینین و بۆ ئەم باسەش دواتر بەدرێژی لەسەری دەڕۆین.

بەشی دووەم

# ژیانی واقیعی

**١-بیرەوەریی ژیانی واقیعی:**

ژیانی واقیعی مرۆڤ دەتوانین بڵێین ئەو رووبەرووبوونەوەی جەستەی مرۆڤە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا. مرۆڤ کاتێک لەدایک دەبێت هەست بە جەستەی خۆی دەکات هەست بە دەست و قاچ و لەشی خۆی دەکات.

ئەم هەستکردنەی جەستەی بایەلۆجیی مرۆڤ لەگەڵ شتەکاندا ژیانی واقیعی مرۆڤ پێک دەهێنێت. ژیانی واقیعی ژیانی مرۆڤە هەر لە سەرەتای لەدایکبوونەوە هەتا مردن. ئەم ژیانە ڕاستەوخۆ مرۆڤ لە ڕێگەی جەستەی خۆیەوە هەستی پێ دەکات. هەر ساتێکی ئەم ژیانەش لە شیمانەی ئەوەدایە بگۆڕێت و ببێتە ڕابردوو.

مرۆڤ لە ژیانی واقیعی خۆیدا شتەکان بە جەستە هەست پێ دەکات و لە ڕێگەی جەستەشەوە دەتوانین ئەم ژیانە ئەزموون بکەین. جەستەی مرۆڤ هەرە بەشە گەورەی کارەکانی ئەوەیە واقیع لە واقیعێتیی خۆیەوە بگوازێتەوە بۆ مرۆڤ. لە ئەنجامی ئەم گواستنەوەیەدا واقیع لەباری هەستی خۆی دەردەچێت و دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵە وێنەیەک، کە هەر وێنەیەک هەڵگری زانیاریی پێویستە بۆ مرۆڤ لەبارەی دەوروبەرەکەیەوە.

واتە کاتێک بۆنی گوڵێک دەکەین ئەم بۆنە لە یادگەماندا هەڵدەگیرێت وەک کۆدێک، کە ئەو گوڵەمان بۆ دەپارێزێت. هەر کاتێک بۆنی ئەو گوڵە بەر لووتمان بکەوێتەوە ئەوا گوڵەکە دەناسینەوە و دەکەوینە ناو حاڵەتی ناسینەوەی شتەکان. جا ئەوە کەس بێت یان شوێن یان هەر ڕووداوێک بێت. کەوا جەستە دەیداتە یادگە و یادگەش بەپێی پێویستی کۆمەکی مرۆڤ دەکات لە دووبارە ئامادەکردن و حازرکردنەوەی بەمەبەستی ناسینەوە و هەڵڕشتنی لە بەردەم مرۆڤدا. کە وەک زانیارییەک وەدەستی دەهێنێ. زمان و فێربوونی زمانیش هەمان حاڵەتە بەمانا

(سـۆسـۆر)یەکـەی. کە مـرۆڤ لە ڕێگەی جـەسـتـەی خـۆیەوە زمـان وەردەگرێت و یادگەش وەک بیرەوەرییـەک هەڵی دەگرێت و دەیداتەوە مـرۆڤ. بەگشـتی جەستـەی بایەلۆجی سەرچاوەی ژیانی واقیعی مرۆڤە. مرۆڤ لە ڕێگەی جەستەیەوە دەتوانێت لە واقیـعدا بێت. ئەو کاتە جەسـتـە ئامادەگیی هەیە ئەوا مـرۆڤ واقیـعییـانە ژیان دەباتە سەر. بیرەوەری واقیعی ئەو ژیانە تۆمـارکراوەی مرۆڤە لەناو یادگەی خۆیدا کـە لـە ڕێگەی واقـیـعـەوە دروست بووە. ئاشـکرایە ژیانـی مـرۆڤ پڕە لـە هەوراز و نشـێـو و نەهـامـەتی و غـەدر و....... تاد هەمـوو ئەمـانە دەبنە بیـرەوەریی ژیـانی واقیعی مرۆڤ.

مـانەوەی ئەم بیـرەوەرییـانەش لە یادگـەدا وابەسـتـەیە بـە جـۆر و کـاریگەری ڕووداوەکان لەسەر ژیانی مرۆڤ. جار هەیە ڕووداوێک دەمـێنێتەوە و لە بیر ناچێت، جاریش هەیە ڕووداوێک زوو لە بیر دەچێت. ژیانی واقیعی مرۆڤ مێژووی دەرەکیی مـرۆڤە، مـێژووی گەشـەکردنی جەسـتـەیەتی. مـێژووی خـوێندن و ژیان و ژنهێنان و کار و هەمـوو هەوڵەکانی مرۆڤـە بۆ خۆدامەزراندن لە زەینی ئەوی تر و حـازرکردنی خۆی لەسەر تەختەی شانۆی ژیان. گەر بێتو سەیر بکەین ئەم ژیانەی مرۆڤ ئەمڕۆ بووەتە بـەخـەمـتـرین بەشـی ژیانـی مـرۆڤ. واتای ژیان بووەتە ئـەوەی مـرۆڤ چەند بتوانێت جـەسـتـەی خـۆی بحـەوێنێتـەوە بـەو ئەندازەیە ئەو مـرۆڤـە ژیـانی ئەزمـوون کردووە.

واقیع و جـەسـتـە تەواو وابەسـتـەن بەیەکترەوە. لـە واقیعدا کۆمـەڵە ئەخلاقیـاتێکی گشتی هەیە مرۆڤ دەبێت ڕەچاوی بکات هەتا بتوانێت بژیت. ئەم ژیانەش ژیانە بۆ ڕابردوو. ژیانە بۆ ئـەوەی لە یادگـەدا هەڵی گـرین و دواتر نیـشـانی ئەوانی تری بدەینەوە.

چونکە شـتێکی زۆر ئاسـاییـە مـرۆڤ ڕازی نەبێت بەوەی جـەسـتـەی تێر بکات و تەواو. چونکە جـەسـتـە ئەوە نییـە تێر بوو ئیـتر تەواو مـرۆڤ بگاتە ناو قـۆناغێکی ترەوە و سـەرلەنوێ لە ژیانێکی ترەوە دەست پێ بکاتـەوە. بگرە دیسـان جـەسـتـەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێت پڕی بکەینەوە. ئەوە بۆ جـەستەی بایەلۆجی هەروەک ئەوەی گۆزەیەک پڕ بکەینەوە و بەتـاڵ بێتـەوە. ئاخـۆ ئەوە خـراپترین ژیانی مـرۆڤ نییـە ؟. ئاخـۆ کـاتێک ژیان تەنیـا بۆ هەڵگرتن بێت و سـاتی لە یادچوونی مـانای هـەبێت

سەرگەردانی نییە؟. لێرەوە دەگەینە ئەوەی ژیانی واقیعی مرۆڤ بەڕاستی ژیانێکی زۆر بێزارکەر و قارسکەرە. هەروەک ئەوەی هەموومان ڕۆژانە دەچینە سەرکار و دێینەوە ماڵەوە. دەخۆین دەنوین دەخۆین و دەنوین. ئاخۆ کەسمان ڕازییە بەو ژیانە. کێمان هەیە بەڕاستی لەدووی ژیانێکی تر نەگەڕێت. لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین دوو زانستی سەرەکی هەن لەم مەیدانەدا بەردەوام مرۆڤ ئاراستەی ژیانی واقیعی دەکەن، کە تاکە ژیانە و دوایەمین ژیانیشە مرۆڤ ئەزموونی دەکات. زانستی پزیشکی جیا لەوەی جەستە دەباتەوە سەر باری ئاسایی خۆی بەردەوامیش هەوڵی هەیە بۆ پاراستنی جەستە و بەستنەوەی چێژی ژیان بەجەستەوە. هەڵبەتە لە پاڵ زانستی پزیشکیدا وەرزش هەیە. ئەم دوو زانستە لەویادا ترسناکن، کە ئیدی مرۆڤ بەوە دەگاتە خۆشبەختی کە جەستەمان خۆش بژیت و خۆش تام بکات. ئەوەی زانستی پزیشکی و وەرزش بەدوایدا دەگەڕێن ئەو یاسا گشتییانەیە کە لەناو کەس و جەستەکاندا وەک یەک هەیە. ژیانی واقیعی مرۆڤیش بە تاکە ژیانی مرۆڤ دەزانن. کە مرۆڤ تەنیا ئەوەی هەیە لە بەردەستە و بەرجەستەیە. ئاشکرایە ژیانی واقیعی لەباری گواستنەوەیدا بۆ یادگە وەک کۆدێک هەڵدەگیرێت. ئەوەشی لەڕێگەی جەستەوە دێتە ناومان هەردەم خۆمان نییە بگرە پڕ دەکرێین بەدەنگ و ڕەنگی ئەوانی تر لە خۆماندا. واتا لێرەدا پرۆسەیەک هەیە کە ئەویش (پرۆسەی پڕبوونە). مرۆڤ لەم قۆناغەدا پڕ دەبێت بە ئایدیۆلۆجیا و بیروباوەڕ و کولتوورەکان. مرۆڤ لێرەشدا هەردەم خۆی نییە و ئەوی ترە و ئاوێتەیە بەئەوی تر. لەویاشدا سەرکەوتووە کە ئەوی تر دووبارە بکاتەوە. جا ئەو دووبارەکردنەوەیە ئاین بێت کولتوور بێت یان هەر شتێکی تر بێت.

هەر لە سەرەتاوە دەبێت ئەوە بزانین کە واقیع پێش ئێمە هەیە و بوونی کەوتووەتە پێش بوونی ئێمەوە. لە واقیعدا شتەکان کۆتایی هاتووە. خواپەرستی کۆتایی هاتووە چۆن بکرێت و چی بکەین. هاوڕێیەتی و ژنهێنان...... تاد تەنانەت چەمکەکانیش بەکۆتا هاتوون چین. مرۆڤ دەبێت لە ڕێگەی جەستەیەوە خۆی چالاک بکات هەتا بتوانێت واقیع کە هەموو کات مردووە لەباری مردووی خۆیەوە. بەپرۆسەی بەکۆدبووندا بڕوات و جارێکی تر هەر لە ڕێگەی جەستەوە مرۆڤ بتوانێت لە خۆیدا بەرجەستەی بکاتەوە. هەتا ببێتە بەشێک لە واقیع. چەند مرۆڤ

توانی ئەو واقیعە بەرجەستە بکاتەوە ئەوەندە پانتایی داگیر دەکات لە واقیعدا و ئەوەندە شوێنی هەیە لە یادگە و زەینی ئەوی تردا.

کاتێک ژیانی واقیعی دەبێتە تاکە ژیان و تاکە شوێنی مرۆڤ ئیدی مرۆڤ بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە چۆن و خێراتر خۆی بخاتە ناو ژیانەوە. هەڵبەت ئەو مانایە وەردەگرێت کە کۆمەڵگە دیاری دەکات. لێرەوە ڕووخان و سەرکەوتنی دەست پێ دەکات. یەکێک دەگاتە ئەوپەڕی دەسەڵات و ئەوپەڕی هەموو لەزەتەکانی جەستەی ئیتر ناتوانێت ئاسوودە بێت. چونکە ئەم سەرکەوتنە لە بنەماوە بۆ ئەوانی ترە و دوورە لەخۆیبوونی مرۆڤ. یاخۆ ڕووخانەکان کاتێک مرۆڤ دەگاتە هیچ. هیچ بەو مانایەی کە هیچ نییە و ئەم نەبوونییەش بە هیچ بوون دانراوە و مرۆڤ تووشی رووخان دەکات. ئێستا با ئەو پرسیارە بکەین ئاخۆ واقیع بەو هەموو ڕاستەقینەیەوە کە هەیە. ئاخۆ کاتێک ژیانی واقیعی بووە ژیانی ئەوپەڕی بالای مرۆڤ. ئاخۆ ئەم ژیانە نابێتە وەهم؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئاسان نییە. ئەمرۆ ژیان خاڵییە لە (بوون) جەستە بووەتە جەوهەری ژیان دەبینیت چۆن هەموو لە هەوڵی ئەوەدان کۆمەڵگە پەسندیان بکات. هەریەکە و سەیری خۆی ناکات چییە؟ بەردەوام سەیری کۆمەڵگە دەکات چی دەوێت؟ لێرەوە وێرانی دەست پێ دەکات. مامۆستا و مەلا و پزیشکی وەهمی دروست دەبن لەم وێرانەیەدا ژیانی وەهمی دروست دەبێت و شتێک هەیە بەردەوام بزرە لەم شتانەدا ئاخۆ ئەو شتە چییە؟

سەرکەوتنەکان وەهمین! ڕووخانەکان وەهمین!... کەسێک کاری نیە یان تووشی هەتیوی دەبێت یانی ژیانێکی ناخۆش دەژین هەموو کات خۆی بە ڕووخاو دەزانێت و تووشی نائومێدی دەبێت. بەڵام دوایی تێ دەگات. ژیانی واقیعی دوای تەواوبوونی ڕاستەوخۆ دەچێتە یادگەوە یادگە شوێنی ژیانی واقیعی مرۆڤە لەباری بیرەوەریی خۆیدا و لەباری بوونە کۆد و وێنەیەک کە هەڵگری زانیارییە لەبارەی ژیانی واقیعی مرۆڤەوە ئیتر ڕووداوەکان جیاوازن. مرۆڤ زۆرترین بەشی ژیانی لەو واقیعەدایە. ئەویش لەبەر بوونی جەستە و بوونی هەموو ئەو کێشانەی مرۆڤ ناچار دەکەن کە هەردەم خافڵ نەبێت لە واقیع. بۆیە زۆر گرینگە کۆمەڵێک خاڵ ڕوون بکەینەوە.

**٢- پرۆسەی پڕبوون:**

لێرەدا دەمانتوانی ناوی پرۆسەی گواستنەوەشی لێ بنێین، بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر لەم بارەیەدا وەک کۆگایەک بەتاڵە و ئامادەیە بۆ وەرگرتنی هەموو جۆرە زانیارییەک کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. کە باسی پڕبوون دەکەین شتێک هەیە توانای ئەوەی هەیە بگوازرێتەوە و بکشێت. ئاخۆ ئەوەی دەگوازرێتەوە چییە؟ ئێمە چۆن دەتوانین شتێک بگوازینەوە؟ گواستنەوە سیفەتی کشانی شتێکە لە خۆیەوە بۆ شوێنێکی تر. جا درێژبوونەوە بێت یان دابڕان و گواستنەوە. دیارە لەم پرۆسەیەدا تەنیا ئەو شتانە هەن، کە توانای کشان و گواستنەوەیان هەیە هەر کشان و گواستنەوەیەکیش دەلالەتە بۆ شتی مادە و بەرجەستە. جا ئەم بەرجەستەبوونە دەست لێدراو یان فامکراو بێت.

لێرەدا ڕووبەڕووی وشەیەک دەبینەوە ئەویش (کولتوورە) ئێمە واز دەهێنین لەوەی ئەم وشەیە چۆن سەری هەڵدا و کێ یەکەم کەس دایهێنا و چۆن گەشەی کرد. ڕاستیی ئەم پرسیارانە پرسیاری ئەکادیمییەکانن. بۆیە کەم تا زۆر خۆمان نادەین لەم بارە. چونکە ئەم کارانە ئامادە کردنن. ئامادەکردنیش کۆششێکی ڕۆحی و فیکری نییە. ئەوەندەی جەستەییە. ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ یەکەمین جار مامەڵە بکەین لەگەڵ چەمکەکاندا و لەناو عەقڵی خۆماندا بەشوێن ماناکەیدا بگەڕێین. بەخاتری ئەوەی بیر بکەینەوە. دیارە (کولتوور) یەکێکە لەو شتانەی توانای کشان و گواستنەوەی هەیە. شتێکە بێ تێگەیشتن دەتوانین ئەزبەری بکەین و لە خۆماندا بەرجەستەی بکەینەوە.

کولتوور دەتوانین بڵێین هەموو ئەو ئاداب و داوونەریتانەن. کە کۆمەڵگە لەسەری ڕێک کەوتوون. ئەمەش لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر جیاوازە. واتە جۆری ڕێککەوتنەکان جیاوازن. خودی ئەم ڕێککەوتنە بڕینەوە و بەکۆتاهاتن و کۆنکریتکردنی شتەکانە. کولتوور بەوەی توانای کشانی هەیە هەموو کات وەک جەستەیەک هەیە. جەستە بەو مانایەی کە شتێکە دەرکەوتووە. بۆ نموونە چاکە لە کۆمەڵگەدا جەستەی هەیە. واتە چۆنایەتیی دیاری کراوە. ئەم چۆنایەتییە جەستەی ئەو شتەیە و جەوهەری ئەو شتەشە لە کۆمەڵگەدا کە شتەکان بوونە چۆنایەتی ئەوا دواتر دەتوانین بەلاساییکردنەوە ئەم شتە بگوازینەوە ناو خۆمان و ئێمەش

بیدەینەوە کەسانی تر. ئەمڕۆ هێزی گەورە گەورە هەن لە دنیادا دەیانەوێ شتەکان بکەنە (کولتوور) واتە بەرەو ئەوەیان ببەن، کە کۆنکرێت بکرێت و بیانکەنە شتێکی بەرجەستەکراو و کۆنترۆڵکراو.

تووڕەبوونی هایدگەر لە ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئەوە بوو ئەکادیمیایان دانا کە بەڕێگەی فێربوون فەلسەفە بخوێنرێت. لەو شوێنەدا کە فەلسەفە دەکرێت بەزانست ئەفلاتوون و ئەرستۆ دەچنە دەرەوەی ئەم شتە. ئیتر فەلسەفە هەردەم مردووە واتە دەیانمرێنێت هەتا ببنە شتێکی بەرجەستە و کار لەسەرکراو. لەم بارەیەدا مرۆڤ هەموو کات ڕابردوو دەنووسێتەوە و ڕابردوو ئەزموون دەکات. کولتوور بۆ خۆی ڕابردووی ڕابردووەکانە. شتێکە دەبێت بێ تێگەیشتن ئێمە ملکەچی بین. ئەم هەوڵە لای (دی سۆسۆر) زۆر بەڕوونی دیارە کە زمانی کۆنترۆڵ کردووە و لە ئاستە فیزیکییەکەیدا مامەڵەی کرد لەگەڵ زماندا و کۆمەڵگەی کردە دایکی زمان. لێرەدا زمان وەک ئایدۆلۆجیایەک دەرکەوت. کە سیفەتی مادەی وەرگرت و توانای کشانی هەیە و توانای ئەوەی هەیە بەڕێگەی هەوڵ و ماندووبوون بیگوازینەوە. پرۆسەی پڕبوون پرۆسەی کشان و گواستنەوەیە. ئەوانەش توانای کشان و گواستنەوەیان هەیە شتی مادین.

تەنانەت فەلسەفەش کە ئەکادیمیا قۆرغی کردووە مرێنراوە و کراوەتە زانست. لە جیاتیی فیکر مێژوو بەرهەم دەهێنرێت. سرووتی دینی و بیروباوەڕەکان بەوەی کراونەتە جەوهەری دین و نەگۆڕ کراون. شتێکی بەرجەستە و حازرن و لە ڕێگەی یادگەی مرۆڤەوە هەڵدەگیرێن و دەستاودەست دەکەن. ئەم پرۆسەیەش لە منداڵیی مرۆڤەوە دەست پێ دەکات. ئەمەش شتێکی ئاساییە واتە هەموومان مەحکومین بەم پرۆسەیە بڕۆین. مادام ئێمە لە کۆمەڵگەداین ناتوانین خۆمان بپارێزین لەوەی کۆمەڵگە بەخۆی و یاسا و نەریتەکانیەوە نەیەتە ناومانەوە. کۆمەڵگە سەرەتا داگیرمان دەکات و یادگەمان پڕ دەکات لە خۆی بەڵام مرۆڤ هاوڕا لەگەڵ (دیکارت) دەبێت ڕۆژێک ئازایەتیی ئەوە بکات هەرچی لە دەرەوە وەری گرتووە بیکاتە دەرەوەی خۆی و ئەمجارە لەناو عەقڵی خۆیدا شتەکان بدۆزێتەوە و هەست پێ بکات. کە ئەوەش بەبیرکردنەوە دێتە ئاراوە. دیارە ژیانی مرۆڤ وا بڕیاری لەسەر دراوە سەرەتا بەناو ئەوی تردا بڕوات و ئەو دووبارە بکاتەوە. دواتر گەر ویستی خۆی بدۆزێتەوە و لە ئەوی تر جیا ببێتەوە و خۆ بنوێنێت.

٣- بەرەو ئەو چوون:

دیارە لە دوای پرۆسەی پڕبوون مرۆڤ پڕ دەکرێت بەهەموو ئەو شتانەی کە وەک زانیاری لە ڕێگەی جەستەی بایەلۆجییەوە دێنە ناوی هەمووی لە یادگەدا شوێنی خۆیان دەگرن. واتە یادگە قەرەباڵغ دەبێت بەهەموو زانیارییەکانی واقیع. جا ئەمەش دەکەوێتە سەر ژینگەی ئەو کەسەی تێدا دەژیت بە واتای ئەوەی دەوروبەر کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر پڕکردنی یادگە. ئیدی ئەم دەوروبەرە بە هەموو ناشیرنی و جوانیی خۆیەوە دێتە ناو یادگەی مرۆڤەوە. ئەوەش هەمووی بەڕێگەی جەستەی بایەلۆجی ئەنجام دەدرێت. کە بە پرۆسەی بەکۆدبووندا دەڕوات و وەک یەکەیەکی زانیاری دەمێنێتەوە. دیارە ئەم زانیارییانە بەوە دەبنە (ئەوی تر)[١٩] چونکە لە دەرەوەی مرۆڤ دێن و یادگەی پڕ دەکەن. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەوانی ترن لەناو مرۆڤدا. بەئاگا لەوەی مرۆڤ هەرگاڤ خاوەنی لایەنگیرییە. ئەمەش سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ کاریگەرە لەوەی کە یەکێک لەم ئەوی تریانە سەر بخات و تەواوی یادگە بگرێتەوە و ئەوانەی ماونەتەوە بخاتە حاڵەتی وەستان و پووکانەوە. ئێمە گوتمان تەبیعەت کاریگەری هەیە لەوەی مرۆڤ بەرەو کام لە ئەوی تر بڕوات لەم قۆناغەدا. مرۆڤەکان جیاوازن هەیانە دیندارە هەیە کاسبە هەیە خەریکی تاوان و کوشتنە. هەیە نووسەر و.... تاد. واتە هەر یەک لە ئێمە یەک ئەوی تر هەیە لەناو خۆماندا کە هۆگری ببین و هەوڵی ئەوە بدەین بەرجەستەی بکەینەوە لە خۆماندا لەو قۆناغەدا. هەروەها ژینگەی دەوروبەریش کاریگەرە لەسەر مرۆڤ کە کام ئەوی تر بکاتە ئایدیالی خۆی. کاتێک مرۆڤ (ئاین) وەک ئەوی ترێک هەڵدەبژێرێت بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدات ئەم ئاینە دووبارە بکاتەوە. لێرەدا سەرەتا پرۆسەیەک هەیە ئەویش پرۆسەی بەحیکایەتکردنی شتەکانە. واتە سەرەتا ئەو ئاینە لە فۆرمی حیکایەتێکدا بەرجەستە دەکرێت هەتا مرۆڤ بتوانێت بەدووبارەکردنەوە لە یادگەیدا جێگری بکات و ببێتە پاڵەوانی ئەو حیکایەتە. بەڵام پاڵەوانێکی مردوو. چونکە پاڵەوانی ناو حیکایەت هەردەم مردووە کاتێک دێتە ناو یادگەمانەوە.

کەسەکە دەکەوێتە ناو حاڵەتی دووبارەکردنەوەی ئەم حیکایەتە واتە لێرەدا بەرەو ئەوە دەڕوات و هەوڵی ئەوەیەتی وەک پاڵەوانەکانی ناو ئەو حیکایەتە هەڵسوکەوت بکات و قسە بکات. بەوەش حاڵەتی دۆنکیشۆتی دووبارە دەکاتەوە. هەروەها

حاڵەتی سەرسامبوون هەیە. دۆنکیشۆت حاڵەتی سەرسامبوونی خۆی بوو بەپاڵەوانی ناو حیکایەتەکان. بۆیە هەردەم هەوڵی ئەوەی دەدا ئەوان لە خۆیدا دووبارە بکاتەوە. دیارە ئەم حاڵەتە لەناو ئێمەدا هەن کچان بەردەوام هەوڵی بەخۆکردنی ئەو ئەوی ترەن کە سەرسامی دەبن. تەنانەت خەڵکانی ئێمە لە کۆمەڵگەدا تەمسیلی یەک دەکەن و ئەوی ترن لە خۆیاندا. واتە لەناو یەکتریدا ون بوون. بۆیە کاتێک دەکەوینە ناو پێوەندی لەگەڵ یەک تاکەکەسدا سەیر دەکەیت کەوتووینەتە ناو پێوەندییەوە لەگەڵ تەواوی کۆمەڵگەدا. لەکاتی ئەم مامەڵەکردنەدا هەموو ئەو هێزە ئاینی و کولتووری و دابونەریتانەی هەیە، لە ڕێگەی جەستەی ئەم کەسەوە مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن. ئەم حاڵەتەش حاڵەتی ژیانە لەناو رابردوو و داهاتوودا. واتە کەسەکە خافڵە لە بوونی خۆی و بەئاگایە لە ئەوی تر.

کاتێک باسی ئاینی لەگەڵ بکەیت ئەو نایەت بەعەقڵی خۆی قسە بکات بگرە بە ئایدۆلۆجیاکانی دێت شەڕ و هاوڕێیەتیت لەگەڵ ئەنجام دەدات. لە پاڵ ئەمەشدا هەردەم ترسی هەیە لە دەرکردنی ئەوی تر لەناو خۆیدا. ئەمەش سیحری ئەوی ترە لە مرۆڤەکان. وا دەزانێت بەمردن و ڕۆشتنی ئەوی تر لەناویدا خۆی دەمرێت و مانای نامێنێت. هەر بۆیە لەو کاتەدا هەموو قوربانییەک دەدات لە پێناو پاراستنی ئەو ئایدلۆجییەدا کە نازانێ بۆ چی و بۆ کێ قوربانی دەدات. بەڕاستی فەلسەفە لەوێدا بۆ ئێمە گرینگە ناهێڵێت هیچ شتێک تەشەنە بکاتە ناومان بەبێ پرسیارکردن و گومانکردن. فەلسەفە لە سادەترین شتەوە ڕێگرە لەوەی ئەوی تر بەرجەستە بکەینەوە لە خۆماندا. فەلسەفە زەوینە خۆشکردنە بۆ ئەوەی بوونی خۆمان دەرکەوێت و پێ بگەین و خۆمان دابڕێژین و ئەوی تر دووبارە نەکەینەوە. ئەوەی کێشەی فەلسەفەیە لەگەڵ شتەکاندا ئەوەیە دزە نەکەنە ناومان و داگیرمان نەکەن. کێشەی هایدگەر لەگەڵ تەکنەلۆجیادا ڕەفزی تەکنەلۆجیا نەبوو. بەڵکو ڕەفزی ئەو مرۆڤە بوو کە تەسلیم بوو بە خەونەکانی تەکنەلۆجیا. تەکنەلۆجیا زەوینەی سازکردنی جەستەی مرۆڤ بوو کەت وانی خۆی بەتاڵ بکاتەوە یان بەتاڵ بێتەوە لەو زەوینەدا و هیچ زەوینەیەکی نییە کە مرۆڤ ڕۆحی خۆی تێدا ببینێتەوە. فەلسەفە ئەو گرێنتییەی هەیە کە هەرگاف مرۆڤ بەشوێن ئەوەوە بێت چی لە بوونی خۆیایەتی دەرەکی بکاتەوە. فەلسەفە فێرمان دەکات چۆن بەرەو ئەو بوونە برۆین هەتا بگەینە مەعریفەی ڕاست و دروست و بەختەوەریی ڕاستەقینە. چونکە

خەمی زانین هەر خەمی فەلسەفە نییە بەڵکو خەمی جەوهەری مرۆڤیشە. ئەوی تر کە دێتە ناومانەوە بەبێ پرسیارکردن هەرگاڤ خەتەری هەیە بۆ سەرمان. گەر سەیری کۆمەڵگەی خۆمان بکەین ئەوی تر دەناسینەوە لەناوماندا کاتێک دەمانەوێت ئێمە پرۆسەی هاوسەرکاری ئەنجام بدەین ئەوی تر لەناوماندا قسەی هەیە بریاری هەیە کێ هەڵبژێرین و چی بکەین. ئەم بەرەو ئەو چوونە سەرەتای ونبوونی مرۆڤە لە خۆی. مرۆڤ نازانێت ئەو کێیە و چییە؟

فەلسەفە وەک دەقیقترین زانست. لە بەردەم ئەوی تردا وەک رێسایەکی بالآبوونی هەیە. یان ئەوەتا ئەوی تر کە نیازی بەوە هەیە ببێتە منی ئێمە دەردەکات لەناوماندا. یان ئەم ئەوی ترە دەردەکەوێت بەوەی دۆستە بۆمان، فەلسەفە قانوونەکانی ئەوی ترمان بۆ رۆشەن دەکاتەوە. پاشان وەعیمان دەکات بەوەی چۆن من و ئەو لەناو یەکتردا هەبین و نەشبینە منی یەکتری و ئەو هارمۆنیەتە بدۆزینەوە کە من من و ئەو ئەوە. (لایبێنتز) لە باسی مۆنادەکاندا ئەوە روون دەکاتەوە کە مۆنادەکان لە پاڵ یەکتردا نەک هەریەک رەش ناکەنەوە. بگرە زەوینەی ئاشکراکردنی یەکترن. دەبنە میوانی یەکتر بەبێ ئەوەی هیچ لێدەرچوونێک هەبێت لە یەکترەوە بۆ یەکتری. فەلسەفە ئەم زانینە وەک هۆشیاری دەداتە ئێمە. ئەمرۆ هەوڵی زۆر هەن بۆ هێنانی فەلسەفە بۆ ناومان بەلآم نەزۆکن چونکە خۆیان فەلسەفەیان وەک حیکایەت وەرگرتووە و فەیلەسووفەکان وەک ئایدیال لە یادگەیاندا هەیە و هەوڵی بەرجەستەکردنەوەیان دەدەن. بۆیە هەرچی بکەن ناتوانن گوزارشت لە فەلسەفە بکەن. فەلسەفە لە یەکێکدا بەرجەستە نابێت خۆی نەبێت. فەلسەفە لە دەرەوەی مرۆڤ نییە لە زانکۆ و پەرتووکەکاندا نییە. بگرە لەناو خۆماندایە دەبێت بیدۆزینەوە.

**٤- ئەونوێنی:**

لە دوای بەرەو ئەوچوون، بوونی مرۆڤ کە جەوهەری خۆیەتی و بوونی رەسەنیەتیی تەواو لەم بەرەو ئەوچوونەدا و بێ ئاگایی مرۆڤ لە خۆی و ئاگایی بە ئەوی تر منی ئەم مرۆڤە وەک یەکەیەکی چالاک دەمێنێتەوە، بەلآم مرۆڤەکە دەکەوێتە حاڵەتی ونبوونی خۆیی و دەرکەوتنی ئەوی تر لەناویدا. بەم چەشنە منێکی تر دەبێتە منی ئەو کە منی خۆی نییە و لە دەرەوەی خۆی هاتووە. جەستەی

ئەم مرۆڤە لێرەدا کەسێکی غەریب هەڵدەگرێت. ئەم کەسە غەریبە دەبێتە ڕوحێکی وەهمی و بەردەوام ئەم جەستەیە ئاراستە دەکات چۆن بێت و چی بکات و چی نەکات. ئەوەی کە زۆر خەتەرە بۆ مرۆڤ ئەم ونبوونەیە کە تەواو دەتوێتەوە لەناو دەوروبەرەکەیدا. بەردەوام هەموو ژیانی دەبێتە ئەوەی چۆن پلەی کۆمەڵایەتیی خۆی بپارێزێت و بەرگری لە ئەو بکات. دیارە ئێمە وا باسی کۆمەڵگە دەکەین کە دەرەوەی مرۆڤە جا ئەم کۆمەڵگەیە باش بێت یان خراپ. لە هەردوو بارەکەدا مرۆڤ پڕ دەبێت بە ئەوی تر. شتەکان لە ڕێگەی عەقڵی خۆیەوە نایەتە ناوییەوە بەڵکو لە ڕێگەی عەقڵی ئەوی ترەوە دەگاتە ئەم. لێرەدا (بوون)ی مرۆڤ بەوەی هەموو تواناکانی مرۆڤە ئەو یەکە پڕ لە زانینەی مرۆڤە کە وەک هێزێکی ئاراستەکەر مرۆڤ ئاراستە دەکات و لە گەشەکردن دەوەستێت.

بەڵام لەوێدا کە مرۆڤەکە دەکەوێتە نێوان بوونی خۆی و ئەوی ترەوە جا یان ئەوەتا مرۆڤ ئەوە هەڵدەبژێرێت لەژێر ئاراستەی بوونی خۆیدا بێت یاخۆ ئەوەتا دەچێتە ژێر باری ئەوی ترەوە. بەڵام بەهەردوو بارەکەدا (بوون) هەردەم هەیە وەک جەوهەری مرۆڤ. بەڵام کە خافڵبوون هەبێت ئیتر مرۆڤ بانگی بوون نابیستێت و وەک دەنگێکی دوور و وەهمی دێتە گوێی. وەک ئەوەی خەیاڵات و دابڕان لە واقیع و شێتبوون بێت ئەوها بۆ کەسەکە دەردەکەوێت. جا ڕاستی خافڵبوون لە بوون، خافڵبوونی مرۆڤە لە خۆی چونکە ئەوەی وەک توانا هەیە بۆ مرۆڤ لە بوونی خۆیایەتی نەک لە دەرەوەی خۆی. ڕاستیی پەیامی ڕاستەقینەی فەیلەسووفەکان ئەوەیە مرۆڤ ئەوە قبووڵ بکات بوونی ئاراستەی بکات و ئەم هێزە ناوەکییە بەرجەستە بکات. فەیلەسووفەکان ئەوانە بوون کە خافڵ نەبوون لە بوونی خۆیان بۆیە هەردەم دانابوون بە خۆیان و بە ئەوی تریش. بەڵام ئەم داناییەی مرۆڤ و وەعیبوونەی بە بوون خافڵبوون و دابڕان نییە لە واقیع. بگرە مرۆڤ دەچێتە سەروو واقیع و ئەودیو واقیع دەبینێت. واتە هەموو ئەو هێڵ و سیاسەتانە دەبینێ کە واقیع لەژێرەوەڕا پەیڕەویان دەکات ئەو یاری و یاسانانە درک دەکات کە مرۆڤەکان دەکەونە ناو مامەڵەوە لەگەڵ یەک و لەگەڵ دەوروبەرەکانیدا. ئەوەی فەیلەسووفەکانی دوور خستووەتەوە لە واقیع. ئەو بنەما بێ مانایانەی کۆمەڵگەیە کە مرۆڤ فاسید دەکات. فەیلەسووف هەردەم لە دەرەوەی یاری و دەرەوەی وەهمەکانی کۆمەڵگەیە. بەڵام با ئەوە بپرسین ئاخۆ مرۆڤ کاتێک دەکەوێتە بەر

ڕێنوێنیی ئەم بوونە. ئاخۆ واقیع ئەو زەوینەیە بۆ بەدیهاتنی بوون؟ دیارە گەر سەیری کۆمەڵگەکان بکەین دەبینیت هەموو شتەکان کۆنکرێت کراون. هەموو شتەکان ڕێڕەوی خۆیان بۆ دیاری کراوە چۆن بن و چین. لە واقیعەوە تێ دەگەین ئەوەی کۆمەڵگەکانی لەسەر بنیات نراوە ڕاستیی بوون نییە. بگرە دەروونی مرۆڤەکانە دەرکەوتی کردووە و ئەم واقیعەی دارشتووە. چونکە مرۆڤ بەردەوام وەک مەیل مەیلی بەوەدایە. شتەکان هی خۆی بن و خۆپەسندی زاڵە بەسەر مرۆڤدا. هەر ئەمەشە ئەو ژیانەی وا بێ مانا کردووە کە خۆشی و ناخۆشییەکان وەهمی بن. ئەم تۆڕە ئاڵۆزە کەوا هەزاران ساڵە بەرگ بۆ خۆی دروست دەکات و دنیا داگیر دەکات زۆر کەم پانتاییی جێ هێشتووە بۆ بوونی مرۆڤەکان کە واقیعی بینەوە. واتە زۆر زەحمەتە واقیع (بوون) قبووڵ بکات. بەدبەختی مرۆڤی بیرکەرەوە لێرەوە دەست پێ دەکات کە ئایدیایەک هەیە لەناویدا و شوێن نییە داینێت. واتە واقیع وەک زەوینە زۆر بەئەستەم دەبێتە زەوینەی هاتنەدەری ئەم بوونە. بەڵام فەیلەسووفەکان وەنەبێ ئەمەیان بەرجەستە نەکردبێت... نەخێر! زۆربەی فەیلەسووفەکان لە زماندا ئەم بوونەیان داناوە. هەروەها کاتێکیش ڕووبەڕووی واقیع بوونەتەوە ئەو کاتەش بوون لەناویاندا دەرکەوتووە. ڕەنگە سوکرات یەکێک بێت لەو فەیلەسووفانەی ژیانی واقیعی فەلسەفەکەی بووە. تەنانەت مەرگ هەڵبژاردنی سوکرات و ڕانەکردنی لە زیندان هەموو بەویستی بوون بووە. مردنی زۆر پێ شیاوتر بووە لە ژیانێک کە لەویترەوە بە مرۆڤ دەبەخشرێت. لە ڕاستیدا لەباری بەئەوی تربوونی مندا. کەسەکە دنیایەکی تەواوبوو لە یادگەیدا هەیە. حیکایەتێک هەیە کە پاڵەوان و دەورەکانی حازرە و مرۆڤ هەوڵی ئەوەیەتی ئەم حیکایەتە بەرجەستە بکاتەوە. ئەمەش خۆی لە کولتووردا دەبینێتەوە. جا ئەم کولتوورە وەک هێزێکی حیکایەت خوڵقێن شتەکان دەکاتە حیکایەت و دەیداتە مرۆڤەکان. ئاین و فەلسەفە و ڕۆشنبیری و سیاسەت و...... تاد، بێت.

هەموو کایەکان حیکایەتیان هەیە لەناو کولتووردا. ئەم حیکایەتانە لە سەردەمێکدا ڕوویان داوە کولتوور جارێکی تر دەیانکاتەوە بەتیۆری و دەیانکاتەوە بە ئایدیاڵ و لە ڕێگەیەوە بەردەوامی دەدات بەم حیکایەتانە مرۆڤ لەم بارەدا. یان ئەوەتا ڕازی نییە بەم واقیعە و بەڵام ناچارە ملی بۆ کەچ بکات. یان ئەوەتا یاخی دەبێت و خۆی و شتەکان دەکوژێت لە شەڕە سەرسەختەکانیدا. بەڵام مرۆڤی

ڕاستەقینە حیکایەت بەرجەستە ناکاتەوە و شەڕیش ناکات بەبێ تێگەیشتن. بگرە خۆی دەداتە دەست بوونی خۆی و هەست دەکات واقیعێکی تر هەیە وەهم نییە. ئەو کاتە بەردەوام ئەم واقیعە لەناویدا دێتە دەر و وەک هەقیقەت دەردەکەوێت. لێرەدا کەسەکە ئەو نانوێنێت بگرە خۆنوێن دەبێت و ئەوەی لە ئەو دەردەکەوێت خۆیەتی. بەم مانایە ئەم کەسە (من)ی خۆی (من)یەتی نەک (من)ی ئەو. هەر بۆیە بەهەقیقی دەژێت. بەدەر لەمە. مرۆڤ نەک هەر ئاگادار نییە بەخۆی و بەواقیع بگرە هەردەم لە خافڵەتی بووندایە و وەک بابەت هەیە بۆ ئەوی تر و واقیعەکە و هەرگاڤ لە ڕابردوودا دەژیت.

واتە لە ئێستاییی خۆیدا نییە. لە ئێستادابوون[٢٠] واتە لە (بوون)دا بوون. ئەو کاتەی مرۆڤ لەناو بوونی خۆیدایە ئەوکات یانی هەنووکەیی بوون. چەمکی (ئێستا) چەمکێکی زەمەنی و واقیعی نییە. بگرە چەمکێکی قووڵتر و ناوەکییە کە دەلالەتە بۆ حاڵەتی ئامادەگیی مرۆڤ لە بووندا. هایدگەر بە (دازاین) وەسفی کردووە.

**٥- ژیانی واقیعی:**

دەتوانین بڵێین ژیانی واقیعی ئەو چرکەساتەیە کە مرۆڤ ئامادەگیی هەیە لە واقیعدا کە دەوروبەرەیەکەیەتی. واتە خەیاڵی وابەستەیە بەو شتانەی لە بەردەمی ئەو ڕوو دەدات. چونکە زۆرجار ئێمە لەناو پاسێکداین و قسە دەکرێت و گوێشمان لە هیچ نییە. چونکە لەناو پاسەکەدا وەک جەستە حزوورمان هەیە بەڵام وەک خەیاڵ لەلایەکی ترین و کەوتووینەتە ناو ژیانی خەیاڵییەوە.

لێرەدا ئەم کەسە ژیانی واقیعی ئەزموون ناکات و بگرە ژیانێکی تر ئەزموون دەکات. بۆیە ژیانی واقیعی ئەو حزوور پەیداکردنەی مرۆڤە لەناو دەوروبەرەکەیدا. لێرەدا ڕووبەڕووی چەمکێک دەبینەوە ئەویش (ئێستا)یە. کە فۆکۆ گوزارشتی لێ دەکات. با بپرسین ئاخۆ ئەم حزوور پەیداکردنە لە واقیعدا و لەو دەوروربەرەدا کەسەکە دەخاتە ئێستای خۆیەوە ؟ ئاخۆ ئەم حزوورە مەرجە بۆ ئەوەی کەسەکە نەکەوێتە ناو ڕابردووەوە؟ ئاخۆ ئەم ساتە ئاگایییە بەژینگەی دەوروبەر ساتی ڕاستەقینەی مرۆڤە؟ لە ڕاستیدا ئەو بارانەی ئێمە جیاوازن کە تێیدا دەکەوینە ناو دەوروبەرەوە. دەکرێت ئێمە لە واقیعدا بین و تەواو حزووریشمان هەبێت بەڵام لە

ئێستادا نەبین!

وەک ئەوەی ئێمە لە بازاڕ بین و خەریکی مامەڵەکردن بین بمانەوێت هەرچۆنێک بێت بەرامبەرەکە ڕازی بکەین. لەم بارەدا دەکەوینە ناو ئاگاییەکەی تەواوەوە کە بوار نەدەینە بەرامبەرەکەمان کە فرۆشیارە ئامانجەکەی سەر بگرێت و ئامانجی خۆمان بەسەر بخەین. بەڵام ئەم وەعییە ساختەیە چونکە هەر لە سەرەتاوە ئێمە مەبەستێکمان هەیە و بەردەوام ئەو مەبەستە دەکەینە خاڵی دەستپێکردنی گفتوگۆ. بەمەش زۆر شت هەیە بزر دەبێت و ئەم کەسە بەم حزوورپەیداکردنەش ناکەوێتە ئێستای خۆیەوە. ئەم حاڵەتە حاڵەتی خۆپاراستن نییە لە ڕابردوو. کەسەکە بەرامبەرەکەی دەخاتە ژێر پلانەکانی خۆیەوە. بەدیوێکی تردا گەر ئێمە کەسە فێڵ لێکراوەکە بین. لەو حاڵەتەدا فریو دەخۆین بە واقیعی قسە و هەڵوێستەکانی ئەو کەسە و غایب دەبین لە مەبەستی کەسەکە کە دیار نییە و واقیعی نابێتەوە لە قسەکردن و ڕەفتاریدا . بەوەی ئێمە مامەڵە لەگەڵ واقیعیەکە دەکەین و حزوورمان دەبێت لەناو قسەکانیدا دەکەوینە ناو ئەوەوە و فێڵمان لێ دەکرێت و وەعیمان سەرخۆش دەکرێت بەو واقیعەی کە هەیە. کەواتە بە هەردوو بارەکەدا مرۆڤ لە واقیعدایە و بەڵام ئەم واقیعیبوونەی گەرەنتی ئەوەی ناداتێ کە لە ئێستادا بێت. ژیان لە واقیعدا بە بارێکی تردا خودی ژیانە لە ڕابردوودا . چونکە واقیع پێش ئێمە هەیە و شتەکان ڕێک خراون و براونەتەوە. کاتێک ئێمە دەکەوینە ناویەوە دەکەوینە ناو ئەوی ترەوە. تەنانەت ئەوانەی کە لە ڕابردوودا دەژین ئەوانەن کە بەواقیعەوە سەرقاڵن. چونکە واقیع لەگەڵ ئەوەی کە هەبووە بەردەوام خۆشی تازە دەکاتەوە و یارییەکان دەگۆڕێت. ئەم وابەستبوونە وابەستەبوونە بە یارییەکەوە کە بەردەوام داوای خۆگۆڕین دەکات. تا مرۆڤ بتوانێت لەگەڵ گۆڕانەکاندا بڕوات و لە بیر نەچێتەوە ئەم ڕەوشە بەتەنیا لە کایەی ژیانی ئاساییدا نییە، بگرە چووەتە ناو فیکریشەوە. کە ڕۆشنبیران دەبێت وریا بن. کەچی لە واقیعدا دەگوزەرێت هەتا خۆیان تەسلیم بکەن لە پێناوی مانەوە و پاراستنی مانای خۆیاندا .

یاخۆ دەبێت بە حەز و میزاجی خوێنەر بڕۆنە ڕێوە. خوێنەر دەبێتە سەروەریان و بیریان پێ دەکاتەوە. بەڵام حاڵەتێکی تری ڕۆشنبیر هەیە کاتێک ڕووداوەکان ڕاڤە دەکات بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەوەی واقیعەکەی پێ ڕاڤە دەکات چییە؟ واتە بەچی ئەم واقیعە دەخوێنێتەوە بەچی ڕەفزی دەکات و پەسندی دەکات ؟ ئاخۆ

واقیعێکی تری هێناوە و ئەم واقیعەی پێ ڕاڤە دەکات ؟ بۆیە دەبێت بۆ دیاردەکان ئێــمــە نابێت پەلە بکەین بگرە دەبێت تەواو بیــر بکەینەوە و بەلاڕێدا نەڕۆین و نەکەوینە ناو (ڕا) دانەوە. وەلێ ئەگەرچی ڕۆشنبیریی کوردی وەک کۆگای (ڕا) وایە لێکۆڵینەوەی ورد و تیۆری و پوختمان زۆر کەمە کە خاڵی بێت لە شەڕ و خاڵی لە کۆکردنەوەی ڕا. دیارە هەوڵی تۆکمە هەیە لای (مەسعود محەمەد)[٢١] و (ناسری سوبحانی)[٢٢] بەلام بەشێوازێکی کامل شێوەگیر نەبوون و وەک پرۆژەیەک دەرنەوکەوتوون و بە کاملی تەواو نەبوون. بۆ واقیع ئەوەندە هەیە کە واقیع هەڵگری دەیان دەنگ و ڕەنگ و کولتوور و ڕەمزە، کە پێش ئێمە هەیە و ئێمە دەکەوینە ناویەوە. ئەو لەحزەش کە دەکەوینە ناویەوە لەحزەی ئەوەیە پێی بوترێت ژیانی واقیعی. واقیع لەگەڵ ئەوەی بەگشتی هەڵگری بەشێکی زۆری ڕابردووە بەلام چەند جۆرێکی هەیە کە لێرەدا هەوڵ دەدەین کەم تا زۆر گشتییانە بیاندۆزینەوە و باسیان بکەین.

(١-٥) واقیعی ڕازیکەر:

ئێمە کە باسی واقیع دەکەین و جۆرەکانی بۆ دیاری دەکەین هەمووی لەسەر ئەو بنەمایەیە کە ڕاستی واقیع هەرچی بێت دەرکەوتەی بیرکردنەوەی مرۆڤە. واتە مرۆڤە وا دەکات کە واقیعێک شێوازێک وەربگرێت و جیاواز بێت لە واقیعێکی تر. دەبایە ئێمە باسی جیاوازیی مرۆڤمان کردبا بەلام لەبەرئەوەی باسەکەمان لەسەر واقیعە. ئەوا بەڕێنوێنیی بنەماکە دەرکەوتەکان باس دەکەین. واقیع بۆ خۆی ئەوەیە کە دەرکەوتەی بیرکردنەوەی مرۆڤە. ئەو کاتەی ئێمە دەکەوینە ناو واقیعێکەوە دەکەوینە ناو بیرکردنەوەی مرۆڤێکەوە کە بەپێی تەبیعەت و سروشتی خۆی ئەو واقیعەی خوڵقاندووە. بۆیە ئێمە کە دەکەوینە ناوی لە بەردەم پرۆسەیەکی گەورەداین یان ئەوەتا قبوولی دەکەین یان ئەوەتا بەشوێن واقیعێکی تردا دەگەڕێین. واقیعی ڕازیکەر ئەو واقیعەیە کە مرۆڤ بێدەنگ دەکات و جۆرێک لە ژیانی دەداتێ کە ڕازی بێت و مرۆڤەکەش بەبێ کێشە و هەرا ڕازی دەبێت بەو واقیعە. لەم جۆرە ژیانەدا مرۆڤ تایبەت دەبێتەوە بۆ فەراهەمکردنی ئارەزووە جەستەیی و دەروونییەکانی. چونکە تێرکردنی ئەم دوو بەشەی مرۆڤ پێویستی بەواقیعی وەها هەیە کە ڕازییان بکات. ئەو مرۆڤانە قبوولی ئەم جۆرە واقیعە

دەکەن کە بەڕاستی زۆر جەستەیی و دەروونین.

ئەم واقیـعـەش هەر لە منداڵیـیـەوە وەک پرۆسـەیەک دەخـرێتـە بەردەم مـرۆڤ و خـەونی بۆ دروست دەکرێت. خـەونەکـەش هـەر هـی واقیـعـەکـە خـۆیەتی کـە کەسـەکـە وەک وەهمێک بەهەندێ قوربانیدا دەڕوات و دەگاتە خەونەکانی واقیعەکە. ئەوروپا بەردەوام وەک واقیعێکی ڕازیکەر جەستە و دەروونی کەسەکە ڕازی دەکات و خەون دروست دەکـات. کـە مـرۆڤ بەبێ ئەوەی بیـر بکاتەوە هەمـوو شـتـێکی بۆ فـەراهەم کـراوە. بەتـەنیـا ئەوەندە گـرینگە چـۆن بەکـاری دەهێنێت ئیـتـر دروسـتـکردن و ئامادەکردنی لەسەر شانی واقیعەکەیە. بەمەش واقیعەکە مرۆڤەکان دەکاتە کۆیلەی خۆی. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا مـرۆڤانێک هەن کۆیلەیەتیی ئەم واقـیـعە قـبـووڵ ناکەن و پشت دەکەنە حەزە جـەسـتـەیی و دەروونییەکـان و بەرەو بوون و واقـیعیـەتی خـۆیان دەڕۆن. لە ڕاسـتـیدا گـەر خـۆی خـافڵ نەکات لـە خـۆی ئەوا هـەردەم ڕازی نییـە بەم واقیـعـە ڕازیکەرە. واتە مـرۆڤی بیـرکـەرەوە مـەحکومـە بەئاوارەبوون چونکە واقیع ڕابردووە و دەرکـــەوتـەی ژیانـی ئەوی تـرە و کـــاتێک دەکـــەوێتـــە نـاویەوە هــەست بەغەریبی دەکات. چونکە بوونی نەهـاتووەتە ناوی و خۆی بەغەریب دەزانێت. بوونی مرۆڤ بەشوێن زەوینەیەکدا دەگەڕێن کە خۆی خوڵقێنەر و خۆشی تیایدا بژیت.

ئەمـەش بە ئیـرادەی مـرۆڤ فـەراهەم دەبێت، کـە گـوێ لـە بوونی بگرێت نەک لە داواکاری جەستە و دەروونی ئەگەر سەیری کۆمەڵگەکانی وەک سوودان و ئەفریقیا و ئەسـیـوبیـا و ئەریتریا..... تـاد بکەین. کە هـێـشـتـا نەگـەیشـتـوونەتە تێرکـردنی جەستە و دەروونیان بیرکردنـەوەی تیا لەدایک نابێت. چونکە شتێک کراوەتە خەمی جەوهەری کە خەونی جەوهەری نییە لە بنەڕەتدا. چونکە بە ئارامبوونەوەی جەستە و دەروون ناگەینە ئەوەی بگیرسێینەوە و لە ماڵی خۆمان لەگەڵ بوونی خۆماندا بین و ئاوارە نەبین.

کـۆمـەڵگەی کـوردی دەتوانم بڵـێم کـۆمـەڵگەیەکـە تا ڕادەیەک ئەو قـۆناغـەی تێپـەڕاندووە کـە جـەسـتـە بەختـەوەری بکات. ئەویش بەهۆی ئەو هـەمـوو ئەزمـوونە ناخۆشـانەی بەسـەریدا هـاتووە وەک کـۆڕەوی سـاڵی ١٩٩١ کـاتێک کورد کۆڕەوی کـرد. کـە خـەمی مـاڵ و نان..... تاد نەبـوو هەمـووی لە شـتـێک هەڵدەهـات ئەویش پاراستنی شـەرەف و کـەرامـەت بوو. قـبـووڵنەکردنی کـۆیلـەیی بوو. هـەر بۆیە گـەر

سەیری کورد بکەین وەک نەتەوەیەک زۆر کەم قبووڵ دەکات ببێتە کۆیلە و بەردەست و..... تاد وەک وڵاتانی ئەسیوبیا و...... تاد. چونکە ئەو نەتەوانە هێشتا وا دەزانن کە بەخۆش ژیانی جەستەیان دەگەنە ئەوپەڕی کاملی ژیان. بەڵام بۆ کۆمەڵگەی ئێمە واقیعەکە زۆر سایکۆلۆجییە. واتە تووشی گرێی سایکۆلۆجی بووین ئەویش خۆبینینەوەیە لە چاوی بەرامبەردا. دیارە ئەمە وەک کۆ. بەڵام وەک تاک دەکرێت مرۆڤ هەبێت بەم قۆناغانەدا ڕۆیشتبێت و تێ بگات مرۆڤ خەمێکی گەورەی هەیە کە ئەویش زۆر گرانترە لە خەمی جەستە و دەروون. هەر بۆیە دەبینیت لە ئەوروپادا لەگەڵ ئەو هەموو واقیعە ڕازیکەرەدا کەچی بیرمەند و فەیلەسووف لەدایک دەبن و ڕازی نەبوون بەو واقیعە و هەموو کات خەونیان بەواقیعێکی ترەوە دیوە. ئەمەش خەمی بوونە کە مرۆڤی ئاوارە کردووە بەشوێن واقیعێکی عەقڵیدا بگەڕێت نەک ڕازیکەر با مایەی مردن و ئازاریش بێت.

واتە واقیع عەقڵ نمایندە بکات کە ئەمەش گەورەترین ئامانجی ڕۆحی مرۆڤە و هێگڵ لە دەوڵەتدا دەیبینێت کە دەوڵەتی عەقڵە. ئەم دەوڵەتەش دەوڵەتی ئەو مرۆڤانەیە کە عەقڵیان واقیعیانە و ماهیەتیان لەسەر ئەم بنەمایە دادەمەزرێت و دەکەونە ناو پێوەندییەوە و کۆمەڵگەی مەدەنی بنیات دەنرێت. دیارە هێگڵ ئاینی مەسیحی لە سەردەمێکدا بەم واقیعە عەقڵییە دەزانێت کە دواتر رووخاوە و خەونی ئەوە دەبینێت کە ئەو واقیعە عەقڵییە دروست بێتەوە سەرلەنوێ. هەر بۆیە ئەوانەی پێیان وایە مارکس بەواقیعبوونی بیری هێگڵە بەهەڵەدا چوون تەنانەت سەیرکردنی هێگڵ لە سەیرگەی مارکسەوە کارێکی نادروستە.

چونکە ئەوەی هێگڵ دواتر گوزارشتی لێ دەکات لە مێژووودا نادۆزرێتەوە، چونکە ئەو واقیعانەی کە هەن یان جەستەیین یان سایکۆلۆجین. هەر بۆیە فەیلەسووفەکان خەونی ژیانی عەقڵیان هەبووە کە عەقڵیان ڕازی نەبووە بەو واقیعەی هەبووە. چونکە کەوتنە ناو واقیع خۆدانەدەستە بۆ کولتووری ژیانی ئەوی تر و لەم بارەدا مرۆڤ هیچ نییە جگە لە دەفرێک بۆ هەڵگرتنی ئەوانیتر و دووبارەکردنەوەیان. ئەوەی ئەمرۆ لە ڕۆهەڵات هەیە زیاتر هەمووی لە ئاستی تاکەکەس هەیە. واتە وەک تاک هەیە کە بەناو ئەو تەجروبانەدا ڕۆیشتبێت و جەستە و سایکۆلۆجیای تێپەڕاندبێت. بەڵام لە ڕۆژئاوادا لەسەر ئاستی تاک تێپەڕ بووە و زەمەن هەیە کە زەمەنی دەرکەوتنی عەقڵ بووە. کە خەڵک بەگشتی تێ کەوتوون بیریان کردووەتەوە

وەک یۆنانیی کۆن. لەگەڵ ئەوەشدا سوکرات کوژراوی دەستی ئەو واقیعە بوو بەوەی بەردەوام باسی جیهانێکی دیکەی کردووە. بەڵام ئەو بەخەم و بەدەمەوەچوونەی ئەوکات بەڵگەی گشتیبوونەوەی بیرکردنەوەیە لەو کاتەدا هەروەها ئەڵمانی کانت و هێگڵ و...... تاد. بەڵام لە ڕۆهەڵات هەرگاف تاکەکەس هەبووە بە تەنیا کە خەمی گەورەی بوونی هەبووبێت لەناو کورددا (ناسری سوبحانی) هەیە کە بەداخەوە وەک مەلا ناسراوە و باجی ئەو وێنە کۆمەڵایەتییەی داوە. وەگەرنا لەناو ئەو بەرگەدا بیرکەرەوەیەکی گەورەی هەیە کە زیاتر گەردوونییان بیری کردووەتەوە. بەداخەوە لایەنێکی سیاسیی فیکری ئەم پیاوەی زیندانی کردووە لەلای خۆی بۆ ئەوەی لەدایک نەبێتەوە. لەناو شیعریشدا (مەحوی)مان هەیە و لە نووسینی پەخشانیشدا (مەسعوود محەمەد) ئەوەی کە ماوەتەوە زیاتر تەعبیرە لەو واقیعەی کە هەیە. لەسەر ئاستی ئاکاریشدا کە وەک کردە هەیە (قازی محەمەد)مان هەیە کە ڕووداوی مردنەکەی جێگەی تێرامان و باسی گەورەیە. (شێخ مەحموود)مان هەیە بەرگری لە بوونی کورد دەکات (مەلا مستەفا)مان هەیە کە بۆ واقیعی ڕازیکەر دەڵێت:

"قەت لە تاریخ نەمانبیستووە مەدحی کەسەک بکەن بڵێن خواردنی زۆر خۆشی دەخوارد یان لەسەر جێگەی زۆر نەرم دەنووست ! هەر تەنیا ناوی ئەو کەسانە بە شەرەف زیکر دەکرێ کە بۆ مەسڵەحەتی عام و بۆ وەتەن و میللەتی خۆ ئەزیەتیان دیوە و فایدەیان بۆ میللەتی مەزڵوومی خۆیان هەبووە."(٢٣)

شۆڕشەکانی کورد شۆڕش بوون بۆ واقیعێک کە دەرکەوتەی بیرکردنەوەی کورد بێت نەک عەرەبی و بیانی. جا ئەو واقیعە بیانییە چەندە ڕازیکەر بووە شۆڕشەکان توندتر بوون.

ئەگەرنا زۆر واقیعی ڕازیکەر خراونەتە بەردەم سەرکردە کوردەکان تا ڕازی بن بەو واقیعە و دانیشن. بەڵام دەنگێک بەردەوام هەبووە کە نەیهێڵاوە ڕازی بن. سەرکردەکانمان زۆر لە ڕۆشنبیرانمان عاقڵتر و بە کەرامەتتر بوون. ڕۆشنبیر هەیە خۆی توورە دەکات و یاخی دەبێت لەو واقیعە هەتا ڕازی بکەن، بەڵام شۆڕشەکان بۆ ئەوە یاخی نەبوون کە ڕازیان بکەن بەپارە و ماڵ و سەروەت و سامان. بۆ ئەوە یاخی بوون کە کوردانە بژین نەک خۆش بژین. ئەم ڕۆشنبیرییەی

دوای ڕاپەڕین کە هەیە ڕۆشنبیرێکە توورەیە بۆ نان و پارە و سامان. خەمی ئەو خەمی ڕازیبوونە. نەک خەمی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ. خەڵکیان خستە ناو فەزایەکی درۆینەوە کە خۆیان دروستیان کرد هەتا ڕەوایەتی بدەنە بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانی خۆیان. لە حیکایەتەکاندا خەڵکیان زیندانی کرد و خۆشیان کەوتوونەتە ناو پێوەندی و ڕێککەوتنەوە لەگەڵ ئەم واقیعەدا. واقیعی ڕازیکەر تەنیا مرۆڤە بێ کەرامەتەکان قبوولی دەکەن هەرچی مرۆڤە بە کەرامەتەکانە بیر دەکەنەوە و هێدی هێدی عەقڵ پیادە دەکەن با بەزیانی خۆشیان تەواو بێت.

(٢-٥) واقیعی وەهمی:

لە باسی واقیعی ڕازیکەردا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە کەسەکە پرسیار و گومانی نییە، بگرە خەمی ئەو خەمی جەستە و دەروونە. کە پێ دەچێت نەشتوانێت ئەوە بکات یان واز بهێنێ. ئەم وازهێنانە بارێکی سلبیی هەیە. سۆفیەت لەم حاڵەتەوە دروست دەبێت. واقیعی ڕازیکەر زیاتر ڕۆئاوا بەرهەمهێنەریەتی. بەڵام واقیعی وەهمی ڕۆهەڵات.

واقیعی وەهمی بەوە وەهمە کە شتەکان لەسەر بنەمای ڕوخسار و وێنە دادەمەزرێت و جەوهەر و بنەمای نییە. واتە هیچ شتێک لە جێگەی خۆیدا نییە. لەم واقیعەدا شتەکان ئاڵوگۆڕ کراون. کۆمەڵگەی کوردی ئەوەی کە ئێستا هەیە کۆمەڵگەیەکی تەواو وەهمییە، چونکە شتەکان لە جێگەی خۆیدا نین. مامۆستایەک پێویست ناکات ئەرک و جەوهەری مامۆستایی بزانێت، بگرە دەبێت وێنەیەک هەیە کە کۆمەڵێک ڕوخساری ئەو کارەیە پێویستە بەرجەستەی بکاتەوە و نیشانی قوتابی و سەرووی خۆی بداتەوە. بەم کارە دەبێتە مامۆستا. ئیتر هیچ گرینگ نییە ئاخۆ جەوهەر و بنەمای هەیە یان نا... ! یان فەرمانبەری باش ئەوە نییە کە خاوەنی توانای کارەکەی خۆیەتی بگرە ئەوەیە بزانێت چۆن هەڵسوکەوت بکات. لێرەشدا شتێک هەیە بزر دەبێت ئەویش جەوهەرە.

یاخۆ ڕۆشنبیر ئەوە نییە کە خاوەنی تیۆرە و بنەمای عەقڵی و بیرکردنەوەیە بگرە ڕۆشنبیربوون کۆمەڵێک وێنەیە کە بەپێی سەردەم و زەمان دەگۆڕێت وەک شێوازی قسەکردن و جلوبەرگ و ڕوخسار و... تاد ئەمەش وای کردووە کە شتەکانمان بنەمای نەبێت و وەهمی بن. واقیعی وەهمی دوژمنی سەرسەختی

جەوهەرە و هەموو کات ئاوارەی دەکات. ئەمڕۆ ئەو سەرگەردانییەی تووشی خەڵکی ئێمە بووە بەوەی کەس ڕازی نییە بەکاری خۆی و هەموو چاوەڕێی پشـوودانن. ئەوەیە کە فـۆرم بووەتە جـەوهەر. هەر کـاتێک ئەو فـۆرمـەت پۆشی ئەوە ئەو جەوهەرەشت هەڵگرتووە لە خۆتدا. ڕۆشنبیرانی ئێمە کاتێک لە هەندەران دێنەوە زۆر شارەزایانە ئەم فۆرمانە دەهێننەوە کە فەیلەسووفەکان و ئەکادمیستەکان هەیانە و دەیکەن بە بەرگی خۆیاندا و دەیەوێت وەک فەیلەسووف و بیریارێکی گەورە مامەڵەی لەگەڵ بکەین. بەڵام ناشبێت پرسیارێکی فەلسەفی و عەقڵی ئاراستە بکەین. ئەمانەش هەموویان دەیانەوێت خۆیان بگوازنەوە بۆ نەوەکانی دوای خـۆیان واتە چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە ئەو فـۆرمـە کـە لە خـۆیەوە بڵاو دەکرێتەوە. بکرێتـە مـۆدیل و گـشـتی بێتـەوە. لە کـاتێکدا ڕۆشـنبیر کـاری بەخۆگواستنەوە نییە. ئەوەندەی کـاری بەڕۆشنکردنەوەی تیۆرییە باڵاکـان هەیە لەناو کایە جیاجیاکانی کۆمەڵگەدا. ڕاستیی واقیعی وەهمی واقیعێکی زۆر سەختە بۆ مرۆڤی بیرکەرەوە بەردەوام تووشی نائومێدی دەکات. چونکە شتەکان فێڵ دەکەن لە مرۆڤ هەموو خۆ بەهەقیقەت دەزانن و جا کەشفکردنی ئەم فێڵە قوربانیی دەوێت.

ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەوەیە چۆنیەتیی مامەڵەکردنە لەو واقیعەدا. چونکە ئەم واقیعە وەک یارییەک وایە کە هەمووی براوەتەوە چۆن و چییە. واتە دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات سەردار و کۆیلە کۆکن لەسەر ئەوەی شتەکان وەهمن. ئەوەش دێتە ناو ئەم یارییەوە نابێت شتەکان بەڕاستی و بەدروستی و بە جیدی وەربگیرێت. بگرە دەبێت ئەویش وەک ئەرک و کـارێک ڕایی بکات. هەر کـاتێک مـرۆڤ لەناو ئەم واقیعەدا بەهەقیقی شتەکانی وەرگرت. تووشی دەردەسەری گەورە دێت. چونکە هەموو لەناو یەک خـەوێکی خـۆشدا دەژین و کـاتێک یەکێک دێت دەیەوێت ئەوە بزانێت کە ئەمە خەوە و ڕاستی نییە، ئەوا دوژمن بۆ خۆی دروستی دەکات. چونکە کـۆمەڵگە نایەوێت هەستێت لە خەو. ئەوەشی دەیەوێت هەقیقەت کەشف بکات تووشی ئازار دەبێتەوە هەم لەلایەن خەوێنەر و هەم لەلایەن خەوێنراوەوە. گەر نموونەیەکی سادە وەربگرین گرێبەستێک هەیە لە نێوان مامۆستا و قوتابیدا بەوەی مامۆستا فۆرمی مامۆستایی دەداتە قوتابی و قوتابیش فۆرمی قوتابێتی دەداتە مامۆستا. واتە نە مامۆستا قوتابی فێر دەکات و نە قوتابیش دەیەوێت فێر

بێت. چونکە مامۆستا مووچەی دەوێت و قوتابیش دەرچوون. لەم بارەدا گەر یەکێک هات جا چ قوتابییەکی ڕاستەقینە بێت یان مامۆستایەکی ڕاستەقینە بەهەقیقی کارەکەی خۆی ئەنجام بدات. ئەوە لەلایەن هەردوو تەرەفەوە دژایەتی دەکرێت چونکە ئەم یارییە ئاشکرا دەکات.

ئەمەش کە هەیە وەک گرێبەستێک لە نێوان شتەکاندا مێژوویەکی قووڵ و دوور و درێژی هەیە. کە پێویستی بەبیرکردنەوە نییە بەڵکو بە زیرەکی هەیە. زیرەکییەکی ساختە کە چۆن خۆمان بکەین بەو شتەی کەسی بەرامبەر دەیەوێت. نەک ئیش وکارەکە. هەر بۆیە ئەمڕۆ زۆر ئاسانە کار و پیشە گۆڕین. هەر ئەم بنەمایەیە وای کردووە کە مرۆڤ قیمەتی نەمێنێت. گەر هاتوو لێرە نەما زۆر بەئاسانی دەتوانین جێگەی پڕ بکەینەوە. بەجۆرێک هەموو کەس دەتوانیت ببێت بەئێمە و ئێمەش دەتوانین ببین بە هەموو کەس. واقیعی وەهمی هەرگاڤ خۆی وەک هەقیقەت نیشان دەدات بەڵام بۆشە و بەتەنیا فۆرم و وێنەیە. بۆ نموونە وەزیرێک کە هەیە خۆی بەوەزیر دەزانێت و دەبێت ئێمە ڕێزی وەزیری بگرین بەڵام ناشبێت داوای ئەوەی لێ بکەین کە وەزیرایەتی ئەزموون بکات. چونکە کەشف دەبێت و تووڕە دەبێت لێمان ئەمە وەک دەسەڵات. وەک باری کۆمەڵایەتی ئێمە هەموومان خزم و کەس و مام و خاڵمان هەیە کە بەردەوام وێنەی خەمخۆری و خزم دەدەنە ئێمە و ناچارین وەک خزم ڕێزیان بگرین، بەڵام نابێت داوای ئەو ئەرکەی لێ بکەیت کە هەق وەهایە خزمێک بۆ خزمێکی ئەنجام بدات. لە واقیعی وەهمیدا شتەکان هەموو لەسەر بنەمای وێنە و فۆرم و ڕوخسار دەڕۆن بەڕێوە. ئەم بەوێنەبوونی دنیا و واقیع شاهێدی بێ بنەمایی ئەم واقیعەیە. کە خەڵک بەپێی بەرژەوەندیی سوود و قازانج شتەکان بەڕێوەدەبات و لەسەر بنەمای (سیقە) مامەڵە لەگەڵ یەک دەکەن و دەکەونە ناو پێوەندییەوە.

لە کاتێکدا سیقە کۆنکرێتکردنی یەکێکە لە حاڵەتێکی ژیانیدا. واتە لەسەر ئەم حاڵەتە مامەڵە لەگەڵ کەسەکە دەکەین. بەبێ ئەوەی بزانین کە ئاخۆ ئەوە لە دەستی دەرچووە یان فێڵ بووە. یان ڕاهاتووە و هۆشیاری نییە بەو کارەی خۆی. ئیتر کەسەکان وێنەی خۆیان نیشانی یەکتر دەدەن و لەژێریشەوە خەریکی شتێکی ترن. وێنە نەک هەر بەرگ نییە بۆ کەسەکان بگرە فێڵی مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکتر. واقیعی وەهمی لە دەرەوە زۆر جوان و ڕێک دیارە کە هەموو خەڵک خەمخۆر و دڵسۆزی

یەکترن بەڵام کاتێک دەکەوینە ناوەوە ئەو کاتە دەبێت پۆلیس و دەزگا و مەلا و..... تاد بۆ دابین بکەین. نەک هەر لە سیاسەت و دەسەڵاتیدا بگرە وەک فیکریش ئەمە بەرهەم دەهێنێت هەروەک (فۆکۆیاما) ئەوەی فۆکۆیاما[٢٤] دەیکاتە جەوهەر و بنەمای واقیعیەکان (سیقە)یە. سیقەش پێکەوەگونجانی وێنەکانە لەگەڵ یەکتر. ئەم ڕەوتە خەتەرناکە گوزەر دەکات بەناو ڕەگ و ریشەی کۆمەڵگەی ئێمەدا و تەواوی ئۆرگانەکانی تەنیوە. ئەوەشی ئەم واقیعە وەهمییە بەخێو دەکات و دەیپارێزێت ڕاگەیاندنە بە tv، ڕۆژنامە و..... تاد بەردەوام کار لەسەر بەوەهمبوونی واقیع دەکەن و وێنە دەکەنە هەقیقەتی ڕووداوەکان. ئەمەش عەقڵی ئەمەریکایی لە پشت ئەم پرۆسەیەوە کار دەکات. بەوەی کە وێنەی باوکی جیهانی داوەتە خۆی و لەژێرەوەش یەکەمین دزی جیهان خۆیەتی. کێشەی کورد و ئەمەریکا ئەوەیە کورد کە مامەڵە لەگەڵ ئەمەریکا دەکات وەک باوک مامەڵەی لەگەڵ دەکات. بەڵام ئەمەریکا وەک یاری و سیاسەت مامەڵە دەکات. لێرەدا دەبێت کوردیش وەک یاری مامەڵە بکات و بچێتە بەردەم ئەمەریکا نەک وەک خەمخۆر و باری ئەوە بخاتە سەر شانی ئەمەریکا کە باوکە و مافی دەداتەوە. ئەمەش بەو مانایە نا کورد فێڵ بکات نەخێر....!

بەڵام ئەوەی ڕۆحی کورد دەیەوێت کەوا وەک ڕۆحێک تەعبیر لە شوناسی نەتەوە بکات و لەناو جەستەکەیدا دەرکەوێت. لەناو ئەم جیهانەدا کە شتەکان هەموو وێنە و وەهمین زۆر ئەستەمە. چونکە بەهاتنە ئارای ئەم ڕۆحە بۆ ناو جیهان گەورەترین خەتەر و مەترسی ڕوو لە جیهان دەکات و دەوڵەتەکان بەتاڵ دەبنەوە. چونکە وێنە و هەقیقەت پێکەوە ناگونجێن. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە کورد واز بهێنێ لە ڕۆحی خۆی نەخێر.... ! دەبێت خۆی ڕزگار بکات لەو یارییەی کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە.

(٣-٥) واقیع گۆڕکێ:

بەوەدا مرۆڤ خاوەنی عەقڵە و عەقڵیش وەک یەکەیەکی چالاک کار دەکات و وەک چاوێک مرۆڤ ئاراستە دەکات و وا دەکات ڕازی بێت و ڕازی نەبێت. واتە عەقڵ ڕاستی وەک بنەمایەکی پتەو وەک مەحەک لەناو مرۆڤدا کار دەکات. کاتێک مرۆڤ لەناو واقیعی ڕازیکەر و وەهمیدا دەگوزەرێ جەستە و دەروونی ئەو لەو دوو

واقیعەدا ئامادەگییان هەیە و عەقڵ نایەتە ناو ئەو دوو جۆرە لە واقیع. بەڵام بۆ کەسانێک کە ئیتر واز لەوە دەهێنن عەقڵ چییە و چی دەوێت و بەشوێن ئەوەوە بن کەوا عەقڵیان واقیعی بکەنەوە. ئیتر ڕازین بەوەی لە واقیعەکانی تردا بژین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا عەقڵ هەر واز لە مرۆڤ ناهێنێت. واتە گەر هەموو ژیانی مرۆڤ بێ ئاگایی بێت بەرامبەر بەعەقڵ ئەوا کۆمەڵە ساتێک هەیە کە مرۆڤ هەست بەبێزاری و بۆشیی شتەکان دەکات و دەکەوێتە ناو خۆزگە خواستن و ئاواتەوە. لێرەدا مرۆڤ تەنیا دەبێتەوە ناچارە گۆڕانێک بکات. ئیتر دەکەوێتە واقیع گۆڕین و سەفەر و گەشت. دیارە کەسانێک هەن کە ئیتر ڕازین بەو واقیعە و ناشیانەوێت عەقڵ درک پێ بکەن و سەروەریان بێت. ئەوەی هەیە لە خۆیاندا تۆخی دەکەنەوە لەسەر واقیع و بەردەوام بەماڵی یەکەمی خۆیانی دەزانن.

واقیع گۆڕین ئەوەیە مرۆڤ زوو شوێنەکانیان بگۆڕێ وەک گەشت و گەڕان و گواستنەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە مرۆڤ خۆی دەرباز بکات لە تەنیایی و بێزاری. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە خەمی گەورەی مرۆڤ زانینە. دیارە زانین بەو مانایەی مرۆڤ لە بەردەم ئاشکرابوونی (بوونی) خۆیدایە واتە لەوێدا چێژی باڵای گیانی هەست پێ بکات. بەڵام جۆرێکی تر زانین هەیە کە ڕاستیی زانیارییە نەک زانین. وەک بینینی وڵاتان و گەشت و گەڕان، کە چێژەکەی لەوەدا نییە کە تیایدا دەژیێت بگرە لەوەدایە دەیگێڕێتەوە. واتە چێژی گێڕانەوەیە نەک ژیان تیایدا. ئەمەش چێژی خۆبینینەوەیە لە چاوی بەرامبەردا. ئەمەش جیاوازە لە چێژی ڕۆحی مرۆڤ کە خۆی دەدۆزێتەوە. بەڵام لە جێگەی ئەم چێژە. ئەو جۆرە چێژە بووەتە چێژی جەوهەری مرۆڤ کە زانیارییە و واقیعەکان دەگۆڕێ و بەردەوام شوێنەکانیان دەگۆڕێ و خۆی خافڵ دەکات لەوەی هەیە.

هەموو ئەم گۆڕانانەش بۆ دوو هۆی سەرەوە دەگەڕێتەوە. دیارە بەئاگا لەوەی مرۆڤ لەگەڵ گۆڕینی شوێنەکان و واقیعەکان و هەر تووشی تەنیایی و نائومێدی دەبێت. چونکە وەک گوتمان عەقڵ دانانیشێت. بگرە بەردەوام مرۆڤ ئاراستە دەکات جا مرۆڤ خۆی ئازادە بەدەنگیەوە دەچێت یان نا. بەڵام سات هەیە ئیتر مرۆڤ ناتوانێت خۆی خافڵ بکات تووشی واقیع گۆڕکێ دەبێت. هەروەک چۆن مرۆڤ لە خەیاڵدا سەفەری هەیە. ئاواهاش مرۆڤ سەفەری هەیە لە واقیعەکاندا کە زوو زوو واقیعەکان دەگۆڕێت و شوێنەکان تاقی دەکاتەوە. ئەو چێژە ساختەیەش

ئەوەیە مرۆڤ زانیاریی دەست دەکەوێت نەک زانین.

واقیع گۆڕین بەتەنیا کردەیەک نییە مرۆڤ بەشوێن خۆشیدا بگەڕێت هەوڵی چێژ وەرگرتن بدات. بگرە زۆرجار خۆخافڵکردنی خۆیە لە عەقڵ و بیرکردنەوە و وەبیرهاتنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە مرۆڤ هەموو پێداویستییە جەستەیی و دەروونییەکانی پڕ دەبێتەوە لەبەر ئەوەش کە ئەمانە خەمی قووڵی مرۆڤ نین سات هەیە ئەم خۆشی و لەزەتە دەرووخێت و مانای نامێنێ. وەک ئەوەی مرۆڤ دەکەوێتە ناو پێوەندی لەگەڵ کەسێ لەسەر بنەمای سایکۆلۆجیا وەک ئەوەی کچێک دەبێتە هاوسەری کوڕێک، لەبەر کەسایەتی و پلەی کۆمەڵایەتیی ئەو کەسە.

سات هەیە ئەم هاوسەرکارییە دەرووخێت و مانای نامێنێ چونکە کچەکە لە پێناوی گەورەکردنی دەسەڵاتی خۆیدا ئەم کارە دەکات و بنەمایەکی عەقڵیی نییە. لەبەرئەوەی کوڕەکە زۆر حزووری هەیە لەناو زەینی کۆمەڵگەدا کچەکەش کاتێک دەبێتە هاوسەری ئەم کوڕە، ئەو شوێنە دەبات بۆ خۆی.

بۆ ئەوەی ئەم هاوسەرکارییە بێ مانا نەبێت دەبێت کچەکە بەردەوام لەناو کۆمەڵگەدا سەیری کوڕەکە بکات. هەتا لە چاوی ئەوی ترەوە بیبینێت، بەڵام ئیتر کاتێک هەردووکیان دەکەونە بەردەم یەک و یەکتر دەبینن تووشی کارەسات دەبن.

بەڵام بۆ خۆگێلکردن لەم یەکتردیتنە. ئەم دوو کەسە بەردەوام لە دووری یەکترەوە سەیری یەکتر دەکەن و بەوەهمی دەژین. واقیعی وەهمی بەردەوام ترسێک نیشانی مرۆڤەکان دەدات هەروەها واقیعی ڕازیکەریش ترس دروست دەکات بۆ مرۆڤ. واتە لەم دوو جۆرە واقیعەدا ترسی رووخان و تێکچوون هەیە. تەنانەت ئەوروپا ترسێکی گەورەی هەیە لە بەرامبەر هێزێکی نادیاردا. زۆرن ئەو فیلم و سینەمایانەی باسی تێکچوونی دنیا دەکەن یان هاتنی مەخلوقێکی تر بۆ سەر زەوی.

ئەو ترسە پێویستی بەوە هەیە خۆت گێل بکەیت لێی بۆ ئەوەی خۆش بژیت. بۆیە واقیع گۆڕین دێتە ئاراوە. ئەم واقیع گۆڕینە سەرەتای خۆخافڵکردنی مرۆڤە بۆ نەدۆزینەوەی خۆی. زۆر لە ماڵی ئێمە هەیە مانای بەندە بەوەی بچنە میوانداریی خەڵک، یان خەڵک بێتە میوانییان. ئەم یارییە یاریی نێوان خێزانەکانە کە واقیعی یەکتر دەگۆڕن و یەکتر خافڵ دەکەن. ئەمەش هەمووی ئەو چێژە ساختەیەیە مرۆڤ

دەیکات بۆ ئەوەی لە چاوی بەرامبەردا خۆی ببینێتەوە. ئەم یارییە خزمەت بەمانەوەی واقیعەکە دەکات. وەگەرنا هەمووماں باش دەزانین کە دڵمان ڕازی نییە بەو پێوەندییە وەهمییە. ئا لێرەدایە کەسانی بیرکەرەوە کۆمەڵایەتی نین نەک لەبەرئەوەی سەرقاڵی نووسین و داهێنانن کە (هاشم ساڵح) باسی دەکات. نەخێر! بیرکەرەوە ڕاستەقینەکان هەست بەوەهمیەتی ئەو واقیعە دەکەن بۆیە دڵیان ڕێگە نادات کە دنیایەک هەمووی سێبەر و وەهم بێت تیایدا بژین.

ئەم دیدەی هاشم ساڵح ئەو ڕەوتە خراپەی ناو بیرکردنەوەی ڕۆشنبیری عەرەبی و کوردییە کە ڕۆشنبیر خۆیان بەگەورەتر و بە سەرووتر دەزانن لە خەڵک و خۆیان جیا دەکەنەوە لە پێناوی پاراستنی مانای خۆیاندا. خۆیان بەدوور دەگرن لە خەڵک. بەڵام هەموو نووسین و هەوڵێکیشیان بۆ کۆکردنەوەی چەپڵەی خەڵکە و هەوڵە بۆ خۆحازرکردن لە زەینی بەرامبەردا و ئەمە یارییەکە ڕۆشنبیری ساختە لەگەڵ خوێنەردا ئەنجامی دەدات.

(٤-٥) واقیعی عەقڵی:

دیارە مرۆڤ بەوەدا کە خاوەنی عەقڵە و ئەم هێزە لەناو مرۆڤدا هەروەک هەموو بەشەکانی تری مرۆڤ لێدەرچوونی هەیە لە خۆیەوە بۆ ناو واقیع. هەروەک چۆن جەستەی مرۆڤ لێدەرچوونی هەیە. بۆ نموونە کورسی یەکێکە لە لێدەرچوونەکانی جەستەی مرۆڤ. چونکە ڕاحەتی جەستە مرۆڤ ناچار دەکات بیر بکاتەوە و ئەم شتانە دروست بکات.

لە پاڵ ئەمەشدا دەروون لێدەرچوونی هەیە وەک پێوەندیی کۆمەڵایەتی و کەسایەتی و شەڕ و... تاد. شەڕەکانی ناو مێژوو کوشتن و بڕین و ئەو جەور و ستەمەی کە مرۆڤایەتی پیایدا تێپەڕیوە. هەموو ئەمانە دەرکەوتەی دەروونین. حکوومەتی بەعس کامڵترین دەرکەوتەی دەروونی بوو، کە بەردەوام لە بێ مانایی خۆی دەترسا و هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ پاراستنی خۆی.

لە پاڵ ئەمەشدا عەقڵ دەرکەوتەی خۆی هەیە بەڵام کێشەی عەقڵ لەوەدایە. دەرکەوتنی زۆر ترسناکە لە بەردەم کۆمەڵگەدا. ئێمە دەرکەوتەی گەورەمان هەیە لەسەر جەستە وەک خێڵ کە شەرەف کۆجەستەی ئەو خێڵە پێک دەهێنێت. هەر کاتێک یەک نەفەر ئەمەی بەزاندبێت ئەوا هەموو خێڵ هەستیان بەشەرمەزاری

کردووه، چونکه بوونەتە یەک جەستە. ب ەڵام دەرکەوتی واقیعی عەقڵی وەک دەستەوکۆمەڵ لە مێژوودا بەرچاو ناکەوێت. دیارە وەک ئاین کۆمەڵێک نمونەمان هەیە وەک عیسا و هاوەڵەکانی. یان محەمەد و هاوەڵەکانی. بەڵام ئەم دەرکەوتنە دین بووەتە شوناسی بەڵام بۆ خودی عەقڵ خۆی ئەوەی کە فەلسەفە خەونی پێوە دەبینێت نیمانە. وەک تاک دەتوانین بڵێین فەیلەسووفەکان خۆیان بەتەنیا دەتوانین بڵێین عەقڵییەن ژیاون. بەڵام ئەوەی ئێمە دەمانەوێت باسی بکەین واقیعێک هەبێت لە فۆرمی دەوڵەت یان کۆمەڵگەدا نیمانە. وەگەرنا فەیلەسووفەکان عەقڵیان هێناوەتەوە ناو واقیعەوە، بەڵام لە ڕێگەی زمانەوە. ئێستا با بپرسین بۆچی زمان دەبێتە زەوینەیەکی واقیعی بۆ دەرکەوتنی عەقڵ؟

وەک پێشتر باسمان کرد مرۆڤ کاتێک دێتە ناو کۆمەڵگەوە. جیاوازیی کۆمەڵگە لەگەڵ عەقڵ ئەوەیە. کۆمەڵگە کرِ دەکەوێت لەسەر کۆمەڵە ئایدۆلۆجیایەک. بەڵام عەقڵ بەم بنەمایە کار ناکات و هەمیشە شتەکان لەناو پرسیاردا دەهێڵێتەوە. ئەم پرسیار و گومانەی عەقڵ کێشە دروست دەکات بۆ کۆمەڵگە. لەوێدا کۆمەڵگە نایەوێت ئەو بناغە ئەستوورەی خۆی کە دایکوتاوە لەناو زەینی تاکەکاندا تێکی هەڵوەشێنێت.

پاشان ترسی هەیە لە شتێک کە ئەنجامی دیار نییە. چونکە عەقڵ کاتێک دەردەکەوێت ئێمە ناتوانین پێشی بکەوین کە چۆن دەردەکەوێت و چی دەکات. واتە بەردەوام لە بەردەم شیمانەیەکی نەزانراوین. کۆمەڵگەش دەبێت بەردەوام ئەنجامی شتەکان بزانێت، ئەوسا ڕێگە دەدات ئەو شتە دەرکەوێت. ڕووبەڕووبوونەوەی عەقڵ لەگەڵ عەقڵی کۆمەڵگەدا ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ هەموو ئەو کولتوورە بەجێماوە و شەڕکردنە لەگەڵ تەواوی کۆمەڵگەدا.

جا فەیلەسووفەکان مەیلی گەورەیان هەبووە کەوا وەک واقیع و ژیان عەقڵ حازر بکەن. بەڵام کاتێک تووشی کۆمەڵگە بوون و خۆشیان هەر بەتەنیا بوون. عەقڵ زیز بووە لە واقیع و چووەتە ناو زمانەوە. جگە لە سوکرات کە باوکی فەلسەفەیە ژیانی واقیعی فەلسەفەکەیەتی. ئەوانی تر بەر ئەم ڕایە دەکەون. هەموو هەوڵەکانی سوکرات کە کردوویەتی لە ژیان و لە گفتوگۆکانیدا هەوڵ نەبووە بۆ ئەوەی دەقێک بنووسرێت یان دەقێک بەرهەم بێت نەخێر!

بگرە بەردەوام بەشـوێن واقیـعکردنەوەی عـەقڵ بووە لە بابەتی حوکمـڕانیدا کە فـەلسـەفەی سـیاسـیی شـیان کردووە. لەناو هونەردا کە فـەلسـەفـەی هونەر و لەناو ئەخلاقدا کە فەلسـەفەی ئەخلاقی بەیان کردووە. لە دوای سوکرات فەلسـەفە زیاتر پەتی بووەتەوە و لەزماندا خۆی بەرجەستە کردووە.

لێـرەدا هێگڵ دەکەوێتـە ناو کێـشـەوە، چونکە ئـەو پێی وایە مـێـژووی فـەلسـەفـە مێـژووی پەرەسـەندنی عـەقڵە. لە کاتێکدا فەلسـەفە هـەتا دەڕوات پەتیـتر دەبێتەوە و دوور دەکەوێتـەوە لە واقیع. هێگڵ لەبەر بوونی ئەم کێشـەیە فەلسـەفـەی سـەردەمی خۆی بـە کامڵـتر و گەشەسـەندووتر بزانێت لە فەلسـەفەی سـەردەمانی پێش خۆی. سـەرسـەخـتی واقـیـعـیـبـوونـەوەی عـەقڵ لە ئەسـتـۆی عـەقڵ خـۆیدا نـیـیـە. ئەوە کەمـتوانایی عەقڵ و بێهێزیی خـۆی بێت. بگرە دەگەڕێتـەوە بۆ کەمـتوانایی مرۆڤ و لاوازیی مـرۆڤ. ئـەوە مـرۆڤـە ترسـنۆکـە و نایەوێت عـەقڵ پەرش بکات بەتەواوی ژیان و گوزەران و بیرکردنەوەیدا. چونکە مرۆڤ وا دەزانێت بە فێڵ و بەخۆپەسـندی خـۆش دەژیت نەک بـەسـەروەریی عـەقڵ ژیان خـۆش و پڕ مـانا دەبێت. مـاکس هورکهایمەر لە باسی بەواقیعبوونەوەی عەقڵدا وەک یۆتۆپیا گوزارشتی لێ دەکات (لە ڕاسـتـیدا یۆتۆپیـا دوو ڕوخسـاری هەیە لەلایەکەوە ڕەخنەیە لەوەی کـە هەیە و لەلایەکی ترەوە وێـنایە بـۆ ئـەوەی کـە دەبێت، واتـا گـەوهـەرییـەکـەش لـەوەی یەکەمیاندایە)[٢٥]

دیارە هۆرکهایمەر لە باسی عەقڵدا یۆتۆپیا بەرامبەر دەکاتەوە. تەنانەت کۆماری ئەفلاتوون بە یۆتۆپیای ئەفلاتوونی ناودەبات.

"کانت لە ڕەخنەی عـەقڵی پەتیدا سـەبارەت بە یـۆتۆپیـای ئەفـلاتوونی دەڵێت"[٢٦] دواتریش لە باسی هێگڵدا دەڵێت "ڕۆح لەباریدا نییە لەگەڵ واقیعدا چوونیەک بێت یاخۆ لە شوناسدا بێت"[٢٧].

ماکس هۆرکهامیەر هـەر لەسەر بنەمـای ئەو نەگونجانەی دابەزینی عـەقڵە بۆ ناو واقـیع ڕەخنە ئاراسـتـەی هـێگڵ دەکات و بـە یۆتۆپیـا وەسـفی دەکـات. دواتر گـوتە بەناوبانگەکەی هێگڵ بخـاتە ژێر پرسـیارەوە "هـەموو عەقلانییەک واقیعییە و هـەموو واقـیـعـیـەک عـەقلانیـە"[٢٨] ئەم بنەمـایەی هۆرکـهایمـەر باسـی دەکات کـە یۆتۆپیـا ڕەخنەیە لـەوەی کە هـەیە تـەواو دروسـتـە. بـەڵام واقـیـعی عەقـڵی بە ڕەخنەگـرتن لە واقـیـعـەکانی تـر ناکەوێتـە ناو ئەوەی شـیـان بکات. چونکە ئـەوکات عـەقڵ دەبووە

شتێکی زۆر سادە و ساکار. بەڵام ئەم گوتەیە بۆ ڕەخنەگرتن لە "تۆماس مۆرو کامپدانێلا"(٢٩) دروستە کە لەسەر بنەمای واقیعی موڵکی تاکەکەسی واقیعی موڵکی گشتیی وێنا کردووە. بەڵام خوێندنەوەی هێگڵ بەم تێزە دەکەوێتە ناو کێشەوە. چونکە هێگڵ واقیع وێنا ناکات. ئەوەی هێگڵ نابێتە یۆتۆبیا چونکە هێگڵ دەگەڕێت بەشوێن ئەو توانا شاراوەی عەقڵدا کە لە فۆرمی دەوڵەتدا خۆی نمایش دەکات. ئەم واقیعی عەقڵییە لەسەر واقیعی تر بینا ناکات. بگرە بۆ خۆی واقیعێکی ترە. بەڵام بۆ ئەوەی کە بۆچی واقیعی عەقڵی نایەت و نابێتە واقیع. ئەوە لێ دەگەڕێین بۆ کاتێکی دیکە. بەڵام بۆ دەرکەوتنی عەقڵ. مرۆڤ ڕۆژانە دەتوانێت وا بکات عەقڵ دەرکەوت پێ بکات، جا لە کردار بێت یان بڕیار یان ڕەفزکردن بێت. بەڵام عەقڵ زیاتر ئەمڕۆ هاتووەتە ناو نووسینەوە بەتایبەتی فەلسەفە.

دیارە کە هونەر و ئەدەبیش دەتوانن بینە ماڵی عەقڵ. هەروەک چۆن (مەحوی) وەک شیعر گوزارشتی لە خودی عەقڵ کردووە. بۆ بیرکردنەوەش کە حزووری هەیە و ئاین وەک چالاکییەکی عەقڵ لێی کۆڵرابێتەوە ناسری سوبحانییە. ڕۆشنبیری دوای ڕاپەڕین زۆر غەدری لە خوێنەر کرد کە زۆر ئاسۆ هەبوون شاردیانەوە و خۆیانیان کردە چاوەی مەعریفەت. پێش خۆشیان ناو نان نەریتپارێز و کۆنخواز. هەروەها زۆر شوێن هەیە پێویستی بە تێپەڕاندن هەیە. بەڵام ئەم ڕۆشنبیرییەتە بەردەوام خول دەخوات و خۆی دووبارە دەکاتەوە لە فۆرمی جیاجیادا. ئەمەش بەناوی ئەکادیمیبوون و لەخۆوە قسەکردن کۆمەڵێک یاسا هەیە ئەم ڕەوتە ژێرەوانکێی دایدەنێت بۆ نووسەر و خوێنەران. زۆربەی جار ئێمە دەچینەوە سەر باسی ڕۆشنبیریی کوردی. وەلێ ناشزانین ئاخۆ سەر بە باسەکەیە یان نا. بەڵام دەبێت ئێمە ئەوە لە بەرچاو بگرین کەوا ڕۆشنبیرییەک هەیە پێش ئێمە هاتووە و خاوەنی دنیا بینی خۆیەتی و تەرحی هەیە و بەرهەمی هەیە. خۆ گەر ئێمە بەم تیۆرییانە جاروبار بکەوینە ناو گفتوگۆ پێم وا نییە خراپ بێت، چونکە یەکەم کارێک کە دەبێت ئەنجامی بدەین ئەوەیە سەرەتا پێش خۆمان بخوێنینەوە و پرسیاری ئاراستە بکەین و گومانی لێ بکەین دواتر خۆشمان چیمان هەیە بیخەینە سەر ئەم بیرکردنەوەیە. پاشان وەک تاقیکردنەوەیەک بیخەینە بەردەمیان کە ئاخۆ دەنگێک قبووڵ دەکەن جیاواز لە خۆیان؟ ئاخۆ تا چەند لە مانای جیاوازی گەیشتوون؟

چونکە ئەم ڕەوتە زۆر بەگلەییــە لە خوێنەر کە فـیکر ناخـوێنێـتـەوە. با بزانین بەڕاستی خەمی فیکریانە.

دیارە بۆ واقیـعی عـەقڵی زۆر زیاتر هەڵدەگرێت، بەڵام ئێمـە باسـێکی تایبـەتمان هەیە لەم پەڕتووکـەدا تایبـەتـە بە عــەقڵ بۆیە بـەوەندە لێ دەگـەڕێین. هەر ئـەوەندە بزانین واقـیـعی عـەقـڵیش دەکرێت هەبێت هەروەها واقـیـعی دەروونی و کۆمـەڵێک واقیعی تر هەن بەڵام با نووسەری تر ئەم باسە بوروژێنێت و بەیانی بکات. چونکە ئەم بوارە غەریبە بە ڕەوتی ڕۆشنبیریمان. ڕۆشـنبیری ئێمە هەر سەرقاڵە بەکێشەی ڕۆژانە و ئەو مشـتـومڕانەی لە کەناڵ و ڤیـڤییـەکاندا دەگوزەرێن. لە کـاتێکدا دەبێت ئێمەش وەک کورد باسـمان هەبێت لەبارەی خەمی مەعریفی و عەقڵییەوە، هەروەها و تێ بگەین لە تیۆری شـتەکان. نەترسین لەوەی بڵێن لەخۆوە شت دەنووسێت. گەر نووسـینێک هەرەمـەکی بێت دیارە و نووسـینێکیش عـەقڵی بێت ئەوە خۆی شـایەتی دەدات لەســـەر خـــۆی. بەئـومـــێـدی لەدایکبـــوونی بیـــرکـــردنەوەی تیـــۆری لەناو ڕۆشنبیریماندا.

بەشی سێیەم

# ژیانی خەیاڵی

ئێمە لە بەردەم بابەتێکی فراواندایین ئەویش خەیاڵە، کەوا بەشێکی گەورەی ژیانی مرۆڤ و دەربڕین و تێگەیشتنەکانی دەگرێتەوە. وەک چەمکێکیش هەموو کات لە بەرامبەر واقیعدا دادەنرێت و ناوی دەهێنرێت. لەم بەشەدا بەشوێن ئەوەدا دەگەڕێین ئاخۆ خەیاڵ وابەستەیە بە چی مرۆڤەوە. ئاخۆ خەیاڵ سەر بە جەستەی مرۆڤە یان هێزێکی تری مرۆڤە؟ لە ڕێگەی یەکلاییکردنەوەی ئەوەی ئاخۆ خەیاڵ سەر بە جەستەیە یان ڕۆح. دەتوانین زۆر شت بزانین لەسەر ماهیەتی جەستە و ماهیەتی عەقڵ لە مرۆڤدا.

## ١- خەیاڵ چییە؟

دیارە ئاگادارین کە مرۆڤ خاوەنی کۆمەڵە هێزێکی جیاوازە بۆ وەدەستخستنی زانیاری لەسەر خۆی و دەوروبەر و پاشان دانەوەی بە ڕێگەی جیاواز. ئێمە لە بەشی یەکەم کەم تا زۆر باسی بیرەوەری و یادگەمان کرد و هەریەکەشمان وابەستە کردووە بەوەی هەردووکیان کۆمەڵێک زانیاری وەردەگرن لە ڕێگەی جەستەی خۆیانەوە. جەستە وەک ڕووی دەرەوەی ئێمە دەبێتە سەرچاوەی هێنانی زانیاری بۆ ناو یادگەی ئێمە و وەک بیرەوەرییەک تۆمار دەبێت. جا دیارە لە کاتی هەڵگرتندا لە یادگەدا دادەنیشن. بەڵام هێنان و جووڵانیان پێویستی بە هێزێکی ڕاگوزەر هەیە کە ئەم زانیارییانە بگوازێتەوە لە پێناو تێگەیشتندا. هەروەها پێشاندانەوەی ئەو شتانە لەسەر زەین کە وەک شاشەیەک وەهایە هێزێکی بارهەڵگری پێویستە بۆ ناسینەوەی شتەکان.

واتە بیرەوەری وەک کۆد هەیە لەناو یادگەی مرۆڤدا و کاتێک دەچنە سەر نمایشگای زەین ئەو کۆدانە دەکرێنەوە و جارێکی تر واقیعەکە نیشان دەدەنەوە،

بەڵام وەک وێنە نەک وەک واقیع خۆی.

ئەمەش هەمووی ئەو پرۆسەیەیە کە جەستەی مرۆڤ بەدیوی دەرەوەدا ئەنجامی دەدات. بەوەی واقیع وەک شتێکی دەست لێدراو دەکاتە کۆد و لەوێشەوە لەسەر نمایشگای زەین دەبێتە وێنە. ئەم وێنەیەش وێنەی واقیعەکەیە. ئێستا با ئەوە باس بکەین ئەو هێزەی کە کۆدەکان دەگوازێتەوە بۆ سەر زەین چییە؟ دیارە ئەویش خەیاڵ بەو کارە هەڵدەستێت، خەیاڵ ئەو هێزەیە کە مامەڵە لەگەڵ شتانێکدا دەکات بەرجەستەن. جا ئەو بەرجەستەیە واقیع بێت، یان وێنە. واتە خەیاڵ بە رووی دەرەوەی جەستەدا کار دەکات. وێنە دەگرێ و دەچێتە ناو یادگەوە. خەیاڵیش وەک پەیامبەر ئەم کۆدە دەباتە سەر شاشەی زەین. مرۆڤەکە ئەو کات ئەو دەستە دەبینێت. ئەمەش زۆر بەخێرایی روو دەدات. بەڵام گەیشتن بۆ پلەبەندیی ئەم رووداوە کاتێک ئێمە رۆژێک لە بازاڕدا پیاوێک بە رووتی دەبینین ئەم شتە سەیرە خەزن دەبێت لە یادگەدا. کاتێک پاش ماوەیەکی تر باسی رووتی بکرێت ئەوا ئەم رووتییە وەک کۆدێک ئەو رووداوەمان بیر دەخاتەوە و رووداوەکە دەبینینەوە لەناو یادگەماندا. بەڵام بۆ حاڵەتی کوێر کە چاوی نابینێت و گوێی دەبیستێت. ئەم پرۆسەیە لە رێگەی زمانەوە روو دەدات. لەچاو ساخەکەدا کەسەکە وێنە دەگرێت جا مەرج نییە ئەو وێنەیە پڕاوپڕی شتەکە بێت. بەپێی ئەو گۆشەیەی ئەو تیایدا وەستاوە. بەڵام کوێرەکە کە گوێی لە وشەی (دەست) دەبێت ئەوا وێنا دەکات شتێک دەکاتە رەمز لەناو خۆیدا بۆ ناسینەوەی دەستەکە، بەڵام ئەم بەرەمزکردنە بەشتێکە کە لە خەیاڵی کوێرەکەدا هەیە. واتە هەردەم خەیاڵ شتەکان بەرەمز دەکات و توانای هەڵگرتنی کۆدەکانی هەیە. با ئەوپرسیارە بپرسین ئاخۆ خەیاڵ دەتوانێت شتێک کە دەرنەکەوتووە و شاراوەیە هێشتا. وێنا بکات؟ ئاخۆ جەستەمان توانای دیتنی شتێکی هەیە بزر بێت ؟

دیارە باسی ئەوە ناکەم زانست دێت تواناکانی جەستە فراوان دەکات وەک دروستکردنی دووربین یان تەلسکۆب ئەمە فراوانکردنی بوارەکانە بەپێی توانای جەستە. هەتا بتوانێت شتەکان هەست پێ بکات. بەڵام ئاخۆ خەیاڵ ئەمە دەتوانێت؟ دیارە نەخێر! چونکە شتێک کە نەبووە ناتوانین بەخەیاڵ وای لێ بکەین هەبێت. جگە لە وێناکردن کە ئەویش بەچواندنی ئەو شتەیە بە شتێک (بەرەمزکردن). چونکە ئاشکرایە خەیاڵمان دەبێت شتێک هەبێت تا بتوانیت

هەستی پێ بکات. لێرەدا کەم تا زۆر خەیاڵمان ڕوون کردەوە بەڵام دوو بواری گەورە هەیە لە خەیاڵدا پێویستی بەباسکردنە.

**٢- کردەی خەیاڵکردن:**

(خەیاڵکردن) وشەیەکی لێکدراوە (خەیاڵ+کردن). چاوگی (کردن) لەگەڵ ویستی مرۆڤدا یەک دەگرێتەوە. چونکە بەویستی خۆمانە ئەو کارە بکەین یان نا. خەیاڵ زۆرجار وەک هێزێک بەویستی خۆمان کار دەکات کە لەناو یادگەماندا کام یادگاری و کام بیرەوەری نیشانی ئێمە بدات و بۆمان بخاتە سەر شاشەی زەین. هەموومان دەتوانین خەیاڵمان ئاراستەی ژیانی منداڵی بکەین و بەبیر خۆمانی بهێنینەوە لێرەدا دوو واقیع هەیە کە مرۆڤەکە لە بەردەمیدایە یەکەم واقیع واقیعی دانیشتن و گێڕانەوەکەیە واقیعی دووەم ئەو ژیانە خەیاڵییەیە کە دەچینە ناویەوە و ڕووداوەکانی دەبینین و دەگێڕینەوە. ئەو ژیانە ژیانی وێنەی واقیعە دەتوانین ئێمە لە کلاسدا بین و بەخەیاڵیش بچینەوە ناو ژیانی منداڵی لە بەردەم مامۆستابین و بەخەیاڵیش لەوێ نەبین.

واتە مرۆڤ لە بەردەم دوو ژیاندایە ژیانی واقیعی ژیانی خەیاڵی کە هەر واقیعە بەڵام لە فۆرمی بیرەوەریدا و لەناو یادگەماندا. مامەڵەکردن لەگەڵ بیرەوەری و ژیانی خەیاڵی زۆر قورسترە لە مامەڵەکردن لەناو واقیعدا. چونکە بیرەوەری لەناوماندایە و ناتوانین لێی دەرباز بین. دەتوانین لە مامۆستاکە دەرباز بین و لە کلاسەکە بڕۆینە دەرەوە بەڵام ناتوانین بە ڕۆیشتنە دەرەوە لە بیرەوەریی ژیانی منداڵی بڕۆینە دەرەوە. چونکە لەگەڵ خۆمانە لەهەر کوێیەک بین. دیارە کردەی خەیاڵکردن زۆر گرینگە لە ژیانی مرۆڤدا و پێوەستە بە زیرەکیی مرۆڤەوە کە تا چەند توانای خەیاڵکردنی بیرەوەرییەکانی هەیە و شتەکان حازر دەکاتەوە. ئەمەش بۆ ناسینەوەی شتەکان گرینگە.

کاتێک من باسی یەکێک دەکەم کە هەردووکمان دەیناسین تۆ وەک بەرامبەر کردەی خەیاڵکردن بەکار دەهێنی و خێرا دەگەڕێت لەناو بیرەوەرییەکاندا و یادگە دەپشکنی هەتا ئەو کەسە حازر بکەینەوە و بیناسیتەوە. لێرەوە شتێک هەیە ڕوون دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە خەیاڵ ئەوەندەی لە جەستەوە نزیکە ئەوەندە نزیک نییە لە عەقڵەوە. چونکە خەیاڵ ناتوانێت مامەڵە بکات لەگەڵ شتە پەتی و ڕووتەکان (مجرد

– Abstract) بکات.

پاشانیش خەیاڵ لە بەشێکیدا لەژێر ویستی مرۆڤدایە ئەم دوو خاسیەتە زیاتر وای لێ دەکەن لە جەستە نزیک بێتەوە نەک لە عەقڵ. دیارە پێش ئێمە فەیلەسووفی فـرەنسـایی (دیکارت) زۆر ڕوون گـوزارشت لە خـەیاڵ دەکـات و دەیبـەسـتـێت بەجەستەوە، بەڵام دیکارت زۆر هەمەکییانە باسی جەستە و خەیاڵ دەکات بەوەی کە خەیاڵ جەستەیە و عەقڵ نییە.

"جگە لەوەش مەلەکەی خەیاڵکردن کە من هەمە و هەست دەکەم ئەو کاتە بەکاری دێنم کە لە شـتـە مـادیـیـەکان ڕادەمێنم دەتوانێت بڕوام پێ بێت ئەو شـتـە مـادییـانە هـەن. لەبەرئەوەی کـاتێک بەوردی هەقـیـقـەتی خـەیاڵدان دەپشکنم دەبینم سـەرقـاڵبـوونی مـەعـریفـەیە بە جـەسـتـە کە زۆر پێـوەسـتـە پێیـەوە کـەواتە بوونی هەیە"(٣٠)

دیکارت لێرەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە خەیاڵ بەکار دێت و وابەستەشی دەکات بەجەستەوە، دیارە جەستەییبوونی خەیاڵ لەوەدا نییە بەتەنیا کە مامەڵە لەگەڵ شتە مـادییـەکـاندا دەکـات وەک واقـیع. بگرە لەباری ناوەوەشـدا هـەمـان شت دەکـات. چونکە بیـرەوەریش مـادەیە. واقـیـعـی وێنەیی زیاتر وابـەسـتـەیە بـەدەروونەوە بەڵام واقیعی بەرجەستە بەجەستەی بایلۆجییەوە پابەندە.

هەستەکانی جـەستەی بایەلۆجی لەگەڵ واقیعە بەرجـەستەکاندا مامـەڵە دەکەن. بەڵام خەیاڵ وەک هـەستێکی سایکۆلۆجی مامەڵە لەگەڵ واقیعە وێنەییەکان دەکات. کە بیرەوەری دەگرێتەوە.

"ئەو خەیاڵکردنە جیاوازە لە عاقڵبوونی پەتی لەوەی کاتێک دەروون زەین دەکات و ئاوڕ لە خـۆی دەداتەوە تاکو یەکێک لە بیـرۆکـەکانی ببینێت. بەڵام کاتێک خـەیاڵ دەکـات. ئاوڕ لـەو جـەسـتـەیە دەداتەوە تاکو تیـایدا شـتـێک بدۆزێتـەوە هاوشـێوەی بیـرۆکەکـەی بێت کە بۆ خـۆی دروسـتی کردووە. یا ئەوەی لـە ڕێگەی هـەسـتـەکـانەوە وەری گرتووە"(٣١)

لێرەدا دیکارت بەناڕاستەوخۆ باسی پرۆسەی بەیادهێنانەوە دەکات کەوا هەموو کات خەیاڵ لە پاڵ بیرەوەریی ئێمەدا دەڕوات و وەک کۆمەک هاوکاریی دەکات. ئەوە زۆر گـرینگە خـەیاڵ سـاغ بکەینەوە ئاخـۆ سـەر بەجـەسـتـەیە یان نا... ئەمـەش

بەخاتری ئەوەیە مرۆڤ هۆشیار بێتەوە بەخۆی ئەوەی خەیاڵ نیشانی دەدات چ وەک واقیع و چ وەک بیرەوەری هەردووکی ڕابردووە. چونکە کاتێک خەیاڵ مامەڵە لەگەڵ واقیعی دەرەوە دەکات بەتەنیا مامەڵە لەگەڵ فۆرم و شێوە دەکات و چییەتیی شتەکان بزرن لە ئەو. بۆیە دەبێتەوە ڕابردوو.

با نموونەیەک وەربگرین وەک ئاو. کاتێک مامەڵە لەگەڵ ئاو دەکەین بە خەیاڵ و بە جەستە ئەوا دەزانین ئاو تەڕە و ڕەنگی نییە و بەرمان بکەوێت تەڕ دەبین... تاد خاسیەتەکان دەزانین بەڵام ناتوانین چییەتیی ئاو بزانین و کەشفی بکەین. جا خاسیەت هەرگاف دوای ڕوودانی چییەتی دێتە ئاراوە. بۆیە مامەڵەکردن لەگەڵ خاسیەتی شتەکاندا مامەڵەکردنە لەگەڵ ڕابردوودا. چونکە جەوهەر و چییەتی بزرە. بەڵام کاتێک مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ جەوهەر و چییەتیی شتەکان دەکات کە ئەمەش هەر خودی عەقڵ خۆی کارایە لەم بابەتەدا. ئەو کاتە دەکەوێتە ناو ئاگایی بەرامبەر ئەو شتە. لە ڕووی خوڵقان و دروستبوونیەوە لە ڕووی خاسیەتیشەوە. واتە مامەڵەکردن لەگەڵ جەوهەر چوونە ئەودیوی ڕووداوەکەیە. جارێکی تر ڕووداوەکە لە بیرکردنەوەماندا ڕوو دەداتەوە و دەزانیت ئەو شتە بۆ خوڵقاوە. ئەوەی دیکارت ئەنجامی دەدات لەگەڵ جەستەدا ئەوەیە دەیەوێت جەستە و خەیاڵ تاقی بکاتەوە و بزانێت ئاخۆ دەتوانین بچینە ئەو شوێنەی کە عەقڵ بۆی دەچێت.

ئەم پرۆسەیەش خودی فەلسەفاندنە. چونکە فەلسەفە مامەڵە لەگەڵ وێنە و کەرەستەکان ناکات بگرە مامەڵە لەگەڵ جەوهەر و بوونی شتەکان دەکات. هەر بۆیە فەلسەفە زیاتر نزیک دەبێتەوە لە چییەتیی شتەکان و وەک زانستی خوڵقانی چەمکەکان ناسراوە. چونکە فەلسەفە خودی بانگهێشتنکردنی بوونی شتەکانە بۆ ناو زمان. ئەمەش خوڵقانەوەی ئەو شتەیە جارێکی تر بەڵام لە زماندا.

**٣- بەخەیاڵداهاتن:**

کارێکی تری خەیاڵ ئەوەیە زۆرجار بەبێ ئاگەداری ئێمە کار دەکات و خەیاڵ دەکەوێتە جووڵە و یارمەتیمان دەدات. سێکسکردن دیارە زۆر وابەستەیە بەخەیاڵەوە کە خەیاڵ بەبێ ویستی خۆمان کۆمەکمان دەکات لە هێنانی وێنە و وێنە دەخاتە بەردەممان. یاخۆ نووسین کە مرۆڤ دەنووسێت زۆرجار خەیاڵ کۆمەکمان دەکات لە شێوەگیربوونی ئەو بیرەی هەمانە یاخۆ قسەکردن خەیاڵ

بەردەوام کۆمەکمان دەکات. ئەم بەخەیاڵدا هاتنە لەویادایە کە ئێمە پێشبینیی ئەوە ناکەین کە خەیاڵ بۆمانی ساز دەکات. ئەم دوو کارەی خەیاڵ چ خەیاڵکردن یان بەخەیاڵداهاتن وابەستەیە بەڕووداوەکانی مرۆڤەوە. واتە بیرەوەرییەکانی. جا چ ژیانی واقیعی بێت یان ژیانی خەیاڵی. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە خەیاڵ خۆی بابەتە و کەرەستەیەکە بەدەستی مرۆڤەوە هەر ئەمەشە وا دەکات زیاتر وەک جەستەیەک مامەڵەی لەگەڵ بکەین. بەڵام کارەکەی واقیعی نییە بگرە زەینییە. جا خەیاڵ ئەگەر کەوتە بەردەم واقیع ئەوا وێنەی ئەو واقیعە هەست پێ دەکات گەر کەوتیشە بەردەم بیرەوەری ئەوا وێنەی ناو یادگە هەست پێ دەکات. بەڵام جیاوازیی وێنەی واقیعی لەگەڵ وێنەی بیرەوەری ئەوەیە وێنەی واقیعی جووڵاوە و مەرج نییە هەر بەو ڕەوشە ببینین، بەڵام وێنەی بیرەوەری وەستاوە چونکە خەزن کراوە لە ساتێکی ئەو شتەدا.

واتە یەکەم وێنەیەکە هەیە و حازرە، بەڵام دووەم وێنەیەکە کە بینراوە لەو ساتەدا بەوەستاوی ماوەتەوە لەناو یادگەدا وەک بیرەوەری. بەڵام ڕاستییەک هەیە ئەوەیە کە خەیاڵ چ لە واقیع و چ لە بەردەم بیرەوەریدا ڕووبەڕووی ڕابردوومان دەکاتەوە. پێ دەچێ زۆر ڕووبەڕووی پرسیار ببینەوە یانی چی ژیان لەناو واقیعدا یانی ڕابردوو؟ یاخۆ یانی چی ژیان لەناو بیرەوەریدا واتە ڕابردوو؟

بۆ حاڵەتی دووەم ئاشکرایە بیرەوەری واقیعێکی بەڕابردووکراوە واتە واقیعەکە بووە و ڕووی داوە بووەتە بیرەوەری. جا ژیان لەم شوێنەدا هەموو کات ژیانە لە ڕابردوودا. چونکە ئێمە مامەڵە لەگەڵ ڕووداوێکی مردوو دەکەین. وەک کولتوور. کولتوور ژیانی کەسانی دیکەیە لەناو زەینی ئێمەدا. کاتێک دەکەوینە ناو کولتوورەوە ڕاستەوخۆ دەکەوینە ناو ژیانی ئەوی ترەوە و لە جیاتیی خۆنوێنی ئەو دەنوێنێت. واتە هەردەم لە بەردەم دووبارەکردنەوەی ژیانی کەسانی تردایـن و ناتوانین وەک خۆمان بژین.

دیارە لە بیرەوەریدا هەموو شتەکان حازرن. تەنانەت مانای شتەکانیش حازرن کە ئازادی چییە؟ خۆشەویستی و چاکە و... تاد چییە؟ هەموو چەمکەکان کەم تا زۆر مانای خۆیان هەیە و لەوە براونەتەوە مرۆڤ جارێکی تر بەشوێن چییەتی و جەوهەریاندا بگەڕێت کە چییە؟ یان شتەکان بخاتە ناو پرسیاری (ئەوەی کە........

چییە؟) چونکە پێشتر ئەوە براوەتەوە. دیارە یادگە شوێنی سێبەری شتەکانە. هەرچی واقیعە کە ڕابردووە ئەوەیە خەیاڵ بەتەنیا فۆرم و شێوازی شتەکان درک دەکات لە واقیعدا، واتە چۆنایەتی. هەموو چۆنایەتییەکیش ئەنجامی تەقینەوە و بەڕووداوبوونی چییەتییەکە. واتە چۆنایەتیی پاشماوەی ڕووداوی بوونە. جا مامەڵەکردن لەگەڵ چۆنایەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ڕابردووی چییەتی و پاشماوەکەی. کە ئەم باسە دواتر بەدرێژی باسی دەکەین و هەوڵ دەدەین بەڵگەی بۆ بهێنینەوە.

**٤- خۆبارکردنی ڕابردوو لە وێنەدا:**

باسکردنی وێنە و زانینی و چییەتیی وێنە کەمێک ئاڵۆزە. لەویشەوەیە چۆن بتوانین حاڵەتەکە لەناو چەمکێکدا کۆ بکەینەوە. ئەوەش گرینگە ئەوەیە وێنە چییە؟

دیارە سادەترین پێناسەی وێنە ئەوەیە ساتی وەستاوی شتێکە، یان ساتی وەستانی شتێکە لە کاتێکی دیاریکراودا. واتە شتێک بۆ ساتێک بوەستێت ئەو ساتی وەستانە وێنەی ئەو شتەیە و وێنە دێتە ئاراوە. واتە وێنەکە وەک ڕووکاری ئەو شتە دەردەکەوێت لەو ساتەدا. وەستانی جووڵەی خۆی لە وێنەدا نیشان دەدات. واتە وێنە دەرکەوتووەکە ئەو شتە لە خۆی بار دەکات بۆ ساتێک. هەر بۆیە ئەو پێناسەیە سادەیە، بەڵام زۆر قووڵە و بابەتەکەی وەک گشتێک گرتووەتە خۆی. ئەوەی گرینگە ئەوەیە شتەکان دەردەکەوێت و دواتر وەک وێنە هەڵدەگیرێت لە یادگەدا. لێرە بەدواوە کە باسی ئەو شتە دەکەین. خەیاڵمان هەموو کات ئەو وێنەیە حازر دەکات و نیشانمان دەدات کە شتەکەی بۆ ساتێک هەڵگرتووە لە خۆیدا. هەتا ئێرە پرۆسەکە زۆر ئاساییە. بەڵام لەویادا نائاساییە کە لەسەر بنەمای ئەم وێنەیە بۆ هەموو کات مامەڵە لەگەڵ ئەو شتە بکەین و باسی ئەو شتە بکەین. وا باشە کە کۆمەڵێک نموونە وەربگرین لەسەر خراپیی وێنەکردنی شتەکان لە یادگەماندا کە هەردەم ئایدیۆلۆجیا بەرهەم دێت.

نموونەی یەکەم/ پێوەندیی مرۆڤەکان لەسەر بنەمای وێنەی یەکتر:

مرۆڤ کۆمەڵێک پێوەندیی هەیە لە ژیانیدا وەک پێوەندیی خۆی بەمرۆڤ و بەسروشتەوە بگرە گەورەترین خەمی مرۆڤ ژیانە لەناو پێوەندییەکی تەندروستدا.

غیابی پێوەندییەکی تەندروست وای کردووە مرۆڤ بکەوێتە پێوەندی لەگەڵ ئاژەڵ و سروشت و.... تاد.

ئەوەی جێگەی بایەخە ئەوەیە مرۆڤ ناتوانێت بەتەنیا بژیت. هەردەم لە ناوەوە خەیاڵی خەڵکانێک دەکات کە هەبن و مامەڵەیان لەگەڵ بکات، جا گەر مرۆڤەکە ڕازی بوو بەو پێوەندییەی کە هەیەتی لە واقیعدا ئەوا هەموو کات هەوڵی فراوانکردنی دەدات هەتا زیاتر کەسایەتیی خۆی گەورە بکات. خۆ گەر واقیعەکە ڕازی نەکات. ئەوا بەردەوام لە خەیاڵی خۆیدا دەچێتە ناو کەسانێکی ترەوە کە خۆی وێنەیان دەکات و پەیوەندییەکانیان ڕێک دەخات. یان کەسەکان نین و ئەم خۆی بەخەیاڵ لەگەڵیاندا دەژیت. بەڵام گەورەترین و سەختترین کاری مرۆڤ پێوەندییە لەگەڵ ڕەگەزی خۆیدا کە مرۆڤە. چونکە گەر هاتوو مرۆڤ قایل بێت لەو پێوەندییەی هەیەتی لەگەڵ مرۆڤی تردا ئەوا لە خەتەری ئەوەدایە کە لە ڕابردوودا بژێت. ئێستا با بزانین چۆن وێنەی مرۆڤەکان دەبنە هۆی کوێربوونی مرۆڤ بەرامبەر بەیەکتر. دیارە مرۆڤ کاتێک یەکتر دەبینن یاخۆ باسی یەک دەکەن. ئەم دیتن و باسکردنە دەبنە وێنەیەکی وەستاو لە یادگەدا. کوێربوونەکە لەوێدایە کاتێک ئەو دوو مرۆڤە دەکەونە بەردەم یەک مامەڵە لەگەڵ یەک ناکەن، بگرە مامەڵە لەگەڵ وێنەی یەکتر دەکەن. بەوەش هەرگاف لە ڕابردووی یەکتردا دەژین و بەرابردووی یەکتر کار دەکەن. زۆرجار سەرکردە و دەسەڵاتدارە ساختەکان دێن لەناو ڕووداوێکدا وێنەی باش نیشانی دەرەوە دەدەن و جێگری دەکەن لەناو زەینی بەرامبەرەکانیاندا، هەتا هەموو کات هەر بەو وێنەیەوە سەیری بکەن. یاخۆ گۆرانیبێژەکان دێن گۆرانییەک دەڵێن کە وێنەیەکی گەورەی بۆ دروست بکات هەتا دوایی ئێمە هەر بەو وێنەیە مامەڵەی لەگەڵ بکەین. یان شانۆکاران زۆرجار کەسایەتیی ناو شانۆیەک دەدزن و لە ژیانی واقیعیدا خەڵکی پێ کوێر دەکەن. ئیتر هەر پێوەندییەک کە دروست دەبێ لەسەر ئەم بنەمایە پێوەندییەکی کوێرانەیە و ڕابردوو حوکم دەکات نەک ئێستای ئەو کەسە. دیارە زۆربەی مرۆڤەکانی ئەمڕۆ لەسەر ئەم بنەمایە کەوتوونەتە ناو پێوەندییەوە و ئەمڕۆش مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر پێوەندی ناکەن. بگرە مامەڵە لەگەڵ وێنەی یەک دەکەن. پێوەندیی هاوسەرکاریی هاوڕێیەتی...... تاد زۆربەی لەسەر بنەمای وێنەیە کە هەردەم بەوێنەی یەکتر دەژین بۆیە قەد ناتوانین جەوهەری یەکتر ببینین. بەڵکو هەر ناشیانەوێت یەک

کـەشف بکەن. چونکە کـەشـفکردن شکان و رووخـانی وێنەیە. گـەر کـەسـێک شارەزابێت لە دروستکردنی ئەو وێنەیەدا کە کۆمـەڵگە دەیەوێت ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانێت پانتاییەکی زۆر داگیر بکات لە زەینی کۆمەڵگەدا. دروستبوونی هۆگری مرۆڤ بۆ وێنەی خـۆی سەرەتای هەڵخلیسکان و ونبوونی مـرۆڤە لەناو ئەوی تردا. چونکە پەرستنی وێنە پێویستی بەقوربانی هەیە ئەویش کوشتنی خۆتە بۆ ئەوی تر. ئەو حوکمەی وێنە دەیکات حوکمێکی خێرایە بەڵام بێ جەوهەرە. هەر بۆیە هەر سـەردەمـە و وێنـەیەک سـەردەکـەوێت و یەکـێکی تر لەناو دەچێت. ئەمـڕۆ مـرۆڤ سـەرقـاڵە بە پاراستن و دروسـتکردنی وێنەوە. کـەم هەیە سـەرقـاڵی جـەوهەر و چییـەتیی وێنـەکان بێت. ئاین کاتێک کولتووررێژ دەکرێت. هێزی خـۆی لەناو ئەو وێنانەدا هەڵدەگرێت کە دروستـیـان دەکات. نوێژ و ڕۆژوو و..... تاد بوونەتە وێنە، کە بەرجەستەکردنەوەی ئەو وێنەیە ئەنجامدانی خواپەرستییە. نەک بیرکردنەوە لە جەوهەری وێنەکە.

هەر ئەمەشە وای کردووە جەوهەری دینەکان بزر بن و وێنەکان وەک کولتوورێک ببنە دین و جێگەی جەوهەر بگرنەوە. خەتەری وێنە ئەوەیە کە مرۆڤ کوێر دەکات. چونکە ئیتر ئەو وێنەیە خۆی دەکاتە نوێنەری جەوهەری ئەو شتە و ڕازیش نییە کە جـارێکی تر جـەوهەرەکـە کـەشف بکرێتـەوە و لە وێنەیەکی تردا دەرکـەوێت. خۆبارکردنی ڕابردوو لە وێنەکاندا هەموو بوارەکانی گرتووەتەوە وەک ئەکادیمیا. کـە کـۆمـەڵێک وێنە کـراونەتە مـەرجی بەئەکـادیمیـبـوونی لێکۆڵینەوەکـان وەک کۆکردنەوەی سەرچاوە و عەمبارکردنی ڕا و... تاد.

پرسـیـارەکـە ئەوەیە بۆچی وێنـە زوو دەڕوات و جـێگە داگـیـر دەکـات لـە زەینی مـرۆڤ؟ ڕاستی ئەوەیە کـە وێنە شـتێکی بەرجـەسـتـە و هەست پێکراوە خـەیاڵ دەتوانێت وێنای بکات. بەڵام بیـرکـردنەوە و جـەوهەر بەرجـەسـتـە نـین و نادیارن بیرکردنەوە بەمانـا ڕەسەنەکەی بوار سازانە بۆ ئەوەی شتێکی نائامادە و شاراوە ببێتـە شـتێکی ئامـادە و حـازر. ئەوەی پێوەندیی بە مـرۆڤـەکـانـەوە هەیە ئەوەیە کە هەردەم منی خـۆیان غاییە لەگەڵ یەک و وێنەکانیان حازرن. بۆیە مـرۆڤ هەست بە دووبارەکردنەوە و ئاسـاییبـوونەوەی شـتـەکان دەکات و هەردەم خـەون بە گۆڕان و ژیانێکی ترەوە دەبینێت کـە ڕابردوو نەبێت و دووبـارە نەبێـتـەوە. کـە مـرۆڤ ناشـزانێت هـەر خـۆی دەتوانێت ئەوە بکات بەڵام وێنـە و سیـحـری وێنە کـوێری

کردووە و ناهێڵێت بیر بکاتەوە. چونکە وێنە بەردەوام وەک موقەدەس و پیرۆز سەیر دەکرێت دەستبردن بۆی بە گوناه و تاوان دەزانرێت.

نموونەی دووەم/ پێوەندیی وێنەییی نێوان مرۆڤ و دەوروبەر:

لە باسکردنی پێوەندیی نێوان مرۆڤ و دەوروبەردا دەبێت دوو جۆر دەوروبەر جیاب کەینەوە ئەوانیش سروشت و شارستانین. سروشت ئەو جیهانەیە کە پێش مرۆڤ خوڵقاوە و شارستانیش ئەو جیهانەیە کە مرۆڤ خۆی خوڵقاندوویەتی. دیارە گەورەترین جیاوازیی نێوان سروشت و شارستانیەت ئەوەیە گەر سروشتمان ڕووخاند ناتوانین چاکی بکەینەوە. بەڵام گەر شارستانیەت ڕووخا ئەوا دەتوانین وەک خۆی و باشتریش چاکی بکەینەوە. جا کاتێک مرۆڤ دەکەوێتە مامەڵە لەگەڵ سروشتدا لەسەر بنەمای وێنە ئەوا دەکەوێتە بەردەم چۆنایەتییەکی شێوە گیرکراو و تەواوبوو. مرۆڤ لەگەڵ یەکەم بەرکەوتنیدا لەگەڵ سروشت دەکەوێتە بەردەم ئەو فۆرمە دەرکەوتووەی سروشت کە هەیە. ئەوەش لەم پێوەندییەدا چالاکە هەستەکانی مرۆڤە. هەستەکانی جەستەی بایەلۆجی مامەڵە لەگەڵ جۆری شتەکان دەکات و خاسیەت دەپشکنێت. دیارە ئەم هەستانە هاوبەشن لە نێوان مرۆڤ و گیانەوەردا چونکە ئەوانیش تێ دەگەن لە زبری و کەرەستەی شتەکان. مرۆڤ و گیانەوەر گەر بخرێنە ناو ئاوەوە هەردووکیان جەستەیان هەست بە ئاو دەکەن دەکەونە مەلەکردن و خۆقوتارکردن. بەڵام مرۆڤ دێت بە ئەزموون خاسیەتی مادەکان دەزانێت وەک ئەوەی ئاو لە پلەی سەدی دەکوڵێت، بەڵام گیانەوەران ناتوانن بێنە ئەو شوێنە و لێرەدا دەوەستن. هەروەها مرۆڤ لە پاڵ ناسینی خەسڵەت و سیفەتی شتەکاندا بواری هەستی جەستەش فراوان دەکات بۆ نموونە گواستنەوە بە ئۆتۆمۆبێل یان تەلسکۆب... تاد.

لە پاڵ هەستەکانی جەستەدا هەستەکانی دەروونیش هەیە کە ئەویش خەیاڵ وەک یەکەیەک حزووری هەیە. خەیاڵ لە پاڵ جەستەدا کار دەکات بەڵام خەیاڵ کاری بەسەر کەرەستەکان نییە خەیاڵ وێنە و فۆرم و چۆنایەتی هەست پێ دەکات و دەیگوازێتەوە بۆ ناو یادگە. لێرەدا وا باشە باسی خوڵقانی مادە بکەین جا هی دنیای سروشت بێت یان شارستانی. هەر شتێک کە دەخوڵقێت یان دروست دەکرێت پێویستی بە دوو کاتێگۆری هەیە. ئەوانیش کەرەستە و فۆرمە (وێنە).

کەرەستەکە لە خزمەتی دەرخستنی وێنەکەدایە و بنەمای هەردووکیشیان ئایدیاڵەکەیە. مرۆڤ کە ئەو شتە دەناسێت کەرەستە و وێنەکە خەزن دەکات لای خۆی. چونکە هەردووکیان بەرجەستەن. کاتێک مرۆڤ لەسەر بنەمای کەرەستە و وێنە مامەڵە دەکات دەکەوێتە ڕابردووەوە چونکە هەردووکیان دەرکەوتەی چییەتیی شتێکن. کەرەستە و وێنەش هەردەم قابیلی گۆڕانن و ناتوانن ئەو شکڵەی خۆیان بپارێزن. واتە بەپێی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت. بەڵام جەوهەر ناگۆڕێت هەردەم لە شوناسدایە لەگەڵ خۆی. مرۆڤ گەر بیری چوو بۆ بەردەم کەرەستە و وێنەکە جەوهەرەکە بزر دەکات. سروشت کارێکی خوڵقاو و تەواو بووە هەم کەرەستەی هەیە و هەم وێنە. گەر مرۆڤ بیەوێ هەقیقەتی سروشت بدۆزێتەوە ئەوا دەبێت لەناو چییەتیدا بگەڕێت نەک کەرەستە و وێنەکان. لێرەدا فەلسەفە دەبێت بەهەڵگری هەقیقەت و زانستیش بەهەڵگر و لانەی ڕا و ناسەقامگیری. هەقیقەتی ئەو شتە لەو هارمۆنییەتەشدا نییە کە لەگەڵ شتەکانی دەوروبەر هەیەتی وەک (بنیاتگەرەکان) گوزارشتی لێ دەکەن. بگرە هەر لەناو خۆیایەتی. شیعری ڕاستەقینە و هونەریش بەمانا هایدگەرییەکەی تەواو خۆپارێزن لەوەی مامەڵە بکەن لەگەڵ کەرەستە و وێنەی شتەکاندا. چ فەلسەفە چ شیعر و چ هونەر جارێکی تر شتەکان دەخوڵقێنێتەوە چونکە جەوهەرەکان بەناو بواری لەدایکبوونەوە دەبن و جارێکی تر کەرەستە و وێنەی تر دەدۆزنەوە بۆ هەڵگرتنی جەوهەر. چونکە هاتنە ئارای جەوهەر پێویستی بە کەرەستە و فۆرم هەیە.

مرۆڤ بەدەر لە چییەتی و جەوهەر کاتێک مامەڵە لەگەڵ کەرەستە و وێنەی شتەکان دەکات. هەردەم لە ڕابردوودا دەژیت و هەردەم لە بەردەم دووبارەبوونەوەی شتەکاندایە. هەردەم ناگاتە هەقیقەتی شتەکان کە ئەمەش زۆر ڕوو دەداتەوە لە ژیانی خۆیدا ئیتر تووشی بێ مانایی دەبێت.

چونکە دەستی ڕاناگات بە هەقیقەت و سێبەر ئەزموون دەکات. ئەفلاتون کاتێک جیهان بە سێبەر دەزانێت ئەم مامەڵەی مرۆڤە کە هەموو کات هەقیقەت و جەوهەر بزر دەکات. چونکە وێنە نوێنەری هەقیقەتی شتەکانە نەک جەوهەر. جیهانی ئایدیاڵ و جیهانی هەقیقەت لای ئەفلاتون نە ئاسمانە و نە ئەفسانەیە و نە خەیاڵی پووچە. کە بەداخەوە کایەی ڕۆشنبیری و ئەکادیمیی ئێمە ئەم ڕایانەیان چەسپاندووە لە زەینی خوێنەردا. کە ئەمەش نەک هەر تێنەگەیشتنە لە ئەفلاتون

بەڵکو غەدرێکی گەورەیە لە فیکر و مەعریفە. کاتێک مرۆڤ بەڕاستی بیر دەکاتەوە ئەوە دەدۆزێتەوە کە جیهانی ئایدیاڵ هەر جەوهەرە و لەناو خۆماندا دەیدۆزینەوە و خۆمان دەتوانین ئەو جیهانە واقیعی بکەینەوە. ئەوە دووریی مرۆڤە لە عەقڵەوە کەوا دەزانین عەقڵ لە ئاسمانە و لە زەویدا نایدۆزینەوە. ئێستا کەم تا زۆر لەو دوو نموونەدایە پێوەندیی مرۆڤمان ڕوون کردەوە لەگەڵ خۆی و دەوروبەردا کە زیاتر جەستەی بایەلۆجی تیایدا چالاکە. ئێستا با بچینە سەر نموونەیەکی تر کە مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم وێنەی چەمکەکان.

نموونەی سێیەم/ مرۆڤ و وێنەی چەمکەکان:

باسکردنی چەمک و ڕاڤەکردنی کارێکی زۆر قورس و هەڵگری کۆششێکی زۆرە، چونکە چەمک تەواو پێوەستە بە بیرکردنەوە. واتە بەبێ بیرکردنەوە ناتوانین باسی چەمک بکەین. چونکە چەمک وشە نییە بەڵکو بیرکردنەوەیە، واتە بیرکردنەوە کاتێک دەگاتە قووڵاییی خۆی و درک بەخۆی دەکات چەمک وەک کۆگایەک ئەم بیرکردنەوەیە وەک جەستەیەک هەڵدەگرێت لە خۆیدا. لێرەدا چەمک جیا دەبێتەوە لە وشە. وشە بەکار دەهێنرێت بەڵام چەمک بازاڕی نابێتەوە و ناتوانرێت بەکار بهێنرێت. خۆ گەر بەکار هێنرا ئەوا بیرکردنەوەکەی لێ داماڵراوە و وەک وشەیەک ماوەتەوە. لەناو کایەی ڕۆشنبیری و ئەکادیمیدا ئێمە خاوەنی چەمک نین چونکە خاوەنی بیرکردنەوە نین. ئەوەی هەیە هێنانی لێشاوێک چەمکە لە دنیای ئەوروپایی و عەرەبییەوە بۆ ناو کایەکان. کە چەمکەکان بوونەتەوە وشە. چونکە ئەوەندەی گرینگی دراوە بە چۆنایەتی چەمکەکان گرینگی نەدراوە بەو بیرکردنەوەیەی لە پشت ئەو چەمکەوە هەیە. کایەکانی ئێمە دەیەوێت بەناوهێنانی چەمکەکە گوزارشت لە بیرکردنەوە بکات. بەڵام نەک هەر نەیتوانیوە بەڵکو چەمکەکەشی کوشتووە و کردوویەتەوە بە وشە و بەکاری هێناوە.

بەڵام گەر هاتوو مرۆڤ کەوتە مامەڵە لەگەڵ جەوهەری چەمکەکاندا کە چییەتییە خودی بیرکردنەوەیە، ئەوا هەر تەنها ناگاتە قووڵیی تێگەیشتن بگرە گەر هاتوو بیرکردنەوەکەی قووڵ و ڕەسەن بێت ئەوا ئەمەش بە زمانی خۆی چەمکێک دەخوڵقێنێت. یان هەمان چەمک بەکار دەهێنێتەوە بەڵام ناوهێنانی ئەم چەمکە لای ئەو هەر وشە نییە بەڵکو بیرکردنەوەیە. کورد لەبەرئەوەی بیرکردنەوەی قووڵ و

جەوهەرگەرای نییە. چەمک و ڕێبازیشی نییە. ئێمە بە چەمکەکاندا دەزانین کام میللەت بیری کردووەتەوە. یۆنان بەچەمکەکانی خۆی بیرکردنەوەی خۆی هەڵگرتووە و زەمان دوای زەمان دەڕوات. چەمکەکانیش وەک سروشت خاوەنی کەرەستە و فۆرم و چییەتین. مرۆڤ گەر لەسەر بنەمای کەرەستە و فۆرم مامەڵەی لەگەڵ چەمک کرد ئەوا وەک بەکارهێنەری ئەو چەمکە هەیە نەک وەک خوڵقێنەری ئەو چەمکە. گەر مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ چەمکەکاندا لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە سادەیە بێت کە کۆمەڵگە هەیەتی بۆ شتەکان ئەوا ئەو مرۆڤە لە ڕابردوودا دەگوزەرێت. لە ڕابردووی (ئازادی، عەشق...... تاد) وەک چەمکدا دەژیت و ناتوانین قسەی خۆمان هەبێت لەسەریان، بەڵکو دەبێت بەردەوام لەسەر قسەی ئەوی تر ئێمەش قسە بکەین. ئەمەش حەرامبوونی پرسیاری (ئەوەی کە..... چییە؟) لەناو فەزای بیرکردنەوە و ڕۆشنبیریدا.

مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا دەبێت بەرهەمهێنەرەوەی هەمان مانای چەمکەکان بێت کە کۆمەڵگە هەیەتی. چونکە کۆمەڵگە لەسەر ئاستی وێنەی وەستاو و کەرەستە، کە شتانێکی بەرجەستە و هەستپێکراون مامەڵە دەکات لەگەڵ چەمک و ماناکاندا. بەڵام هەرچی فەلسەفەیە لەگەڵ جەوهەر و چییەتیی شتەکاندا مامەڵە دەکات هەر بۆیە بەزانستی چەمکەکانیش ناسراوە. ئەم مامەڵەکردنی وێنەییە لەگەڵ چەمکەکاندا هاتووەتە ناو دین و کۆمەڵگە و زانست و..... تاد) ئەمڕۆ دەقە ئاسمانییەکان وەک (قورئان و ئینجیل و..... تاد) وەک وشە خەڵک مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و بەکار دەهێنرێت چونکە مرۆڤ ناگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرکردنەوەیەی لە پشت ئەم دەقانەوە هەیە.

بۆیە ڕا دروست دەبێت لەسەر قورئان و تەفسیر و.... تاد لە کاتێکدا مرۆڤ دەبێت وەک بیرکردنەوە مامەڵە بکات. واتە دەبێت وا بکەین ئەو دەقانە جارێکی تر بکەونەوە حاڵەتی خوڵقان و دابەزین و لەناو عەقڵی خۆماندا بیاندۆزینەوە. ئەو کاتە لە هەقیقەتی ئەو دەقانە دەگەین کە چین. هەر بۆیە باشترین ڕێگە ئەوەیە مرۆڤ ڕازی نەبێت بەوەی لەوانی ترەوە شتەکان بزانێت. چونکە لەم بارەدا مرۆڤ ئەو نوێنە و قەد خۆنوێن نییە و هەردەم جەستەی خۆی دەکاتە ماڵی غەریبان و غەریب لەناو جەستەی ئەودا دێن و دەچن و جەستەی ئەم وەک دەفرێک ئەوان دەگرێتە خۆی. پرسیارکردن لەسەر چییەتیی چەمکەکان. قورسترین پرسیارێکە ئاراستەی

مرۆڤ دەکرێت. چونکە بیرکردنەوە و دۆخی بیرکردنەوە حازر نییە بۆیە ناتوانین بکەوینە ناو وەڵامدانەوەی پرسیاری (ئەوەی کە..... چییە؟) پرسیارێکە بیرەوەری ناتوانێت کۆمەکمان بکات بۆ وەڵامدانەوە. بگرە بەتەنیا بیرکردنەوە توانای هەیە لەگەڵ ئەم پرسیارەدا بڕوات.

چونکە ئەم پرسیارە لەناو بوونی مرۆڤ خۆیەتی. بەکردنی ئەم پرسیارە لە خۆمان ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بیرەوەری چەند سادە و بێ بنەمایە لەسەر مانای شتەکان. دیارە پرسیاری چییەتی هەردەم کۆتاییی خۆی بەوە دەهێنێت کە دواتر چەمکێک هەیە لە دوایەمین هێڵی گشتیی ئەو بیرکردنەوەیەدا دەخولقێت. واتە چەمکەکە گشتیترین بنەمای ئەو شتەیە لە خۆیدا. لەویادا ئەو بیرکردنەوەیە وەک هەبوویەک دێتە ناو جیهانەوە. ئەم سێ نموونەی سەرەوە سێ نموونەن کە توانییان تا ڕادەیەک خەیاڵ شی بکەنەوە و لە وردەکارییەکانی ئاگەدار بین. هەرسێ بارەکەش چ سروشت و شارستانی یان مرۆڤ و چەمکەکان. دەتوانین بەخەیاڵکردن و بەخەیاڵداهاتن بێنە ئاراوە و دوور بکەوینەوە لە جیهانی هەقیقەت و وا بزانین لە ئاسمانە و ئێمە دەستمان پێڕا ناگات.

**٥- خەیاڵگۆڕکێ:**

لە دوو بەشی پێشوودا باسی دوو کاری گرینگمان کرد لە خەیاڵ ئەوانیش خەیاڵکردن و بەخەیاڵداهاتن بوون. هەردوو حاڵەتەکەش بۆ شتی بەرجەستە بوون جا واقیع یان بیرەوەری بوون. لە هەردوو بارەکەدا چ لە دەرەوەی جەستەی مرۆڤ بێت یان ناوەوەی جەستە. یەک شت هەیە دەیکات ئەوانیش حازرکردنەوەی ئەو شتانەیە کە هەن. لێرەوە گەیشتینە ئەوەی خەیاڵ بخەینە ژێر باری دەروون کە بەتەنها مامەڵە لەگەڵ حاڵەتی ڕابردووی شتەکان دەکات و ناتوانێت درک بەشتانێک بکات کە هێشتا دەرنەکەوتووە.

ئەم کارەی تری خەیاڵ کە ناومان ناوە خەیاڵگۆڕکێ هەمووی لەناو بیرەوەری روو دەدات. کە یادگە شوێنی بیرەوەریی مرۆڤە جا بیرەوەری هەیە داهاتووە واتە مرۆڤ زۆرجار بەخەیاڵ ژیانی داهاتووی خۆی دروست دەکات. ئەم حاڵەتەش وەک بیرەوەری لە یادگەدا هەیە. هەموو بیرەوەرییەکان لە یادگەدا یەک جۆر نین بگرە هی شوێنی جیا و سەردەمی جیان. جا خەیاڵگۆڕکێ سەفەری مرۆڤە هەر لەناو

بیرەوەریدا. لە نێوان بیرەوەرییە جیاجیاکاندا زۆرجاریش مرۆڤ دەستکاریی وێنە و بیـرەوەرییـەکـان دەکـات هەتا شـوێنێک دەدۆزێتـەوە لـەناو خـۆیدا کـە زۆرجـار بیرەوەرییەکان کۆلاژ دەکات.

ئەم حاڵە کاتێک دەرەکی کراوەتەوە لەناو نووسیندا بەتایبەت ئەدەب و شیعر. زۆرجـار بەداهێنـان زانراوە و وەسف کـراوە. بـەڵام ئیـشکردن بەم جـۆرە لـەناو بیرەوەریدا ئیشکردنە لەناو شارێکی مردوو کە شتەکان وەستاون و چییەتی بزر بووە. بەڵام ئەم کۆلاژکـردن و دەسـتکاریکردنە سـیحری خـۆی هـەیە لە مرۆڤ. کە مـرۆڤ چێـژ وەردەگـرێت لەوەی توانـیویەتی شـتێکی تر دروست بکات یان شـتی ناواقیعی بهێنێتە ئاراوە کە بەجیاوازی و داهێنان گوزارشتی لێ کراوە.

لە کـاتێکدا تێکشکان و داڕشـتنەوەی ئـەو دنیـا مـردووە بـەبێ هیچ جـەوهـەر و بیرکردنەوەیەک. مرۆڤ دەستکاری شتەکان دەکات و لەژێر سیحری کەرەستەکاندا کار دەکات. با بپرسـین ئاخۆ مرۆڤ بەم گەڕانەلە بیرەوەریدا چی لێ دێت؟ ئاخۆ ژیانێکی نوێ دەدۆزێتەوە ؟ ئاخۆ ئەمە دوایەمین شوێنی مرۆڤە کە کۆچی بۆ بکات؟ ئەگەر لە دیدی ڕۆشنبـیری کـوردی و بەتایبەت دوای ڕاپەڕین سـەیری ئەم باسـە بکەین دەبێت لێرەدا بوەستین و تەواو. بەڵام گەر بڕۆین و سـەیری فـەلسەفە بکەین ئەو کات نموونـەی (کۆمـار، مـەملەکـەتی خوا، دەوڵـەتی عـەقڵ و... تاد) دەبینین کە خـۆیان لەسـەر ڕابردوو بنیـات نانێن. پرۆسـەکـە لە یادگـەدا نیـیـە کـە بیـرەوەری دروست بکەن و بەهەشت بـنیـات بنێن. بگرە لێـرەدا دەڕۆنـە دەرەوەی بیـرەوەری و عـەقڵ دێنن. کـە بەپێی بنـەمـاکـانی عـەقڵ شـتـەکـان دابەش دەکـەن. بـەڵام بۆ پرسـیـارەکـەمـان ئەوەمـان زانـی گـەڕانی مـرۆڤ بەناو بیـرەوەریدا فـرێدان و پێکەوەگـونجـان و کۆلاژکـردنیـان بوو. ئەمـەش دەکرێت هـەر لەناو یادگـەدا بێت و دەکـرێت ئەمـە دەرکی بکرێتـەوە لـە فـۆرمـی حـیکـایەت و چیـرۆک و ڕۆمـاندا یان نووسین بەگشتی. بەڵام پرۆسەکە لە هەردوو بارەکەدا ڕابردووە بەڵام چۆن؟ دیارە مـرۆڤ یادگەی پڕە لە بیرەوەری و بیرەوەرییـەکانیش ڕووداوی دوایی ڕوودانن کە وەک مـێـژوو مـاونـەتەوە. کـاتێک دەکـەوینە نـاو خـەیاڵگـۆڕکـێـوە دەکـەوینـە ناو دووبارەکردنـەوەی مێژوو بەبێ هیچ بنەمـا و جـەوهـەرێک. با نموونەیەک وەربگرین گـەر سـەیری زمـان بکەین دوو حـاڵەت هـەیە حـاڵەتی یەکەم ئەوەیە مرۆڤـەکە یادگـەی پڕە لە کـەرەسـتـەکانی زمـان کـە لە کـۆمـەڵگەوە وەرمـان گرتووە. کـاتێک ئێـمـە قسـە

دەکـەین لەبارەی ڕووداوێکەوە کـە ڕووی داوە یاخـۆ لە بازاڕ قـسـە دەکـەین ئەو ڕستـانـەی دەیانڵێین هەمـووی تازەن و بێ بیرکردنەوە ئێمـە دەیانهێنینە دەرەوە. لێرەدا بە تەنیا وشـە ڕیز دەکەین بەشێوازێکی تر و هیچ نییە بیڵێین. ئەم حاڵەتی زمانە هەمـان ئەو خـەیاڵگۆڕکێیە. حاڵەتی دووەمی زمـان هەیە کـە مـرۆڤ فیکرێک ئاشکرا دەکـات جـەوهـەر و دنیـایەک هەیە والا دەبێت. لێـرەدا زمـان وەک کەرەستەیەک کە هەیە دادەڕێژرێتەوە بەڵام لەسـەر بنەمای ئەو بیرەی هەیە. لە پاڵ ئەمـەشدا جـارێکی تر زمـان لەدایک دەبێتـەوە چونکە زمـان دەخوڵقێت. ئەمـەش مـانای جیاوازی و داهێنان لە خـۆی دەگرێت و ئەم تازەیە جیـاوازە لـەو تازەیەی حاڵەتی یەکەم. کە زیاتر زمانی ڕۆژانە دەگرێتەوە.

حاڵەتی دووەم زیاتر لە فـەلسـەفـە و شیـعر ڕوو دەدات. لەم نموونەیەدا شـتێک هەیە ئاشکرا دەبێت ئەویش ئەوەیە کە خەیاڵگۆڕکێ نامانباتە سەر دنیایەکی تر و جیهانێکی تر. بگرە هەمان ئەو جیهانەیە بەس فۆرمەکەی گۆڕاوە. کە سەیری ئەم باسـە دەکەین زۆرجـار خـەمی گەورەمـان دێتـە ڕێ چونکە ئەم نووسینـە هەڵگری خـەمێکی گەورە و ئافاتێکی گەورەشـە. چونکە لەگەڵ خـۆی عـەبـەسیـەتێکی قووڵ دەهێنێت و هەردەم بە بەڵگەوە قـسـە لەسـەر بە وەهمـبـوونی دنیـا دەکـات. بەڵام هەمووی لە پێناو هەقیقەتێکی گەورەدایە کە عەقڵە. هەر ئەوەشـە بەڵگەمان دەداتێ لەسـەر بێ مـانایی شـتـەکـان. بەڵام مـادام ئێمـە مـرۆڤین با شـیـمـانەکـان تاقی بکەینەوە. بە شـیـمـانەی فەلسـەفـەشـەوە زۆر باشـترە گـەر هیـچمـان دەس نەکـەوێت وەک لەوەی هەر لە دوورەوە ڕەفزی بکەین و نەزانین چییە؟

بۆیە ئەم نووسینە ڕاستە نووسینێکی زۆر خەمهێنەرە، بەڵام هەوڵە بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و لە جیهان.

**٦- ژیانی خەیاڵی چییە....؟**

ئەو بزربوونەی مـرۆڤ ژیانی خـەیاڵییـە. کـە مـرۆڤ بزر دەبێت لە واقـیع و دەچێتـەوە ناو خۆی. دەروون مرۆڤ وابەستـە دەکات بە خەیاڵەوە. پاشـانیش مرۆڤ ڕۆحی هـەیە. ژیانی ڕۆحی و ژیانی خـەیاڵی هەردووکـیـان بـارکردنن لە واقـیع و بزربوونی مـرۆڤـە لە واقـیع، بەڵام بە جیاوازیی بنەمـاکـانیان. لێ گـەر لە دوورەوە سەیریان بکەین هەردووکیان دابڕانن لە واقیع. مرۆڤ زۆرجار دەچێتـەوە ناو خۆی

و دەچێتەوە ناو حیکایەتی جیاجیا لەناو یادگەیدا. جا یان خەیاڵ دەکات یان بەخەیاڵیدا دێت یان خەیاڵگۆڕکێ ئەنجام دەدات.

ژیانی خەیاڵی و بیرەوەری بەشێکی گەورەی ژیانی مرۆڤ پێک دەهێنێت. چونکە مرۆڤ هەر بەوەندە ڕازی نییە کە لە واقیعدا هەیە. بەڵکو هەوڵیشی هەیە بۆ خۆبزرکردن لە واقیع. هونەرەکان بەتایبەت مۆزیک هەوڵێکی گەورەیە بۆ بزربوون لە واقیع. مادە بێهۆشکەرەکان و... تاد تەنانەت تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت. بە دەرککردنەوەی یادگەی مرۆڤە کە مرۆڤ دادەبڕن لە واقیع و وێنە دەکرێتە ژیان. چونکە مرۆڤ لە ناوەوەی خۆیدا سەیری وێنەکان دەکات بەڵام T.V بۆی دەرکی دەکاتەوە و جەستەی بایەلۆجیش جارێکی تر بەئیش دەخاتەوە. ئێستا با ئەوە بپرسین بۆچی واقیع بەو ڕاستەقینەی خۆیەوە مرۆڤ ڕازی ناکات ؟ بۆچی مرۆڤ هەوڵی خۆبزرکردنی هەیە لە واقیع ؟ مرۆڤ هەڵگری توخمێکی خواییە، ئەویش ڕۆحە. ئەم توخمە خواییە مرۆڤ توشی عەبەسیەت و تەنیایی دەکات کە وەک ڕۆشناییەک وەهمیەتی شتەکان بە مرۆڤ دەڵێت و تووشی غایببوونی دەکات لە واقیعدا. واتە لەگەڵ ئەوەی مایەی خۆشبەختیی مرۆڤە بەڵام مایەی ئافەتی مرۆڤیشە. گەر مرۆڤێک بیەوێت هەر بە جەستە و سایکۆ بژیت و تەنیا نەبێتەوە دەبێت هەر لە سەرەتاوە ئەم توخمە خواییە فڕێ بدات و ئەو شێوە ژیانە بژیت کە خەڵک لەسەری دەژیت و ژیاوە. ئەوروپا و یۆنانی کۆن ئەگەرچی یەکەمین وێستگەی لەدایکبوونی فەلسەفەن بەڵام ئەوەتا ئێستا وازیان هێناوە لەو عەبەسییەت و تەنیایە و ئەو ژیانەیان هەڵبژاردووە کە ئێستا هەیە. کە زیاتر ژیانێکە جەستە و سایکۆلۆجیا تیایدا دەرکەوتووە و خۆیان تێر دەکەن. ئێ فەلسەفەش ڕێگە نادات جەستە و سایکۆلۆجیا بەتەنیا برۆن و حوکم بکەن. ژیانی خەیاڵیی مرۆڤ هەر بە تەنیا بیرەوەری ناگرێتەوە بگرە (خەو- زیندەخەو)یش دەگرێتەوە کە زۆر بەکورتی هەوڵ دەدەین باسی بکەین، چونکە ژیانی خەیاڵی زۆر فراوانە و ناتوانین کۆنترۆڵی بکەین.

٧- خەو :

وەک ئاشکرایە خەو بەشێکی زۆری ژیانی مرۆڤ پێک دەهێنێت. ئەمەش هەموو ئەو ڕووداوانەیە کە مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە کاتی خەوتندا. ئەوەش لەم

ڕووداوانەدا چالاکە دەروون و خەیاڵی مرۆڤە، کە وەک پانتاییەک دەبنە ڕووتەختی ڕووداوەکان. خەوەکانی مرۆڤ بەشێکی گرینگی بیرەوەریی ژیانی خەیاڵی مرۆڤن. مرۆڤ زۆرجار لە واقیعیشدا دەچێتەوە ناو خەوەکانی و دووبارەیان دەکاتەوە. خەویش خۆی شتێکی نامۆ و سەرنجڕاکێشە. مرۆڤ زۆر هەوڵی هەیە بۆ تێگەیشتن لە خەو. خەو خۆی کۆمەڵێک ڕەمز و کەرەستەی جیاجیایە بۆ دەربڕینی مانایەک. واتە ئێمە یادگەمان پڕە لە وێنەی شوێن و کەس و شت.

هەموو ئەم شتانە وەک کەرەستەیەکی خاو دەچنە بەردەستی ئەو خەوەی ڕوو دەدات. خەوەکە ئەم کەرەستانە ڕێک دەخاتەوە و ئەو ڕووداوەی پێ حازر دەکاتەوە کە هەیە. هەربۆیە هەردەم خەو خاسیەتێکی شیعریی هەیە کە لەناو ڕەمز و وێنەدا ڕوو دەدات. جا بەپێی جۆری خەوەکان کەرەستەکان ڕێک دەخرێن، چونکە خەو جۆری زۆرە. خۆ ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە خەوەکانی مرۆڤ چەند جۆرن ئەوا دەبێت سەرەتا شوێنی ئەو خەوە بزانین و لە ڕێگەی ئەو سەرچاوانەوە دەتوانین خەوەکان دابەش بکەین و تێی بگەین. پرسیارێکی سادە هەیە ئەویش ئەوەیە بۆچی مرۆڤ خەو دەبینێت ؟ بۆچی خەو دەبێتە تەفسیری شتانێکی ترە؟ گەر سادەترین وەڵام بدەینەوە ئەوا ئەوە دەڵێین کە پێوەندیی گەورە هەیە لە نێوان جەستە و دەروون‌دا کە پێویستییان بەوەیە هاوسەنگیی یەکتر بپارێزن. چونکە (نووستن) بەتەنیا پێویستییەکی جەستەیی نییە بگرە پێویستییەکی دەروونی و ڕۆحیشە. واتە (نووستن) غیابی مرۆڤ نییە لە دنیادا بگرە حزووری مرۆڤە لە دنیادا، بەڵام لە شێوازێکی تردا و لەسەر تەختی خەیاڵ مرۆڤ پێوەندی دەبەستێت بە دنیاوە. بەڵام کۆمەڵە پرسیارێک هەن کە بەهەڵواسراوی دەمێننەوە. ئەمەش ئەو پرسیارانەن خۆیان هەڵدەگرن هەتا وەڵامی خۆیان دەدۆزنەوە. لێرەدا ئێمە ئەو جۆرانەی خەو دابەش دەکەین ئەوەندەی ئێمە درکمان پێ کردووە.

(١-٧) خەوی جەستەیی:

سیگمۆند فرۆید لە کتێبی (لێکدانەوەی خەونەکان)دا زۆر بەوردی باس لەم جۆرە خەوانە دەکات کە پێوەندیی هەیە بە جەستەی بایەلۆجییەوە. دەروون بە هانای مرۆڤ دێت بۆ پاراستنی هاوسەنگیی خۆی. نموونەی زۆر دەهێنێتەوە.

"ئەمرۆ خەریکە هەمووان باوەڕ دێنن بەوەی وریاکەرەوە جەستەییە ئۆرگانەکان

کاریگەرییان هەیە لە پێکهێنانی خەوندا"[٣٢]

دیارە بەشێکی زۆری خەو وابەستەیە بە جەستەی مرۆڤەوە. جەستە هەر کاتێک تووشی پەشێوی دەبێت یان حاڵەتێکی نائاسایی ئەمە وەک رووداو روو دەدات و تەفسیر دەبێت لە خەودا. گەر مرۆڤ لە کاتی نووستندا میزی بێت ئەو کاتە لە خەودا دەچێتە سەرئاو و میز دەکات. کە زۆرجار منداڵان ئەم حاڵەتەیان لێ تێک دەچێت لەگەڵ واقیعدا و تووشی میز بەخۆداکردن دەبن. بەڵام لە گەورەکاندا جەستە ناچێتە ژێر ئەو بانگەی کە خەوەکە دەیداتێت.

"دڵۆپێک ئاو بەسەر گۆنایدا رژێنرا. لە خەونیدا لە ئیتاڵیا بوو شەرابی ئۆرڤیتۆی دەخواردەوە و سەرتاپای عارەقاوی بوو."[٣٣]

لە راستیدا فرۆید زۆر نموونەی هێناوەتەوە کە ئەم خەوە وابەستەیە بەجەستەوە هەروەها زۆر بەوردی دابەشی کردووە و پۆلێنی کردووە بۆیە ئێمە لێرەدا زۆر ناچینە ناو وردەکارییەوە. چونکە هەرگیز وەک فرۆیدمان پێ ناکرێت. بەڵام ئەوەندە هەیە لە خەوی جەستەییدا دوو هۆکار هەیە هۆکارێکیان پێوەندیی هەیە بە ئەندامەکانی دەرەوەی جەستەی مرۆڤ وەک ئەو نموونانەی سەرەوە فرۆید باسی کردوون. ئەوانی تر پەیوەستە بە ئەندامەکانی ناوەوەی جەستەی مرۆڤ وەک گەدە، گورچیلە... تاد ئەم جۆرە لە خەوە هیچ مانایەکی نییە بەتەنیا بگرە خەوەکە خۆی بە خەوبوونی ئەو گۆڕانەیە کە روو دەدات لەناو جەستەی بایەلۆجیی مرۆڤدا. کە مرۆڤ لە نووستندایە و ناتوانێت راستەوخۆ لە واقیعدا ئەو گۆڕانە چارەسەر بکات یان شتێک بکات. ئەوا لە خەوەکاندا ئەو کارە ئەنجام دەدات.

(٢-٧) خەوی دەروونی:

جیا لەوەی دەروون رووتەختێکی گەورەیە لە خەو. چونکە یادگە و بیرەوەری دوو بەشی سەرەکین لە خەون و خۆشیان سەر بە سایکۆلۆجیان. خەو بەشێکی گەورەیە لە ژیانی مرۆڤ. ئێمە باسی بیرەوەریمان کرد. کە لە یادگەی مرۆڤدا هەن بەڵام بیرەوەرییەکان دەجووڵێن و کار لێک دەکەن و روو دەدەنەوە و مرۆڤ لە واقیع دادەبڕن. بیرەوەری کەرەستەی سەرەکیی رووداوی ئەو شتانەیە. فرۆید بەدرێژاییی کتێبەکەی ئەم بەشەی کردووەتە بنەمای خەو و باسی نەخۆشییە عەقڵییەکان دەکات یاخۆ باسی ئەو خەونە دەکات کە دووبارەکردنەوەی ئەو بیرەوەرییانەن کە

پێشتر ڕوویان داوە. لە ڕاستیدا مرۆڤ خاوەنی کۆمەڵە حیکایەتێکە کە زۆرجار حیکایەت هەیە تەواو نەبووە لە واقیعدا لە خەودا تەواو دەبێت. بۆ نموونە کاتێک قوتابییەک دەکەوێتە بەر هەڕەشەی مامۆستاکەی و ناشتوانێت وەڵامی بداتەوە. ئەوا ئەم وەڵامدانەوەیە لە خەودا ڕوو دەدات.

یان ڕووداوێک هەیە لە بیرمان چووەتەوە لە خەودا بیرمان دێتەوە. ئەم خەوانە هەمووی سایکۆلۆجین و هیچ ئاماژەیەک نادەن بەدەستەوە کە مانای هەبێت، چونکە ئەم خەوە یان مرۆڤ بیرەوەرییەکان دەبینێتەوە یان کۆمەڵێک خۆزگە و ئاوات هەیە خەوەکە بۆ مرۆڤی دەکاتە واقیع لەناو خۆیدا. بۆ نموونە ئەگەر یەکێک باوکی کوژرابێت. ئیتر ئەم کوژرانی باوکەی بەچەندان خەون ڕوو دەدات. خەو هەیە باوکی زیندوو دەبێتەوە، خەو هەیە بکوژی باوکی دەکوژێتەوە یان... تاد. واتە یەک هۆ هەیە بەڵام لە کۆمەڵێک خەودا دێتەوە. ئەو جۆرە لە خەو بیرەوەریی خۆی هەیە واتە زۆرجار خەوێکمان لە منداڵیدا دیوە ئێمە هەر بیرمان ماوە.

بگرە زۆرجار گەشەکردن هەیە لە خەودا. ئەو خەوانە خەوبینەر خۆی دەتوانێت مانا و هەقیقەتیان بزانێت، واتە ئەم خەوە باکگراوندی هەیە و لە خۆیەوە ڕوو نادات. خەوی سایکۆلۆجی خەوێکی ئاڵۆزە بەڵام گەڕان بۆ سەرچاوەکەی ئاسانە، بەمەرجێک خەوبینەرەکە بۆ خۆی توانای ناسینەوەی شتەکانی هەبێت. ئەم خەوانە مرۆڤ تووشی ڕاڕایی و دوودڵی دەکەن و بەشێکی زۆری خەیاڵی مرۆڤ داگیر دەکەن. ئێمە زۆر ناچینە ناو وردەکارییەوە چونکە ڕاستیی باسەکەی ئێمە جیایە و لێکۆڵینەوە لە خەو توانا و شارەزاییی دەوێت کە فرۆید ئەم هەوڵەی بەپڕی داوە، کە خەوەکانی خۆی نووسیوەتەوە و بەراوردی کردووە و، وەک پرۆژەیەکی گەورە لە ژیانی خۆیدا سەرقاڵی بووە.

(٣-٧) خەوی ڕۆحی:

گەر سەیری ئەو دوو جۆرە خەوەی تر بکەین کە باسمان کرد ئەوە بوو لە هەردووکیاندا ڕووداوێک هەبوو ڕووی دابوو پێشتر لە خەوەکاندا ڕوویان داوە جا یان وەک خۆیان یان لە فۆرمێکی تردا. واتە کاتێک جەستەمان یان دەروونمان تووشی شتێک هاتووە، ئەم ڕووداوی تووشهاتنە بووەتە ڕووداو لە خەودا. خەویش بەو دنیا ڕەمزئامێزەی خۆی ئەمەی دەربڕیوە. بەڵام خەوی ڕۆحی ئەگەرچی فرۆید

باوەڕی بەم جۆرە خەوە نییە و ئەم ڕایەش بەڕایەکی میللی دەزانێت و دووری دەخاتەوە لە زانست.

"بیرۆکەیەکی باو هەیە دەڵێت خەون لە خولگەی داهاتوودا دەسووڕێتەوە دەتوانێت بزانێت داهاتوو چۆن دەبێت ئەو بیرۆکەیە لە ڕابردووەوە وەک باوەڕێکی میللی هاتووە"(٣٤)

"ناتوانین گفتوگۆی بۆچوونەکانی ئەم دوو پەیڕەوە میللییە بکەین چونکە لە ڕاستیدا بەهایەکی زانستییان نییە. چونکە پەیڕەوی زانستی لە سنوورێکی تەسکدا نەبێت پیادە ناکرێت"(٣٥)

بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین بە بەڵگەوە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئەم جۆرە خەوە هەقیقەتە و خەو وەک ڕووتەختێک لە توانایدا هەیە کە عەقڵ تیایدا دەردەکەوێت. واتە خەو زەوینەیەکە بۆ ئەوەی کە بنەمایەکی عەقڵی لە ناویدا ڕوو بدات و داهاتووی مرۆڤ تیایدا دەردەکەوێت. وەک خەوی پێغەمبەران بەتایبەت (یوسف- ئیبراهیم... تاد) ئەم خەوانە خەوی ڕابردووی جەستە نین خەوی عەقڵین. وەک چۆن زانستی ماتماتیک کە بەشێکی زۆری هیچ پێوەندیی نییە بە ژیانەوە، بەڵام کایەیەکە بۆ دەرکەوتنی عەقڵ. ئاوەهاش خەو کایەکە بۆ دەرکەوتنی عەقڵ. واتە ئەم جۆرە خەوە نەخشەیەک هەیە ئاشکرای دەکات. وەک دەلیل و نەخشەیەک ڕێگە بۆ مرۆڤەکان ڕۆشن دەکاتەوە. ئەم خەوانە هەر وابەستە نین بەکەسێکی دیاریکراوەوە یان پێغەمبەرانەوە نەخێر! چونکە خەو وەک چۆن موڵکی هەموو مرۆڤێکە ئاوەهاش ئەم ڕوودانە هی هەموو مرۆڤایەتییە. بەڵام کەسە بیرکەرەوە و ڕۆحانییەکان لەم خەوانە دەگەن و دەزانن چین کە مەرج نییە کتومت ئەو ڕووداوانە ڕوو بدەنەوە لە واقیعدا وەک خەوەکە. هەروەک خەوی یوسف پێغەمبەر کە ئەستێرە و مانگ بوو بەڵام لە واقیعدا پێوەندیی هەبوو بە براکانییەوە.

(فرۆید) باسی خەوی ڕۆحی دەکات بەڵام دەڵێت ناکرێتە خەوی زانستی ئەم ڕایەش تەواو ڕاستە چونکە ئەم جۆرە لە خەو کۆنترۆڵ ناکرێت و ناتوانین بڵێین کە ئەستێرە هەموو کات مانای برا دەدات.

سەیری فرۆید لەوەدایە (گرێی ئۆدیب) کە شانۆنامەیەکی (سۆفۆکلیسە) دەکاتە بنەمای یەکێ لە بیردۆزە گرینگەکانی. بەڵام خەوی پێغەمبەران ناکاتە بنەمای

بیـردۆزێک. با ئـەوەش بڵـێین کـە خـەونامـە و زانسـتی لێکدانـەوەی خـەون نـاتوانن خـەوی ڕۆحی تەفسیر بکەن. چونکە هەم زانست هەم خـەونامەکان لە یەک شـوێندا یەک بنـەمـایان هەیە، ئەویش کـۆنکرێتکردنی ڕەمـزەکـانی ناو خـەو و دیاریـکردنی مـانایانە. وەک ئەوەی (ڕۆژ) دیتن لە خـەودا مـانای دیتنی سـەرۆکە، کـە خـەونامـە باسـی دەکات.

یان گـەر یـەکێک نەخـۆشی (سـییـەکان)ی هەبوو ئەوا خـەو بە فڕینـەوە دەبینێ. هـەروەک چۆن فرۆید باسـی دەکات. فرۆید بەشـی زۆری کتێبەکەی کۆنکرێتکردنی خـەوە و دابـەشکردنی بەهـەمـان ڕێگەی خـەونامـەکـان (خـەوی پلیکانە _ ڕەمـزی میزکردن _ خەوی خەساندن لای منداڵ... تاد)[٣٦]

ئێمـە دەڵێین خـەوننامـە و زانسـتی لێکدانـەوەی خەون دەتوانن تا ڕادەیەکی باش دەقیق بن لە خـەوی جـەستـە و خـەوی سـایکۆلۆجی، بەڵام لە ئاست خەوی ڕۆحیدا کـەم توانان. بەو مـانایە نا کـە ئەم خەوە تەفسـیری نیـە نەخێـر! بگرە ئەم خـەوە دەکەوێتە ئەودیوی زانینی ئەم زانستانەوە. یاسـاکانیان ناتوانن تەحەکوم بکەن بەم خەوە و ماناکەی دەشێوێنن. مانای ئەم خەوانە لە واقیعدا ڕوون دەبێتەوە کە چییە. بەڵام پێشتر دەتوانین ئاماژەکانی هەست پێ بکەین. ئەم جـۆرە لە خەو دێتە دەرەوە لەژێر کایەی ژیانی خـەیاڵی و دەچێتە پـاڵ ژیانی عـەقڵی مرۆڤ. چونکە خـەو هیچ بەهـای کەمتر نییە لە واقیع بۆ دەرکەوتنی عەقڵ و ڕووداني.

**٨- زیندەخەو :**

لە باسی خـەودا ئەوەمـان ڕوون کردەوە کەوا خـەو بەشـێکی زۆری ژیانی خـەیاڵی پێک دەهـێنن، کـەوا ئەگـەرچی خـەو لەناو دەروونـدا ڕوو دەدات، بەڵام دواجـار وەک بیرەوەری جێگەی خۆی هەیە لە ژیانی واقیعیدا. کە باسی خەو دەکەین هەمووومان زۆر بەڕوون و بەئاشکرا دەزانین چیـیە. بـەڵام زیندەخـەو کـەمـتر جێگەی بایەخی مرۆڤـە. زیندەخـەو جۆرێکە لە خـەو بەڵام لە ئاگایدا. گـەر خـەو لە کـاتی نووسـتندا بێت ئەوا زیندەخەو لە کاتی ئاگاییی مرۆڤدایە.

دەتوانین بڵێین زیندەخەو ئەو حاڵەتانەیە کە مرۆڤ لە ژیانی واقیعی دادەبڕێت و دەکەوێتـە ناو ژیانی خەیاڵییەوە. لە کاتی بێزاربووندا دەکرێت ئێمـە لە کاتی دەرس خـوێندندا بین بەڵام لـە زیندەخـەوی ڕووداوێکدا بین یان لەنـاو پاس بین بەجـەسـتـە

بەڵام بەخەیاڵ لەناو زیندەخەودا بین. زیندەخەو گرینگیی خۆی هەیە بۆ مرۆڤ. زیندەخەو جۆرێکی غایببوونی مرۆڤە لە واقیع و حازربوونیەتی لەناو ڕووداوێکی زەینیدا.

زیندەخەو دەتوانین وەک خەو دابەشی بکەین وەک زیندەخەوێک کە پێوەستە بە جەستەی بایەلۆجیمانەوە. ئەوەی نەخۆشە لەناو زیندەخەوی ئەوەدایە کە لەشساغە ئەوەی زیندانە خەیاڵی دەرەوە دەکات. یان زیندەخەوی سایکۆلۆجی وەک ئەوانەی کێشەیان هەیە و بۆیان چارەسەر ناکرێت بەردەوام دەچنە ناو ڕووداوێکەوە کە کێشەکە چارەسەر کراوە.

یان زیندەخەوی ڕۆحی وەک بیرکردنەوە لە کۆمەڵگەیەکی ئایدیاڵی یان هاوڕێیەتییەکی نموونەیی.

کە لەو زیندەخەوەدا بیرکردنەوە پەرت دەبێت بەناو کۆمەڵێک کەرەستەی ناو یادگە و کۆمەڵێک ڕووداودا. کە لەسەر بنەمای عەقڵ شتەکان ڕێک دەخرێن و دابەش دەبن. زیندەخەو غایببوونی مرۆڤە لە واقیع و بەشێکی گەورەی ژیانی مرۆڤە. زیندەخەو هەیە وابەستەیە بەڕووداوێکی ڕابردووەوە وەک ڕووداوی یەکەم عاشقبوونی مرۆڤ. کە وەک ڕووداوێک کاتێک مرۆڤ دەکەوێتەوە ناوی دادەبڕێت لەواقیع. زیندەخەو هەیە وابەستەیە بەئێستای مرۆڤەوە هەیە بە داهاتووەوە.

وەک ئەوەی کەسێک نیازی بەکارێک هەیە پێش ئەوەی ئەو کارە بکات بەزیندەخەو ئەو کارە دەکات. بۆ نموونە کەسێک حەزی لەوەیە ببێتە مامۆستا پێش ئەوەی ببێتە مامۆستا وەک زیندەخەو دەکەوێتە ناو ڕووداوێکەوە کە بووەتە مامۆستا و دەرس دەڵێتەوە و تووڕە دەبێت. هەموو ئەمانەش جۆرێکن لە هەوڵی مرۆڤ و وەک تەجرەبە وان.

ئیتر بە کەسەکان دەگۆڕێت بۆ نموونە یەکێک کە خەیاڵی ئەوەی هەیە ببێتە مامۆستایەکی باش ئەوا سوود وەردەگرێت لە تەجرەبە زەینییەکان. بۆیە زیندەخەو زۆر بەکەڵکە بۆ مرۆڤ و ئاگاییەکە گەر خۆی بزانێت. ئێمە زۆرجار ئاگامان لە خۆمان نییە و دەکەوینە ناو زیندەخەوێکەوە مامەڵە دەکەین لەگەڵ کەسانی دەوروبەرماندا گەر توانیمان لەو ڕووداوەدا سەیری خۆمان بکەین ئەوا دەتوانین زانیاریمان دەست کەوێت لەسەر خۆمان. بۆیە تەرکیز خستنە سەر زیندەخەوەکان

وەعیبوونە بە خۆمان و بە هەڵسوکەوتمان. بەڵام کێشەی ئێمە ئەوەیە ئەو توانایەمان لە دەست داوە کاتێک زیندەخەوێک ڕوو دەدات ناتوانین سەیری بکەین، چونکە خۆمان جووت بووین لەگەڵ ڕووداوەکەدا، بەڵام گەر بمانەوێت دەتوانین خۆمان لە زیندەخەوەکان جیا بکەینەوە، جیاوازیی خەو و زیندەخەو لەوەدایە. کە خەو ناتوانین لێی بەئاگا بین لە کاتی خەودیتنەکەدا. چونکە ئەوکات بەخەبەر دێین و خەوەکە دەڕوات. بەشێکی زۆری خۆزگە و ئاواتی مرۆڤ لەناو زیندەخەوەکانیدایە، بەڵام زۆر زیندەخەو هەیە بەندە بە گرێ دەروونییەکانی مرۆڤ وەک خەونی دەوڵەمەندبوونی هەژارێک. بەڵام خەڵکانی شێت یان کەم عەقڵ ئەوانەن لەبەرئەوەی بە وتەی فرۆید (من)یان نییە و بێ هێزە. کاتێک دەکەونە ناوی لەناو زیندەخەوەکاندا دەژیت و نایەتە دەرەوە. بەڵام مرۆڤی ئاسایی لەناو یەک زیندەخەودا ناژیت و دواتر (من)ی ناهێڵێت ئەو ڕووداوە ناوەکییە لە واقیعدا دەرکی بکاتەوە و وەک واقیع مامەڵەی لەگەڵ بکات. جا مەرج نییە هەر شێت وا بکات بگرە زۆر کەس هەن کە کۆنترۆڵی خۆیان بۆ ناکرێت و زیندەخەوەکان ئاشکرا دەکەن.

بەشی چوارەم

# ژیانی رۆحی

بەئاگا لەوەی کە مرۆڤ بێجگە لە جەستە و دەروون بەشێکی جەوهەری هەیە ئەویش رۆحە. کێشەی ئێمە وەک مرۆڤ لەگەڵ رۆحدا ئەوەیە کە رۆح بەشێکی نادیار و پەنهانی مرۆڤە، دەتوانین بڵێین لەناو جەستەدایە و لەناو جەستەشدا نییە، لەناو جەستدایە کە رۆح بەرێگەی ئەو دێتە ناو واقیعەوە. لەناو جەستەشدا نییە بەوەی ناتوانین بڵێین ئەم بەشەی جەستە رۆحی تێدایە یان لە فلان شوێندایە. پاشان بوونی رۆح وابەستە نییە بەجەستەوە و بەنەمانی جەستە رۆح هەر هەیە و لەناو ناچێت. هەروەک چۆن ئاوازێک لەسەر ئالەتێکی مۆزیک دەژەنرێت، گەر ئالەتەکە نەما ئاوازەکە هەر دەمێنێ و نامرێت. پرسیارکردن لە رۆح هەرگاڤ ناڕاستەوخۆیە چونکە ناتوانرێت بڵێین رۆح ئەمەیە. چونکە نادیارە و پەتییە و (مجرد– Abstract) هەمەکییە، بەڵام رۆح لەگەڵ ئەوەشدا توانای دەرکەوتنی هەیە لە زەوینەی جیاجیا و لە کات و ساتی جیاوازدا.

لەگەڵ دەرکەوتنی دەتوانین لێی رابمێین و بخەینە ژێر پرسیارەوە، چونکە مرۆڤ دوای دەرکەوتنی شتەکان مەعریفەی راست دەست دەخات، یان دەتوانێت بیانچوێنێ بە شتی هاوشێوە و لە رێگەی کۆمەڵێک میتافۆرەوە گوزارشتی لێ بکات. هەر بۆیە ئەم بەشە هەروا سادە و ساکار نییە و تووشی کێشەی گەورە دەبین. دەبێت بەشوێن ئەو شتانەدا برۆین کە رۆح تیایاندا دەرکەوتووە و لە رێگەی ئەو هەبووانەوە پرسیار لە چییەتیی رۆح بکەین. بەئاگا لەوەی کە رۆح هەمەکییە بەو مانایەی قەد هەمووی بەهەمەکی دانابەزێت، بگرە وەک بەشەکێک دەردەکەوێت بەپێی ئەو زەوینەیەی هەیە. جا ئێمە دەتوانین لە رێگەی ئەم بەشەکییەوە بەرەو ئەو هەمەکییەتە برۆین و لە رێگەی ئەو بەشە دیارەوە بەرەو بەشە نادیارەکان برۆین. ئەمەش بەوە دەبێت کە خۆمان پرسیارکەر و پرسیار ئاراستەکراو بین. چونکە لەم

دۆخەدا دەتوانین پرسیاری چییەتیی رۆح بکەین. پێش دەستپێکردن ئێمە کەمێک بارمان سووکە چونکە لە بەشەکانی تردا زۆر شتمان روون کردووەتەوە. کارێک سەرەتا بیکەین ئەوەیە، رۆح دابماڵین لەو باوەڕە سادەیەی پێی وایە رۆح ئەو جووڵە و زیندوویەی جەستەیە، کە هەر کاتێک جەستە وەستا رۆحیش وەستاوە، چونکە گەر رۆح ئەم زیندوویەیە بێت کە هەمووی وابەستەیە بەجووڵەی میکانیکیی جەستە خۆیەوە. ئەوا ئاژەڵانیش خاوەنی رۆحن. واتە زیاتر ئەم هارمۆنیەتەی نێوان ئەندامەکانی جەستە و کارکردنی دڵ کارێکی بایەلۆجییە نەک رۆحی.

لە کاتێکدا ئاژەڵان رۆحیان نییە، هەر بۆیە بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو شتە لەگەڵ یەکتر دەبێت لێرەدا. دوو کار هەیە ئەنجامی بدەین ئەوانیش جیاکردنەوەی رۆح و زیندوویێتیی ناو لەش، دووەمیان جیاکردنەوەی رۆح و عەقڵ.

**١-رۆح یان عەقڵ :**

کاتێک باسی رۆح دەکەین دەبێت سەرەتا رۆح وەک هەمەکێک جیا بکەینەوە لە رۆح وەک هەبوویەک لە مرۆڤدا، رۆح وەک هەمەک راستیی خودی خوا خۆیەتی، چونکە رۆح کە هاتە ناو مرۆڤەوە ئیتر رۆح نییە بگرە (عەقڵ)[٣٧] بەڵام رۆح لە مرۆڤدا سیفەتی هەمەکیی هەیە بەتایبەت مرۆڤەوە، چونکە ئێمە ناتوانین بزانین دەبین بە چی. یان کۆتایی شتەکان ناتوانین درک پێ بکەین. بۆیە سەرەتا رۆح و عەقڵ با جیا بکەینەوە لێرەوە ئیتر لە جیاتیی رۆح عەقڵ بەکار دەهێنین. پێش ئەوەی رۆح بێتە ناو مرۆڤەوە و مرۆڤ لەدایک بێت دەتوانین بە رۆح ناوی بەرین، بەڵام کە مرۆڤ هاتە دنیاوە و لەدایک بوو ئیتر ئەو بەشە خواییەی مرۆڤ دەبێت بە عەقڵ ناوی بەرین، ئەمەش ئەو بەشە جەوهەرەی مرۆڤە کە نیازی بەوە هەیە دەرکەوێت لەناو مرۆڤدا. جا عەقڵ ئەو رۆشناییەی ناو مرۆڤە، بەرچاورووونی فەراهەم دەکات بۆ مرۆڤ و مرۆڤ وا ئاراستە دەکات کە باری ئاساییی خۆیەتی، مادام رۆح لە مرۆڤدا رۆشنایە ئەوا ناتوانین پێی نەڵێین عەقڵ.

کاریشی ئەوەیە مرۆڤ خۆی بزر نەکات و خۆی تووشی لاڕێ نەکات و بەرەو ژیانی خۆی بڕوات. عەقڵ وابەستەیە بە خواوە، خوا خۆی رۆشناییی رۆشناییەکانە و خاڵقی عەقڵە. هەر ئەم توخمە خوایەش مرۆڤ جیا دەکاتەوە لە ئاژەڵان، چونکە ئەوان عەقڵیان نییە و ناتوانن هۆشیاری پەیدا بکەن بەو یاسا و

ڕێســـایەی ناو خــۆیان و گــەشـــەی پێ بکەن. گــیـــانەوەرێکی وەک مـــاسی کــە بەرنامـەیـەکی لەسـەر تۆمار کـراوە ناتوانێت هۆشـیـاری پەیدا بکات بەخـۆی و بیر لەوە بکاتەوە لەسـەر وشکانی بتوانێت بژیت. بەڵام مـرۆڤ دەتوانێت بیر بکاتەوە و بێزار بێت و تەنیا بێت، هەر بۆیە ئیتر عەقڵ ڕاست و دروستترە لە گیان (ڕۆح). ئێمە لە باسی جەستەدا گوتمان جەستە پێویستی بەخواردن هەیە بۆ گەشـەکردن دەروونیش کە غەریزە و سۆز و هەستەکانە ئەویش پێویستی بەخواردنی تایبەتە بۆ گـەشــە و دەرکـەوتنی. (عـەقـڵ)یش لەناو مـرۆڤـدا هەروا بێ کـار دانەنیـشـتـووە و توانادارى ئاراستەکـردنی جەستـە و دەروونی هـەیە. گەر مـرۆڤ عـەقـڵ نەباتە ناو جەستە و دەروونەوە مرۆڤ دەبێتە ئاژەڵ.

چونکە جـەسـتە و دەروون ڕێڕەون بۆ دەرکـەوتنی عـەقڵ و دەبێت هـەتا ئەو شـوێنە بڕۆن کــە عــەقڵ دیاری دەکــات، دەرچوون لەژێر بـانگی عــەقڵ مـرۆڤ ون دەبێت و سەرگەردان دەژیت. چونکە ئیتر جەستە و دەروون کار دەکەن و جەستە و دەروونی هەر مرۆڤێکیش جیاوازە لەوی تر، ئیتر تەبیعەت و حەز دێتـە ئاراوە و مرۆڤـایەتی هیچ خاڵێکی بۆ نامێنێتەوە کە بچێتە ئەودیو جیاوازیی چینایەتی و ڕەگەز و زمان و... تاد ئاشتی بەرقەرار نابێ.[٣٨] چونکە بەتەنیا ئەمە عـەقڵە هارمۆنیەتی نێوان شتـە جیـاوازەکـان دەدۆزێتـەوە و کـۆیان دەکـاتەوە. گـەر عـەقڵ تـوانای دۆزینەوەی هارمـۆنیـەتی هەبێت، ئەوا دەتـوانین بڵـێین عـەقڵ نەخشـەیەکـە لەناو مـرۆڤـدا، کـە هەموو شتە ڕاستەقینەکانی مرۆڤی تێدایە. واتە عەقڵ وەک نەخشـەیەک توانادارە کە ژیانی مـرۆڤ دابڕێژێت و پەرش بێت بەهـەمـوو ژیانی مرۆڤـدا، گەر عـەقڵ پەرش بوو مانای ئەوە نییە کە دابەش دەبێت و پارچە پارچە دەبێت، چونکە عەقڵ بە تەنیا بەشێکی نەخشـەکە نییە. بگرە هەمـوو نەخشـەکەیە و ناتوانێت بەشێکی بە تەنیا جیا بکەینەوە. بۆیە هـەرچی دەکەین بەپێی عەقڵ هـەر ئەوە تەواو دەکەین و دەنوێنین کە عــەقڵە. واتـە عـەقڵ یەکە بـەڵام هەمـووشـە. وەک ڕووناکـییـەک بچێتـە ناو هـەر بوارێکەوە ڕۆشنـی دەکاتەوە، واتە گەر کـۆمـەڵێک ڕێڕەومـان هـەبێت وەک (سـەوز و سوور و سپی... تاد) بچێتە هـەر کامیانەوە ئەو ڕەنگە دەنوێنێ، بەڵام هـەر خۆیەتی کـە دەردەکـەوێت و دادەبەزێت. واتە نـە جیـا دەبێتـەوە لە خـۆی نە دابـەش دەبێت، چونکە کشان و دابەشبوون سیفەتی مادەیە نەک عەقڵ.

ئەم نەخـشــەیە مـرۆڤ دەتـوانێت بیکاتـە واقیع دەشـتـوانێت پشـتگوێی بخـات و

نەخشەیەکی تر بکاتە جەوهەری خۆی، بەڵام ئەو کاتە ئەو دەنوێنێ نەک خۆی. واتە عەقڵ مرۆڤ دەباتە سەر (خۆنوێنی) و دەرچوون لە عەقڵیش مرۆڤ دەباتە سەر (ئەو نوێنی). بۆ زیاتر ئاشنابوون بەعەقڵ و ناسینەوەی لە مرۆڤدا ئێمە نموونەی ئەشکەوتی ئەفلاتوون وەردەگرین و پاشان هەوڵ دەدەین خوێندنەوەی بۆ بکەین. تا زیاتر بابەتەکە روون بکەینەوە.

**٢- وێنەی ئەشکەوتی ئەفلاتوون و دەرکەوتنی عەقڵ لە مرۆڤدا:**

وێنەی ئەشکەوت:

"سوکرات: ئێستاکەش دەمەوێت لە رێگەی وێنەیەکەوە کاریگەری پەروەردەت لەسەر زانین و نەزانین پێشان بدەم، ئەشکەوتێکی ژێرزەوینی بهێنە بەرچاوی خۆت کە دەرگەکەی بەرەو رووی رووناکاییی رۆژەو هێندەی خودی ئەشکەوتەکە بەرینە، کەسانێک هەر لە سەرەتای منداڵییانەوە، لەم ئەشکەوتەدا بەند کراون، ئەویش بەشێوەیەک کە قاچ و ملیان بە زنجیر بەستراوەتەوە، بۆ ئەوەی نەتوانن سەریان بۆ هیچ لایەک بجووڵێنن و تەنیا سەیری بەرامبەر خۆیان بکەن، لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە بەمەودایەکی دوور، ئاگرێک داگیرساوە کە تیشکەکەی دێتە ناو ئەشکەوتەکەوە، لە نێوان ئاگر و زیندانییەکاندا رێگەیەک هەیە، کە بەرەو بەرزایی دەڕوات. لەسەر ئەم رێگەیەش دیوارێکی کورت دروست کراوە، ئەم دیوارە لەو پەردەیە دەچێ کە لە نواندنی بووکەشووشەدا لە نێوان نواندنکارەکان و بینەرەکاندا هەیە. بۆ ئەوەی لەسەر پەردەکەوە نواندنەکەیان پێشکێش بکەن.

گلاوکۆن: وێناکەم لە بەرچاوە.

سوکرات: لەودیو دیوارەکەوە خەڵکانێکی زۆر هەن، کە کەلوپەلی جۆراوجۆری وەک پەیکەری مرۆڤ و ئاژەڵ، کە لە دار یان بەرد دروست کراون، بۆ ئەمبەر و ئەوبەری دیوارەکە دەگوازنەوە و هەموو شتەکانیش لەمبەر دیوارەکەوە دیارن، هێندێک لەم کەسانە لە کاتی

هاتوچۆدا لەگەڵ یەکتر قسە دەکەن و هێندێکی تریان بێدەنگن.

گلاوکۆن: چەند وێنەیەکی سەیرە! چەند زیندانییەکی سەیرن!

سوکرات: ئەم وێنەیە لە رووی ژیانی خۆمانەوە کێشراوەتەوە و زیندانییەکانیش وێنەی ئێمەن، ئاخۆ ئەم زیندانییانە لە خۆیان و لە هاورێکانیان، بێجگە لەو سێبەرەی کە ئاگرەکە دەرەوەی ئەشکەوت خستوویەتە سەر دیوار، هیچی تر دەبینن.

گلاوکۆن: چۆن بێجگە لە سێبەر شتێکی تر ببینن لە کاتێکدا هەرگیز ناتوانن سەریان بە هیچ لایەکدا بجووڵێنن؟

سوکرات: ئاخۆ لەو کەلوپەلانەی کە لە دەرەوەی ئەشکەوت، بۆ ئەمبەر و ئەوبەر دەگوازێنەوە، بێجگە لە سێبەر هیچی تر دەبینن؟

گلاوکۆن: نا، بێگومان.

سوکرات: ئەگەر توانای ئاخافتنیان تێدا بێ، ئاخۆ لە قسەکانیدا سێبەرەکان بە شتە راستەقینەکان دانانێن؟

گلاوکۆن: با، بێگومان.

سوکرات: ئەی ئەگەر دیواری ئەشکەوتەکە دەنگ بداتەوە و کەسێک بەتەنیشت دەرگەی ئەشکەوتەکەدا تێپەرێ و قسەیەک بکا، ئاخۆ زیندانییەکان پێیان وانابێ کە ئەوە سێبەری کەسەکەیە، نەک کەسەکە خۆی، کە تێپەرێ و قسە دەکا؟

گلاوکۆن: بەڵێ، بێگومان وا دەزانن.

سوکرات: کەواتە بێجگە لە سێبەرەکان هیچ شتێکی تر لەلای ئەوان هەقیقەتی بۆ نییە.

گلاوکۆن: نەخێر.

سوکرات: ئەی بەرای تۆ لەم بەندە رزگاریان بێ و نەخۆشیی خەیاڵات و بۆچوونی پووچ یەخەیان بەردا چی روو دەدا؟ گریمان یەکێک لەمانە ئازاد بکرێ لە ناکاو ناچار بکرێ، کە هەڵسێتە سەرپێ و سەیری ئەمبەر و ئەوبەر و پشتەوەی خۆی بکا و پاشان بەرەو رووی دەرگەی

ئەشکەوتەکە بڕوا و سەیری ئاگرەکە بکا، بێگومان هەموو ئەم هەڵسوکەوتانە، بەندکراوە رزگاربووەکە تووشی نارەحەتی دەکەن و و ناتوانێ بە جوانی خودی ئەو شتانە ببینێ، کە تا ئەو کاتە تەنیا سێبەرەکەیانی بینیوە. ئەگەر لەم کاتەدا پێی بڵێن کە هەتا پێش ئەم ساتە بێجگە لە سێبەر هیچی ترت نەبینیوە، بەلام ئێستا لە هەقیقەتی شتەکان نزیکتریت و سەیری خودی شتەکان دەکەی و هەر بۆیەش باشتر دەتوانی ببینیت، ئاخۆ تۆ بڵێی چ وەلامێک بداتەوە؟ ئەگەر کەسێک دەستی (بەندکراوەکە) بگرێ و بەناو هەموو شتەکاندا بیگێڕی و پێشانی بدا و ناچاری بکا، کە لەسەر ئەو شتانەی کە دەیانبینێ قسە بکا و بڵێ، کە ئەو شتانە چین، ئاخۆ تووشی سەرلێشێواوی و واقوڕمان نابێ و نازانێ کە ئەو سێبەرانەی کە پێشتر بینیونی ڕاستەقینەترن لەو شتانەی کە ئێستا دەیانبینێ؟

گلاوکۆن: با، بێگومان.

سوکرات: ئەگەر ناچار بکرێ، کە سەیری خودی ئاگرەکە بکا، بێگومان چاوەکانی تووشی ژان دێن و هەر بۆیەش لە دەست ڕووناکایی ڕادەکا و پەنا بۆ سێبەرەکان دەباتەوە، چونکە سێبەرەکان باشتر لە خودی شتەکان دەبینێ و سوورتر دەبێ لەسەر ئەوەی کە سێبەرەکان زۆر ئاشکراتر و روونترن لەو شتانەی کە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە پێشانیان داوە.

گلاوکۆن: وایە.

سوکرات: بەلام ئەگەر دەستی بگرن و بەزۆر بەرەو سەرەوە، واتە بۆ دەرەوەی ئەشکەوت، ڕای بکێشن هەتا دەگاتە تیشکی خۆر، بێگومان تووشی نارەحەتییەکی زیاتر دەبێ و تووڕە دەبێ هەوڵ دەدا کە خۆی لە دەستی کەسەکە دەرباز بکا، چونکە کاتێک کە دەگاتە رۆشنایی خۆر، چاوی ڕەشکەوپێشکە دەکا و ناتوانێ هیچ کام لەو شتانە کە ئێمە بە ڕاستەقینەیان دەزانین و ناومان لێ ناون ببینێ.

گلاوکۆن: بێگومان، ئەگەر کەسێک بەم خێرایییە لە تاریکییەوە بەرەو

ڕووناکایی بگوازرێتەوە، تووشی ئەمە دێ.

سوکرات: کەواتە بۆ ئەوەی بتوانێ شتە جۆراوجۆرەکان ببینێ، دەبێ چاوی وردە وردە لەگەڵ ڕۆشناییدا ڕابێ، سەرەتا سێبەرەکان و پاشان وێنەی کەسەکان و شتەکان باشتر لە شتەکانی تر لە یەکتر جیا دەکاتەوە. پاش ئەمە خودی کەسەکان و شتەکان دەبینێ، پاشان لە شەوگاردا سەیری ئاسمان و ئەستێرەکان و تەنە ئاسمانییەکانی تر دەکا، هەڵبەت چاوی زووتر و ساناتر لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکاندا ڕادێ هەتا خۆر، چونکە ڕۆشنایی خۆر لە ڕۆژدا چاوی تووشی ئازار دەکا.

گلاوکۆن: ئاشکرایە.

سوکرات: ئەو شتەش کە دەتوانێ پاش هەموو ئەو شتانە ببینێ، خۆرە بەڵام نەک تیشکدانەوەی خۆر لە ئاو یان لە شتەکانی تردا، بگرە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خودی خۆر دەبینێ واتە پەی بە جەوهەری ڕۆشنایی دەبات.

گلاوکۆن: ڕاستە.

سوکرات: پاش تێپەڕاندنی هەموو ئەو قۆناغانە پەی بەوە دەبا، کە ئەوە خۆرە وەرز و ساڵە یەک لە دوای یەکەکان دروست دەکا و کۆنترۆڵی جیهانی بینراو دەکا و دایکی ئەم جیهانەیە. بەمانایەک لە ماناکان خۆر بەرپرسیارە لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆی و هاوڕێکانی ناو ئەشکەوتی بینیویانە.

گلاوکۆن: بێگومان پاش تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە جۆراوجۆرانە پەی بەمە دەبا.

سوکرات: ئەگەر لەم کاتەدا بەبیر ماڵی یەکەمینی هاوڕێکانی و هەموو ئەو شتانەی کە لەوێ بە زانایان دادەنا، بکەوێتەوە، بێگومان خۆی بە بەختەوەر دەزانێ و شانازی بەخۆیەوە دەکا و خەم بۆ هاوڕێکانی ئەوێ دەخوا.

گلاوکۆن: زۆر ڕاستە.

سوکرات: بەڵێ لەم کاتەدا بەبیری دێتەوە، کە لەناو ئەشکەوتییەکاندا ئەو کەسانەی کە چاویان لە پەیبردن بە چۆنێتیی ریزبەندیی هاتوچۆی سێبەرەکان و لەوێشەوە لە ناسینەوەیان تیژتر بووە، ستایش کراون و ناوبانگییان بە توانای پێشبینی دەرکردووە، بەڵام ئاخۆ پاش ئەم ئەزموونە دیسان ئیرەیی بەو توانایە دەبا، کە لە هاوڕێیەکاندا هەبووە و لەودا نەبووە؟ یان نا، حەز دەکا، وەک هۆمیرۆس دەڵێت:" تەویلەداری جووتیارێکی دەستکورت بێ"، بەڵام ئەو ژیانەی پێشووی نەگەڕێنەوە، کە پڕ بووە لە خەیاڵاتی پووچ.

گلاوکۆن: بێگومان هەموو شتێک لەلای ئەو لەو ژیانە باشترە، کە پێشتر تیایدا بووە.

سوکرات: ئەی بەڕای تۆ چی روو دەدا ئەگەر بێو ئەو کەسە بگەڕێنینەوە ناو ئەشکەوت و لە هەمان شوێنی پێشووتری خۆیدا دایبنیشێنن؟ ئاخۆ چاوەکانی بەهۆی تاریکیی ناو ئەشکەوت وەک نابینایان لێ نایەت، ئەویش بەهۆی ئەوەی، کە لە رووناکاییی خۆرەوە بە پڕتاو هاتووەتە ناو تاریکییەوە؟

گلاوکۆن: با.

سوکرات: ئەگەر لەم حاڵەتەدا، کە ناتوانێ هیچ ببینێ لەبارەی سێبەرەکانەوە قسە بکا و لەیەکیان جیایان بکاتەوە، ئاخۆ زیندانییەکانی تر گاڵتەی پێ ناکەن و پێی ناڵێن، کە چاوی بەهۆی چوونە دەرەوە لە ئەشکەوت تێکچووە؟ هەر بۆیەش ئاخۆ بەرزبوونەوە بۆ جیهانی رۆشنایی بە کارێکی بێ سوود نازانن؟ ئەی ئەگەر ئەو کەسە هەوڵ بدا کە زنجیر لە پێی هاوڕێکانی بکاتەوە لەم زیندانییە ئازادیان بکا، چی روو دەدا ئاخۆ ئەگەر بۆیان بکرێ نایکوژن؟

گلاوکۆن: شکی تێدا نییە، کە دەیکوژن.

سوکرات: ئێستاکەش، گلاوکۆنی ئازیز، ئەم وێنەیە لەگەڵ ئەو شتانەی کە پێشتر گوتم، بەراورد بکە، ئەشکەوتەکە لەگەڵ جیهانی شتە بینراوەکان و رۆشناییی ئاگرەکەی ناو ئەشکەوتەکە لەگەڵ هێزی خۆر

بەراورد بکە پاشان خۆ هەڵەت نەکردووە، ئەگەر بەرزبوونەوە لەناو ئەشکەوتەکەوە بۆ پانتایی شتە بینراوەکان بەپرۆسەی بەرزبوونەوەی رۆح بۆ جیهانی عەقڵی بچوێنێ، بەهەرحاڵ ئەمە لێکدانەوەی منە کە تۆ ئەو هەموو حەزەت لە بیستنی بووە، تەنیا خوایش دەزانێ، کە ئەم لێکدانەوەیە تا چەند راستیی تێدایە، بەهەرحاڵ بە رای من ئەوەی کە مرۆڤ لە کۆتاییدا و پاش هەڵگرتنی قورساییەکی زۆر، لە جیهانی عەقڵیدا پێی دەگا، هەمان ئایدیای (دروستە)، بەلام هەر ئەوەندەی کە مرۆڤ بەدیداری ئەم ئایدیایە شاد بوو، ئیتر پەی بەوە دەبا کە ئەم ئایدیایە سەرچاوەی هەرچی جوانی و دروستییەکە، لە جیهانی هەستیشدا، رۆشنایی و سەرچاوەی رۆشناییەکە لەوەوەیە و لە جیهانی عەقڵیدا دەسەڵاتداری رەها و سەرچاوەی هەقیقەت و زانستە هەر کەسێکیش بیەوێ. چ لە ژیانی تایبەتی خۆی و چ لە ژیانی کۆییدا، دروست بجووڵێتەوە و کردارەکان لەگەڵ عەقڵیدا تەبا بێ، دەبێ بەدیداری ئەم ئایدیایە شاد بێ.

گلاوکۆن: منیش هەتا ئەو کە توانیم رێگەم پێ بدا ئەم بۆچوونەم قبووڵە. سوکرات: کەواتە لەمەشدا لەگەڵمدای کە نابێ پێمان سەیر بێ ئەگەر کەسێک کە تا ئەو رادەیە بەرز بووەتەوە ئیتر حەزی لێ نەبێ کە خۆی لە کاروباری مرۆڤەکان بدا، بەڵکو بەردەوام مەیلی بۆ مانەوە لە جیهانە بالاکاندا بێ و حەز بکا کە هەر لەوێ بمێنێتەوە، چونکە ئەگەر بەپێی وێنەکەمان سەیر بکەین ناکرێ چاوەرێی شتێکی تر بکەین.

گلاوکۆن: راستە.

سوکرات: هەروەها سەیر نییە، ئەگەر کەسێک کە باش تەماشای جیهانی بالا بۆ ناو کاروباری کۆمەلانی خەڵک و نەخۆشییەکانیان دادەبەزێتەوە، ببێتە گاڵتەجاڕی خەڵک، ئەگەر بێو پێش راهاتنی چاوی لەگەڵ تاریکیی دەوروبەردا ناچار بکرێ، کە لە دادگە، یان هەر شوێنێکی تری گۆمەڵگە، کە هەرگیز خودی دادپەروەریان نەبینیوە،

لەسەر سێبەرەکانی دادپەروەری، یان هەر شتێکی تر قسە بکا.

گلاوکۆن: نەخێر، هیچ سەیر نییە.

سوکرات: بەڵام هەر کەسێکی خاوەن عەقڵ دەزانێ، کە چاوی بینا لە دوو حاڵەتدا تووشی نابینایی دەبێ، یەکیان کاتێک کە مرۆڤەکان لە رۆشناییەوە بەرەو تاریکی دەگوازرێنەوە، دووەمیشیان کاتێک کە لە تاریکییەوە بۆ رۆشنایی دەگوازرێنەوە، هەروەها دەزانێت، کە رۆحیش هەمان حاڵی چاوی هەیە، هەر بۆیەش کە ئەمەی لە رۆحدا درک پێ کرد ئیتر وەک گەمژە و بەبێ بیرکردنەوە بەکەسێک کە رۆحی دووچاری شڵەژان بووەتەوە و ناتوانێ شتەکان بەروونی لە یەکتر جیا بکاتەوە، پێ ناکەنێ، بگرە بەشوێن هۆکاری ئەم حاڵەتەدا دەگەڕێ و لە خۆی دەپرسێ، کە ئاخۆ ئەم رۆحە لە شوێنێکی رۆشنترەوە هاتووە و هێشتا لەگەڵ تاریکیی ئەم شوێنە رانەهاتووە. یان نا لە شوێنێکی تاریکترەوە بەرەو ئێرە کە روناکترە رای کردووە، هێشتا چاوی رەشکەوپێشکە دەکا. پاش ئەوەی کە پەی بەهۆکارەکە برد، کەسەکەی حاڵەتی یەکەم بەشایانی ستایش دەزانێ و دڵی بەوەی حاڵەتی دەسووتێ، ئەگەر یەکێکیش بیەوێ پێ بکەنێ دەبێ بەوەی دووەمیان پێ بکەنێ، چونکە پێکەنین بە کەسێک، کە لە جیهانی رۆشناییەوە بەرەو تاریکی دابەزیوە زۆر بێ ماناترە پێکەنین بە حاڵەتەکەی تر.

گلاوکۆن: زۆر ڕاستە.

سوکرات: ئەگەر ئەوە راست بێ، ئەوە دەبێ رەدی ئەم جۆرە لە زانست بدەینەوە، کە لەلایەن ئەو مامۆستایانەوە پێشکێش دەکرێ، کە دەڵێن دەتوانن زانستێک بخەنە ناو رۆحی مرۆڤەوە، کە پێشتر تیایدا نەبووە وەک ئەوەی بڵێی بینایی بخەنە ناو چاوێک، کە بینایی تێدا نییە.

گلاوکۆن: ڕاستە وا دەڵێن.

سوکرات: بەڵام باسەکەمان سەلماندی کە توانای زانین هەر لە سەرەتا لەناو رۆحی مرۆڤ جێگیر کراوە، هەروەها ئەوەشمان سەلماند، کە وەک چۆن چاو بەتەنیا لە تاریکییەوە بەرەو رۆشنایی ناگوازرێتەوە،

مەگەر ئەوەی، کە هەموو جەستەی لەگەڵدا بێ، بەهەمان شێوە بەشی زانینی ڕۆحیش دەبێ لەگەڵ ڕۆح وەک گشتێک لە جیهانی گۆڕاوەوە بەرەو جیهانی نەگۆڕەکان بگوازرێتەوە، بۆ ئەوەی وردە وردە بتوانێ ڕاستەوخۆ سەیری هەقیقەت و ڕۆشنترین هەقیقەتی ناو هەقیقەتەکان، واتە خۆری جیهانی عەقڵی کە ئایدیای (دروست)ـە، بکا.

گلاوکۆن: دروستە.

سوکرات: کەواتە هونەری پەروەردەکردن ئەو هونەرەیە، کە دەکرێ لە ڕێگەیەوە بەئاسانی و بەشێوەیەکی کاریگەر کار لەسەر گۆڕانەکان بکرێ و دەبێ وەک هونەرێک بخوێنرێ، بەڵام ئەم هونەرە پێوەندیی بەچاندنی توانای زانین لە ڕۆحدا نییە، بگرە کاری ئەم هونەرە ئەوەیە، کە نەهێڵی ئەو توانایەی کە لە سەرەتاوە لەناو ڕۆحدا هەیە، بەرەو ئاراستەیەکی نادروست بڕوات، یان مەیلی گومڕابوونی تێدا دروست بێ.

گلاوکۆن: وایە.

سوکرات: کەواتە فەزیلەتەکانی تری ڕۆح لەوانەیە لە ڕوویەکەوە بەتوانا جەستەییەکان بچوێنرێن، چونکە لە سەرەتادا وا دەردەکەوێ، کە ئەم فەزیلەتانە لە سەرەتاوە لەناو مرۆڤدا نین، بەهۆی ڕاهێنان و پەروەردەوە لەناو ئێمە دەچێنرێن، بەڵام توانای زانین (وەک فەزیلەتێک) پێ دەچێ کە خەسڵەتێکی خواوەندی تێدابێ، چونکە هەرگیز توانای خۆی لە دەست نادا و لەناو ناچێ، بگرە بەپێی ئەو ئاراستەیەی کە وەری دەگرێ باش و سوودمەند یان خراپ و زیانبارە، مەگەر کەسانی بەد و فێڵبازت کە بەزیرەکی بەناوبانگن نەبینیوە، کە چەند ڕۆحێکی بچووک، بەڵام تیژبینیان هەیە؟ ڕاستە کە ڕۆحیان بچووکە، بەڵام هێزی بیناییان، بەهیچ شێوەیەک لاواز نییە، بەڵکو تەنیا ئەوەندەیە، کە (ئەم هێزەیان) لە خزمەت خراپە و ناپاکیدایە، هەر بۆیەش هەرچی ڕۆحیان تیژبینتر بێ، ئەوەندەش سەرچاوەی زیان و

خراپەی گەورەترین.

گلاوکۆن: ڕاستە.

سوکرات: بەڵام ئەگەر هێزی عەقڵ بێ. ئەم کەسانە هەر لە منداڵییەوە پاک بکرێتەوە و ئەو هێزە قورسانەی کە سەر بەسروشتی جیهانی گۆڕاون و لە ڕێگەی حەز و هەستەکانەوە خۆیان بە ڕۆحەوە هەڵدەواسن. وەک قورقوشمی قورس بەرەو جیهانی شتە نزمەکان ڕای دەکێشن، لێ بکرێتەوە و بەرەو جیهانی ڕاستەقینە ئاراستە بکرێ، ئەوە دەتوانێ ڕاستییەکان بەهەمان ڕوونی ببینێ، کە ئێستا شتە گۆڕاوەکان دەبینێ.

گلاوکۆن: بێگومان.

سوکرات: ئاکامگیرییەکی تریش لە باسەکەمان دەکرێ ئەویش ئەوەیە، کە ئەو کەسانە مافی فەرمانڕەواییکردنی دەوڵەتی ئێمەیان هەیە، کە پەروەردە نەکراون و هیچ زیانێکیان لەسەر ڕاستیی شتەکان نییە و نە ئەو کەسانەش کە وازیان لێ هێنراوە، کە هەموو تەمەنیان خەریکی پەروەردەکردنی خۆیان بن، چونکە کەسانی پەروەردەنەکراو، نە لە ژیانی تاکەکەسی و نە لە ژیانی کۆییدا، هیچ ئامانجێکی دیاریکراویان نییە، کە لە کردارەکانی ڕۆژانەدا ئاراستەکردنی لێ وەرگرن. گروپەکەی تریش بەشداری لە هیچ کام لەو ئەرکە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەدا ناکەن کە لەگەڵ سروشتیاندا تەبایە، چونکە وا دەزانن لە دەرەوەی ئەم جیهانە و لە جۆرە بەهەشتێکی زەوینیدا دەژین.

گلاوکۆن: وایە.

سوکرات: کەواتە ئەرکی ئێمە، وەک یاسادانەر، ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە توانایان لەوانی تر زیاترە ناچار بکەین، کە ئەو زانستە کە بە بەرزترین زانست ناومان برد، وەدەست بهێنن، واتە بەدیداری خودی ئایدیای (دروست) شاد بن و ئەو ڕێگەیەی کە بە جیهانی ڕۆشناییان دەگەیەنێ، بگرنە بەر. بەڵام کاتێک کە سەرکەوتووانە ئەم ڕێگەیان بڕی بە دیداری ئایدیای (دروست) شاد بوون، نابێ بهێڵین

بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن کە ئەمڕۆ دەیکەن.

گلاوکۆن: مەبەستت بەکام شێوەیە.

سوکرات: مەبەستم ئەوەیە، کە نابێ ڕێگەیان پێ بدەین کە لەو جیهانە بەرز بمێننەوە و خۆیان لە گەڕانەوە بۆ ناو ئەشکەوت و بەشداری لە خەم و خۆشیی هاوڕێکانیاندا، جا خەم و خۆشییەکە گەورە بێ یان بچووک، بدزنەوە.

گلاوکۆن: بەڵام بێگومان ئەمە زوڵمێکە لەوانی دەکەین بەوەی کە نەهێڵین درێژە بەو ژیانە پڕ خۆشییە بدەن کە وەدەستیان هێناوە، بەڵکو بەرەو ژیانێکی نزم و بێ بەها دایانبەزێنن.

سوکرات: وابزانم دیسان لە بیرت چووەتەوە کە ئامانجی یاساکەی ئێمە ئەوە نییە، کە تەنیا چینێکی تایبەتی خەڵک بەخۆشبەختی بژین، بگرە دەبێ هەموو کۆمەڵگە لەم بەختەوەرییە بەهرەمەند بن، هەر بۆیەش ئەم یاسایە لە ڕێگەی ڕازیکردن یان ناچارکردنەوە، هەوڵ دەدا کە هەموو کۆمەڵگە یەک بخا بۆ ئەوەی هەموو چین و تاکەکان بەپێی توانا لە بەرژەوەندی و پێگەیاندنی کۆمەڵگەدا بەشداری بکەن. کەواتە مەبەست لە پەروەردەکردنی پیاوانێک کە ڕۆحیان لە ڕۆحی کۆمەڵگەیەکی لەم شێوەیە بچێ ئەوەیە کە لێ گەڕێین هەر کەسێک بۆ حەز و چێژی خۆی کار بکا و بژیت، بەڵکو ئەوەیە، کە لە هەر کام لەو کەسانە بۆ پێکهێنانی یەکەتییەک کەڵک وەربگرین.

گلاوکۆن: ڕاست دەکەی، ئەمەم لە بیر چووبووەوە.

سوکرات: ئەی گلاوکۆنی بەڕێز، کەواتە ئەگەر ئەو فەیلەسووفانەی کە لە شارەکەی خۆماندا پەروەردەمان کردوون، ناچار بکەین کە بیر لە بەختەوەری و بەرژەوەندیی هاووڵاتییانی خۆیان بکەنەوە و دەسەڵات وەدەست بگرن، زوڵممان لە حەقیاندا نەکردووە، بەڵکو بگرە ئەمە ئەوپەڕی دادپەروەریمانە، بۆ بەرگری لەم قسەیەش دەکرێ پێیان بڵێین کە ئەو فەیلەسووفانەی کە لە کۆمەڵگەکانی تردا لەدایک دەبن و پێ دەگەن دەتوانن و مافی خۆشیانە کە خۆیان لە کاروباری سیاسیی

وڵات نەدەن. چونکە پێگەیشتن و بوونیان بە فەیلەسووف بەبێ ویست و یارمەتیی کۆمەڵگەکەیان بووە. کەسێک کە بەهەوڵ و کۆششی خۆی بەشتێک دەگا قەرزداری خەڵک نییە و هەر بۆیەش پێویست ناکا هیچ شتێ بە هیچ کەسێک بداتەوە، بەڵام دەتوانین بە فەیلەسووفەکانی خۆمان بڵێین کە ئێمە ئێوەمان بۆ بەرژەوەندیی خۆتان و هەموو کۆمەڵگە هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی وەک مەلیکەی زەردەواڵەکان هەم خۆتان و هەمیش کەندووەکە ڕێبەری بکەن، ئەو پەروەردەیەی کە بە ئێوەمان داوە زۆر باشتر و تەواوترە لەوەی بەوانی تر دراوە. هەر بۆیەش ئێوە باشتر دەتوانن ژیانی فەلسەفی لەگەڵ سیاسەتدا ئاشت بکەنەوە، بۆیەش دەبێ هەر کام لە ئێوە بەپێی پێویست و بۆ ئەرکەکەی بەرەو ناو ئەشکەوتەکە دابەزێتەوە و لە تەک هاوڕێ زیندانییەکانیدا بژیێ، هەتا ئەو کاتەی چاوتان لەگەڵ تاریکیدا ڕادێ، هەرکە چاوتان لەگەڵ تاریکیدا ڕاهات هەزار جار لەوان باشتر دەتوانن سێبەرەکان لە یەکتر جیا بکەنەوە و بزانن کە کام سێبەر هی کام شتە، چونکە ئێوە پێشتر ڕاستی (جوان) و (دادپەروەرانە) و (دروست)تان بینیوە، هەر بۆیەش دەوڵەتەکەمان، کە هی ئێوەشە، بەبێداری و هۆشیارییەوە بەڕێوە دەبرێ و نەک بەخەو و خەیاڵاتەوە، کە شێوەیەکی زاڵی بەڕێوەبردنی زۆربەی دەوڵەتەکانی ئەمڕۆیە، فەرمانڕەوا ئەمڕۆییەکان لە بۆ سێبەر و لەسەر فەرمانڕەوایی و دەسەڵات لەگەڵ یەکتریدا بەشەڕ دێن، وەک بڵێی فەرمانڕەوایی نیعمەتێکی گەورە بێ، بەڵام ئەگەر بمانەوێ ڕاستی بڵێین: باشترین وڵات ئەو وڵاتەیە، کە فەرمانڕەوا هەڵبژێردراوەکانی بەبێ مەیلییەوە ئەم ئەرکە وەئەستۆ دەگرن، بەڵام ئەگەر وا نەبێ، واتە ئەگەر فەرمانڕەواکان تینووی دەسەڵات بن، ئەوە ناتەندروستترین کۆمەڵگەشمان دەبێ.

گلاوکۆن: لەگەڵ تەواوی قسەکانتدام.

سوکرات: ئاخۆ کەسانی پەروەردەکراو، پاش بیستنی ئەم قسانە، دیسان وەئەستۆگرتنی بەشە ئەرکی خۆیان لە بەڕێوەبردنی کاری قورسی دەوڵەت پشتگوێ دەخەن. لەسەر بەیەکەوەژیان لە جیهانی

بێگەرد و باڵا پێداگیری دەکەن؟

گلاوکۆن: نەخێر ناتوانن ئەم ئەرکە پشتگوێ بخەن، چونکە ئێمە داواکارییەکی دادپەروەرانەمان ئاراستەی پیاوانی دادپەروەر کردووە، بەپێچەوانەوە دڵنیام لەوەی کە کەسانی پەروەردەکراو، بەپێچەوانە فەرمانڕەوا ئەمرۆییەکان، بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەت بەئەرکێکی پێویست دەزانن کە نابێ خۆی لێ بدزنەوە.

سوکرات: بێگومان وایە. لە ڕاستیدا ئەگەر دەتەوێ دەوڵەتەکەت بەباشترین شێوازی مومکین بەڕێوە بچێ، دەبێ شێوازێک لە ژیان بۆ فەرمانڕەواکانت بدۆزیتەوە، کە فەرمانڕەواکانت زیاتر لە فەرمانڕەوایی حەز لێ دەکەن، چونکە تەنیا بەم شێوەیە کە فەرمانڕەوایی حکوومەتەکەت دەست کەسانێک، کە دەوڵەمەندی ڕاستەقینەن، هەڵبەتە مەبەستم لە دەوڵەمەند ئەو کەسانە نییە کە زێڕ و زیویان زۆریان هەیە، بەڵکو مەبەستم ئەو کەسانەیە، کە لە بەختەوەریی ڕاستی و ژیانی عەقڵیدا دەوڵەمەندن، بەڵام ئەگەر دەسەڵات و کاروباری گشتی بکەوێتە دەست کۆمەڵێک دەرۆزەکەر و دەستکورتەوە، کە هیچ بەهرەیەکیان لە سامانی ڕاستەقینە نییە و بۆ ڕفاندنی ئەم سامانە دەسەڵات وەدەست دەگرن. ئیتر بەهیچ شێوەیەک حکوومەتێکی تەندروستت نابێ چونکە ئەم جۆرە کەسانە لەسەر وەدەستهێنانی دەسەڵات شەڕ بەرپا دەکەن و بەم شەڕە ناوەخۆییەش هەم خۆیان و هەم وڵات و دەوڵەتیش لەناو دەبەن.

گلاوکۆن: زۆر ڕاستە.

سوکرات: ئاخۆ بێجگە لە ژیانی فەیلەسووف ژیانێکی ترت پێ شک دێ، کە لە چاو پلە و پایەی سیاسی بەرز و پڕ بایەخ بێ؟

گلاوکۆن: نەخێر.

سوکرات: بەڵام چی بکەین چارمان ناچارە و دەبێ کەسانێک بۆ فەرمانڕەوایی دەستنیشان بکەین، کە حەزیان لە فەرمانڕەوایی نییە، ئەگینا تووشی شەڕی ڕەقیبەکان دەبین.

گلاوکۆن: بێگومان.

سوکرات: کەواتە دەبێ پاسەوانی کۆمەڵگەکەمان بەدەستی کەسانێک بسپێردرێ، کە لەلایەکەوە بنەماکانی فەرمانڕەواییی دروست و ڕاستەقینە باشتر لە کەسانی تر دەناسن. ئاخۆ تۆ کەسانێکی باشتر لەمانەت پێ شک دێ.

گلاوکۆن: کەسانی لەمانە باشتر بۆ ئەم ئەرکە نییە."(٣٩)

***

گەر لەم نموونەیە ورد بینەوە سوکرات زۆر بیرکردنەوەی هەیە لەناو ئەم حیکایەتەدا بەیانی دەکات لەسەر عەقڵ و زانین. سەرەتا با ئەوە باس بکەین کە مرۆڤ لەدایک دەبێت عەقڵ لەناویدا وەک (بوون بەهێز) هەیە، بەڵام دەبێت مرۆڤ بگاتە تەمەنێکی وا کە جەستە و سایکۆی مرۆڤ تەواو ساز و ئامادە بن بۆ ئەوەی عەقڵ درک پێ بکەن، کێشەکە لەویادایە کە مرۆڤ هەتا دەگاتە قۆناغی (بوون بە کردە)، بەناو کۆمەڵگەدا دەڕوات وەک پرۆسەی پربوون و بەرەو ئەو چوون. هەتا دوایی دەگاتە ئەونوێنی. ئەم قۆناغە بۆ مرۆڤ زۆر گرینگە، سەرەتا مرۆڤ بە عەقڵی خەڵکی تر ئیش دەکات و دەبێت مانای شتەکان و هەموو شتەکان لە کۆمەڵگەوە وەربگرێت، سوکرات لەم نموونەیەدا تەواوی ژیانی مرۆڤ وێنا دەکات، دیارە یەکێک لە نەریتەکانی سوکرات نموونە هێنانەوەیە بۆ بەرجەستەکردنی بیرەکانی. جیاوازیی ئەفسانە و حیکایەت لای سوکرات ئەوەیە کە لای سوکرات بیرەکان حیکایەت و ئەفسانەکان دەخوڵقێنن و ئەوەشی گرینگە خودی حیکایەتەکە نییە، بگرە بیرەکە جێگەی مەبەستە لای ئێمە و لای ئەفلاتوونیش. لەم نموونەیەدا سوکرات(٤٠) (ئاگر) دەهێنێت کە تەعبیر لە عەقڵی کۆمەڵگە دەکات. کە ئەوەی بەرهەمی دەهێنێ لەسەر شتەکان بەتەنیا سێبەرە و هەقیقەت نییە. واتە ئەوە ڕووناکیی ئاگرەکەیە وا دەکات شتەکان دەربخات. مرۆڤ لەو بارەدا کۆمەڵگە شتەکانی بۆ حازر دەکات و مرۆڤیش ناچارە شوێن ئەم سێبەرانە بکەوێت، چونکە هێشتا لەباری بوون بە کردەدایە چونکە هەر شتێک کە لە دەرەوەی مرۆڤ دێت ئایدۆلۆجیایە، ئایدۆلۆجیاش لە سێبەر بەولاوە هیچی تر نییە. دواتر سوکرات باسی ئەوە دەکات سێبەرەکان جێگەی هەقیقەتی شتەکان دەگرنەوە، ئەم قۆناغەی

هەمان قۆناغی بەرەو ئەوچوون و ئەونوێنییە. بەڵام سەیر بکەین بزانین سوکرات چۆن رێگە خۆش دەکات بۆ دەرکەوتنی عەقڵ و رۆیشتنی ئەوی تر. سوکرات باسی ئەو حاڵەتە قورسەی ناو مرۆڤ دەکات، کە هەست دەکات ئەو سێبەرانە هەقیقەت نین و کۆمەڵگە رێک کەوتووە لەسەری. لەم بارەدا دوو جۆر لە مرۆڤ جیا دەبنەوە، یەکیان نایەوێت دەستبەرداری ئەو سێبەرانە بێت. هەروەک سوکرات دەڵێت سێبەرەکان بەهەقیقەت دەزانین و هەقیقەت بەسێبەر دەبینین.

چونکە مرۆڤ بیرەوەریی هەیە لەگەڵ شتەکانی کۆمەڵگەدا و خەونی بینا کردووە لەسەریان بەرامبەر بەمەش کۆمەڵگە وێنەی داوە بەم کەسە وەک وەزیفە و کەسایەتی و... تاد. جا دەبێت مرۆڤ ئەم شتە بپارێزێت هەتا کۆمەڵگە حیسابی بۆ بکات. راستیی شکاندنی ئەم پەیمانە ژێرەوانکێیەی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگە زۆر قورسە و کەم کەس هەیە خۆی بدات لەم رێگەیە. ئەوانەشی ئەم رێگەیە هەڵدەبژێرێت ئەوانە فەیلەسووفە راستەقینەکانن. ئەمانە جۆری دووەمی مرۆڤەکانن، هەر کاتێک کە هەقیقەت بەیان دەکەن لە بەردەم کۆمەڵگەدا ئەو کاتە هەر وەک سوکرات ئامادەیی بۆ دەکات لە نموونەکەدا کە دەڵێت چاوی تووشی نەخۆشی بووە، کۆمەڵگە دەڵێت عەقڵی تێکچووە و شێت بووە یان نەخۆشیی دەروونیی هەیە. ئەمەش شەڕی کۆمەڵگەیە لەگەڵ مرۆڤەکە نایەوێت خۆنوێن بێت و تەعبیر لە خۆی بکات، بگرە هەرگاڤ ئەو بنوێنێت و گوزارشت لە ئەوی تر بکات.

جا کاتێک مرۆڤ بڕیار بدات کە دەست لە سێبەرەکان بەربدات و بەرەو هەقیقەتی شتەکان بڕوات تووشی سەرئێشە و ناڕەحەتی دەبێت، هەروەک سوکرات بەچاوئێشە باسی دەکات، چونکە بەرەو حاڵەتی (عەدەم) دەڕوات کە قورسترین حاڵەتی مرۆڤە. چونکە مرۆڤ خۆشی سێبەرە و دیار نابێت، هەتا مرۆڤ زیاتر بەرەو عەقڵ بڕوات ئەو زیاتر کاڵ دەبێتەوە لە کۆمەڵگەدا، چونکە هەموو شتە سێبەرەکان کەشف دەکات لە کۆمەڵگەدا و ئیتر بار دەکات و دەڕوات. دیارە بەبیرکردنەوە نەک بەجەستە. دواتر سوکرات باسی ئەوە دەکات کاتێک مرۆڤ دێتە دەر لەژێر عەقڵی کۆمەڵگە و واز لە سێبەرەکان دەهێنێت ئەو کات شتەکان وەک خۆیان دەبینێت و لە خۆی تێ دەگات. سەرەتا شتەکان دەناسێتەوە و دواتر بەرەو ئەوە دەڕوات کە ئاخۆ هەقیقەتی شتەکان بەهۆی چییەوە کەشف دەکرێن.

ئەو کاتە مرۆڤەکە دەگەڕێتەوە بەردەم عەقڵ، کە سوکرات بە (خۆر) وەسفی دەکات. عەقڵ وەک سەرچاوەی رووناکییەکە دەدۆزێتەوە کە هەم شتەکان ئاشکرا دەکات هەم خۆشی. دواجار هارمۆنیەتی نێوان خۆی و شتەکانیش دەدۆزێتەوە. دواتر سوکرات خۆی لەو رەخنەیەش قوتار دەکات کە خۆر لە دەرەوەی مرۆڤ بێت. بەوەی گاڵتەی دێت گەر مرۆڤ بیەوێت زانستێک دابهێنێ کە بەفێرکردنی مرۆڤ عەقڵ بخرێتە ناویەوە، بگرە تەواو یەقینی هەیە کە توانای زانین لەناو عەقڵی مرۆڤ خۆیایەتی. چونکە سوکرات ئەم فەزیلەتە لە ناوەوەی خۆیدا دەدۆزێتەوە و لەناویش ناچێت بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بزری بکات و کوێری بکاتەوە و هەر لەسەر سێبەرەکان بژیت. گەر مرۆڤ بەرەو (خۆر- عەقڵ) چوو، ئەوە بەرەو خۆی چووە چونکە جەوهەری مرۆڤ عەقڵیەتی نەک جەستە و دەروونی، یان ئەو وێنەیەی کە کۆمەڵگە بۆی دروست دەکات. ئیتر عەقڵ بەناو جەستە و دەروونندا دەڕوات و خۆی دەنوێنێ. چەمکی (خۆنوێنی) ئەوەیە کە مرۆڤەکە ئەوە دەنوێنێ بۆ عالەم کە خۆیەتی و کەسی تر نییە. ئەم چەمکەش دەتوانین بیدۆزینەوە لای زۆربەی فەیلەسووفەکان. بەڵام لە وشە و میتافۆری جیاوازدا، فەیلەسووفە ڕاستەقینەکان ئەوەیان لا گرینگ بووە کام شت لە (خۆر _ عەقڵ)ەوە هاتووە و چاوەڕێی ئەنجام و سوود و قازانجیان نەکردووە. چونکە مرۆڤ هەتا بێ نیاز نەبێت لە عەقڵ، عەقڵ ناچێتە لای. سوکرات دواتر باسی خاڵێکی گرینگ دەکات ئەویش بەتەنیا مانەوەی خۆنوێنەکانە. کە کۆمەڵگە دەریان دەکات و دەیانکوژێت و گاڵتەیان پێ دەکات، بەڵام بەڕاستی بەختەوەرەکان هەر خۆنوێنەکانن، چونکە بەڕاستی دەژین نەک بە وەهم و بە سێبەر. ئەوەی گرینگە لێرەدا و لەسەر بنەمای ئەم نموونەیە، سێ چەمک و سێ قۆناغی گرینگ هەیە لە ژیانی مرۆڤدا ئەوانیش (ناکردن) و (عەدەم) و (خۆنوێنی)یە. کە سوکرات لەم نموونەیەدا وەک بیرکردنەوە باسی کردوون بەڵام لە باوەشی ئەو حیکایەتەدا. دیارە سوکرات مردنەکەی خۆشی باس دەکات، چونکە سوکرات هێندە دڵسۆز بوو بۆ شار وازی نەهێنا، هەتا کوشتیان، هەروەک ئەوەی لەم نموونەیەدا باسی ئەوە دەکات کە ئەو کەسەی کە چووەتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە کە دێتەوە لای هاوڕێکانی گاڵتەی پێ دەکەن، دوایی گەر هەر وازی لێ نەهێنان ئەوا رەنگە بیکوژن. ئەمەش لە دڵسۆزیی سوکرات خۆی بووە کە گەیشتە ئەو چارەنووسە کە بەڕاستی چارەنووسێکی باش و عەقڵانی بوو.

**٣- ناكردن:**

هەر لەسەر رۆشنایيی نموونەی ئەشكەوت دەبێت باسی قۆناغێک بكەين قۆناغی پێش دەركەوتنی (خۆر-عەقڵ)ە، كە مرۆڤ پڕە لە سێبەری شتەكان و لە ڕێگەی (ئاگر- عەقڵی كۆمەڵايەتی)يەوە هاتوونەتە ناوی و بۆ زەمەنێک بەبێ ويستی خۆی ئەونوێنە. جا كاتێک عەقڵ دەردەكەوێت لە مرۆڤدا ئەوا بەناو جەستە و دەرووندا دەڕوات، پاشان عەقڵ پێويستی بەشوێن هەيە بۆ دەركەوتن و شوێنەكانی مرۆڤيش هەمووی پڕن بەسێبەری شتەكان. بۆيە مرۆڤ دەبێت سەرەتا خۆی بەتاڵ بكاتەوە لە سێبەرەكان، ئەم حاڵەتە زۆر ئاڵۆزە و گەلێک فەيلەسووف باسيان لێوە كردووە. چونكە بەردەوام مرۆڤ وادەزانێت بە دەركردن و بە ناكردن قوتار دەبێت لە ئەوی تر و بەرەو خۆی دەڕوات. هەر بۆيە دەبێت زۆر وريا بين لە باسكردنی ئەم حاڵەتەدا، سێبەرەكان سەرەتا هەقيقەتن لای مرۆڤ. ئەم سێبەرانە نامرن و ناڕۆن هەتا شتەكە خۆی دەرنەكەوێت، بە دەركەوتنی شتەكە سێبەرەكە دەڕەوێتەوە و بنبڕ دەبێت.

بەڵام مرۆڤ پێش ئەوەی ئەمە بزانێت سەرەتا سێبەرەكان (نا) دەكات هەر ناكردنێكيش كوشتنی سێبەر نييە، چونكە سێبەرەكان بەناكردن ناڕۆن و هەر دەمێننەوە لەسەر مرۆڤ. ئەمە لەلايەک، لەلايەكی ترەوە كاتێک مرۆڤ بێزار دەبێت لە واقيع و دەچێتەوە ناو ژيانی خەياڵی لەوێش بێزار دەبێت، ئەوجا بۆ رزگاربوون لەم سێبەرانە، دەكەوێتە ناكردن و شەڕ و هەرا، شتەكانيش بەناكردن و شەڕ ناڕۆنە دەرەوە ئەو كاتە مرۆڤەكە تووشی بێ هيوايی دەبێت و بەردەوام يارييەک هەيە كۆتايی نايەت. ئيتر بە دووبارەبوونەوەی ئەم بارە كەسەكە بەردەوام لە ژيانی خەياڵيدا دەژيت تا ئەو ڕادەيەی كە واقيع و خەياڵ تێكەڵ دەكات. جا مرۆڤ هەيە كاتێک كە قسە لەگەڵ بوونەوەرێكی ناو خەياڵی دەكات ئەوا لە واقيعدا لێی دەردەكەوێت و كۆمەڵگەش بە شێت و نەخۆش سەيری دەكات.

ئەم حاڵەتە حاڵەتی ناكردن و شەڕكردنە لەگەڵ سێبەری شتەكاندا. بۆ نموونە زۆرێک لەوانەی نەخۆشيی دەروونييان هەيە، دەناڵێنێت بەدەست كێشەكانيانەوە تووشی ئەم جۆرە حاڵەتە دەبن، هەموو بيرەوەرييەكانی ناو يادگە لە يەک كاتدا هێرشی بۆ دەبەن و ئەويش دەكەوێتە شەڕ لەگەڵ وێنەی شتەكاندا و هيچ دەرگەش نييە.

جا ئەم مرۆڤە دەکەوێتە بەردەم کۆمەڵێک ڕێگە یان ئەوەتا دەکەوێتە ناو خەیاڵەوە و نایەتەوە ناو واقیع. شێتی غایببوونی کەسەکەیە لە واقیع و حازربوونیەتی لەناو ئەو جێگەیەدا کە پێوەی گیرۆدە بووە، یان ئەوەتا تەواو واز لە خەیاڵ دەهێنێ و دێتەوە ناو واقیع و ناوەوەی خۆی دەکوژێت. ئەمەش هەر باش نییە و چارەسەر نییە هەروەک زانستی دەروونناسی بەناوی (دەروونناسی کۆمەڵایەتییەوە) کە مرۆڤەکە فێری چۆنیەتیی هەڵسوکەوتکردن دەکەن لە واقیعدا. کە بەبێ تێگەیشتنی شتەکان، کەسەکە دوور دەخەنەوە لە خەیاڵ و بیرەوەری و لە واقیعدا زیندانیی دەکەن، جا کەسەکە بەردەوام لە ڕاڕایی و دوودڵی و نائارامیدا دەگوزەرێت.

چونکە شتێک هەیە نایزانێت و حزووریشی هەیە، ناکردن خەتەرترین حاڵەتی مرۆڤە کە ڕێگە دەگرێت لە دەرکەوتنی عەقڵ هەتا شتەکان بناسێتەوە و هۆشیار بێتەوە بەرامبەر بەخۆی و بەدەوروبەری. بۆیە مرۆڤ نابێت نا بکات بەڵکو دەبێت ئارامی ئەوەی هەبێت لە شتەکان تێ بگات. چونکە ناکردن دەرکردنی شتەکان نییە، بەڵکو حازرکردنەوەیەتی بۆ ئەوەی جارێکی تر بێتەوە ناو مرۆڤ. مارتن هایدگەر لە گوتاری (میتافیزیک چییە؟)دا لە باسی دەرکەوتنی بووندا[٤١] دێتە سەر باسکردنی (نا) و دەڵێت. "عەدەم ڕەسەنتر و بنەبڕەترە لە ناکردن"[٤٢]

هایدگەر دەیەوێت باسی خراپی و بۆشیی نا بکات لەگەڵ چاکی و پتەویی عەدەم. چونکە عەدەم و ناکردن لە دەرەوەڕا زۆر لەیەک نزیکن بەڵام لە ناوەوەڕا زۆر جیاوازن لە یەکتر. هایدگەر مەرجی دەرکەوتنی (بوون- عەقڵ) بەعەدەم دەزانێت و ناکردنیش دەکاتە دەرەوەی هاوکێشەکە، دواتر هایدگەر دەڵێت:

"ئێمە دەتوانین سەرجەمی بوون هەر لە بیرۆکەدا کە بەبیرماندا دێت و خەیاڵی دەکەین لە بیردا نایکەین و بە نا بیر بکەینەوە، بەڵام بەم ڕێگەیە تەنیا ڕوخساری عەدەممان چنگ دەکەوێت و عەدەم خۆیمان دەستگیر نابێت[٤٣]

چونکە هایدگەر عەدەم دەکاتە مەرجی دەرکەوتنی عەقڵ، بگرە هەر عەدەم خۆی دەرکەوتنی عەقڵە، دواتر دەڵێت : "ئیتر ناکردن چەندە فرەلایەن و هەمەچەشن بێت و بەئاشکرا و بەپەنهانی بێت، ناکرێت بکرێتە مەرجی بەدیارکەوتنی عەدەمێک کە لە بنەڕەتدا سەر بە بوونە".[٤٤]+

ناکردن هەروا بەهاوارکردن نایەتە ئاراوە، ناکردن دەبێت بنەمایەکی عەقڵیی

هەبێت ئەوەش کە بەم بنەمایە بێت لە ناکردن دەچێتە دەر و لە عەدەمدا خۆی دەدۆزێتەوە.

ئەگەرچی لەناو رۆشنبیری کوردیدا (نا، عەدەم) نەک هەر تێکەڵی کراون بگرە هەر باس نەکراوە و بابەتێکی نامۆیە بەگوێی خوێنەرانی ئێمە. بەڵام ئێمە نیازمان بەوە هەیە کە بابەتەکانی رۆشنبیری کوردی بگۆڕین و قوتاری کەین لەو چەمکە سواوانەی کە ئەمڕۆ هەیە وەک (جیاوازی- مەدەنیەت- دیموکراسی- مافی ژنان... تاد) لەبەرئەوەنا کە ئەمانە خراپن، لەبەرئەوەی کە بەبێ بنەما باس دەکرێن. هەر بۆیە ئەو فەوزایە دروست بووە، کەس نازانێت کێ ڕاستە و کێ هەڵەیە.

**٤- عەدەم- نەبوون:**

حاڵەتی ئەو کەسەیە لە نموونەکەی سوکراتدا کە دەچێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە و لە جیاتیی سێبەرەکان شتەکان دەبینێت و دەگەڕێتەوە ناو ئەشکەوتەکە دواتر لە جیاتیی ئاگر خۆر دەبینێت. حاڵەتێکی مرۆڤ هەیە پەرۆشیی نامێنێ بۆ وێنەکان و وردە وردە خۆشی بەرەو نەبوونی دەڕوات. لێرەدا بەتەنیا ترووسکاییەک لەناو عەقڵی بەدیار کەوتووە بۆیە پەرۆشی نییە بۆ خۆی و بۆ سێبەری شتەکان.. جا مرۆڤ هەیە تا ئێرە بڕ دەکات و دەچێتە بەردەرگەی ماڵی خۆی بەڵام کە سەیر دەکات ڕێگەکە رۆشن نییە و کەسیش نییە یارمەتیی بدات و زانیاریی هەبێت لەبارەی ئەم ماڵەوە، ئیتر کەسەکە یان واز دەهێنێ یان هەر لەو دۆخەدا دەمێنێتەوە. چونکە ئەم شوێنە کە خودی عەقڵ تیایدا حازرە، نەک لای مرۆڤ تەنانەت زانست رەتی دەکاتەوە و بە وەهم و خەیاڵ ناوی دەبات، بەڵام کەسانێک هەن کە ئەم دەرگایەیان کردووەتەوە و گەیشتوونەتەوە ماڵی خۆیان. جا لەگەڵ دەرکەوتنی ترووسکاییی عەقڵ یەکەمین شتێک کە تووشی هەڵوەرین و داڕووخان دەبێت ئەو شتانەیە کە مرۆڤ لە کۆمەڵگەوە وەری گرتووە. پاشان خۆشی بەرەو ئەو رووخانە دەڕوات، بەڵام ئەوەی لەناودەچێت لەم حاڵەتی عەدەمەدا وێنەی ئەوە نەک جەوهەرەکەی.

ئەم بارە تووشی هەڵخلیسکانی دەکات. چونکە جیا لە سێبەرەکانی مرۆڤ خۆشی شتی زیاد کردووە و خەونی بینا کردووە لەسەر رۆشناییی ئەو سێبەرانە، جاریش هەیە مرۆڤ هەیە دەکەوێتەوە ناو عەقڵی کۆمەڵگە. هەروەک سوکرات

باسی حاڵەتی ئەو کەسانە دەکات کە کتوپڕ بڕۆنە دەرەوەی ئەشکەوتەکە، ئەوا بەپڕتاو دێنەوە ژوورەوە بۆ لای سێبەری شتەکان، (عەدەم) لە ژیانی مرۆڤدا زۆر نارەحەت و قورسە و مرۆڤ بەردەوام تووشی دارووخان دەکات. (عەدەم) یەک جار روو نادات لە ژیانی مرۆڤدا، بگرە ژیانی مرۆڤ پڕە لە عەدەم چونکە بوون لە مرۆڤدا بەیەک جار دەرناکەوێت هەتا عەدەمیش یەک جار بێت. جار هەیە مرۆڤ دەکەوێتە ناو عەدەم و هەقیقەتی بۆ ئاشکرا دەبێت، بەڵام دوایی ئەم هەقیقەتە وەک هەبوو دەبێتە بیرەوەری، مرۆڤەکەش لەسەر ئەم بیرەوەرییە شت بینا دەکات. بۆیە دەکەوێتەوە ناو رووخانی ئەم بیرەوەرییە و عەدەم دەست پێ دەکاتەوە. گەورەترین سوود بۆ مرۆڤ لە عەدەمدایە چونکە هەقیقەت ئاشکرا دەبێت و هەردەم رازێک هەیە کەشف دەکرێت، ئا لێرەدایە هایدگەر عەدەم بە رەسەن و نا بە نارەسەن وەسف دەکات.. هایدگەر زۆر ورد باسی عەدەم دەکات و سەرەتا وەک بابەتێک پرسیاری ئاراستە دەکات.

"لەگەڵ ئەمەدا هەوڵ دەدەین لەبارەی عەدەمەوە بپرسین عەدەم چییە؟"(٤٥)

دواتر دەیەوێت بەشوێن عەدەمدا بڕوات و لە جێگەکەی دەگەڕێت "لە چ جێگەیەکدا بەدوای عەدەمدا بگەڕێین؟ چۆن دەیدۆزینەوە"(٤٦)

پاشان باسی عەدەم دەکات و دەڵێت:

"دەبێ سەرەتا هەبوو هەبێت ئینجا عەدەم دەتوانێ خۆی دەربهێنێ"(٤٧)

یان دەڵێت "دەرفەتی تری ئەم کرانەوەیە ئەوەیە کەوا بوون دەردەکەوێت نەک وەک مرۆڤێکی ئاسایی بەڵکو وەک مرۆڤێکی خۆشبەخت"

ئەم وتارەی هایدگەر تەواو یەک دێتەوە لەگەڵ نموونەکەی سوکراتدا، ئەوەی دەچێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە، دواتر دەزانێت چەند بەختەوەرە و ئیتر مرۆڤەکەی جاران نییە و کە دواتر هاوڕێکانی دەبینێ. دەزانێ کە چەند بەستەزمانن و بێ ئاگان لە ژیان و لە شتەکان، بەڵام هاوڕێکانی گاڵتەی پێ دەکەن و دەڵێن شێت بووە. عەدەم ناخۆشە و قورسە، بەڵام ئەنجام و ئاکامەکەی هەردەم ئەوەیە کە دڵ دەیەوێت و مرۆڤ تەواو خۆشبەخت دەکات. هایدگەر تەنیا شتێک کە لە بیری کردووە ئەوەیە کە عەدەم یەک جار نییە لەناو مرۆڤدا، بگرە چەندان جارە و، دیاریکراو نییە و بەدرێژایی ژیانی مرۆڤ هەیە. مرۆڤ لە بەردەم ئەوەدایە کە

تووشی ئەم حاڵەتە بێت. چونکە عەقڵی کۆمەڵگە بەیەکجار واز لە مرۆڤ ناهێنێ، بگرە هەموو کات دەوری مرۆڤ دەدات کە بیر نەکاتەوە. جا مرۆڤ بۆ ڕاماڵینی عەقڵی کۆمەڵگە و دەرکەوتنی عەقڵی خۆی پێویستی بە عەدەم هەیە. هەروەک سوکرات باس دەکات کە هاوڕێکانی دواتر دەیانەوێت بیکوژن گەر کەسەکە واز نەهێنێت. ئاوهاش کۆمەڵگە جەلادی کەسە دڵسۆزەکانی خۆیەتی. چونکە کۆمەڵگە نایەوێت بە خەبەر بێتەوە، دوایی ئەم حاڵەتەی مرۆڤ ئیتر کە دەچێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە لەئامادەسازیدا دەبێت کە عەقڵ دەرکەوێت و بگاتە خۆنوێنی.

**٥- خۆنوێنی:**

هەر لەژێر ڕۆشنایی نموونەکەی سوکراتدا، کەسەکە کە ئاگرەکە دەدۆزێتەوە و سێبەرەکان دەپشکنێ، پاشان دەچێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە شتەکان دەناسێتەوە، ئەوە تووشی حاڵەتی عەدەم دەبێت و وێنەکان هەرەس دەهێنێت و مرۆڤیش خۆی هەڵدەخلیسکێت. چونکە هیچ نییە دەستی پێوە بگرێ.

"لە پەشێوی و نائارامیدا زمانمان گۆ ناکات چونکە هەبووەکان بەگشتی هەڵدەخلیسکێنێت و عەدەم پاڵپەستۆ دروست دەکات"(٤٩)

پاشان مرۆڤ کە شتەکان دەبینێت بە هەقیقەتی خۆیان. ئەو کات تووشی تێڕامان دەبێت بەشوێن ئەوەدا دەگەڕێت بەهۆی چییەوە هەقیقەت نماینده دەبێت؟ ئەوە چییە وادەکات هەقیقەت دەرکەوێت؟ سوکرات باسی خۆر دەکات بەهۆی ڕووناکیی ئەوەوە شتەکان دەناسرێنەوە (عەقڵ- خۆر) لەناو مرۆڤدایە، چونکە سوکرات دواتر باسی ئەوە دەکات کە عەقڵ لەناو مرۆڤ خۆیایەتی و لە دەرەوەی مرۆڤەوە نەهاتووە. بگرە وەک توانایەک لەناو مرۆڤدایە و نیازی بەوە هەیە کە بێتە دەر. ئێستا با بپرسین خۆنوێنی چییە؟

خۆنوێنی ئامادەبوونی عەقڵە لە مرۆڤدا. واتە ئەوەی مرۆڤەکە دەینوێنێت لە واقیعدا خۆیەتی و کەسی تر نییە. ئەو توخمەیە کە هەر لەناو خۆیایەتی و لە دەرەوە بۆی نەهاتووە، بەڵکو عەقڵی خۆیەتی. لێرەدا (خۆ) ئاماژەیە بۆ منی ڕەسەنی مرۆڤ. (خۆنوێنی) جیاوازە لە (خۆنواندن). خۆنواندن لە زمانی کوردیدا کارە و کارێکی تێپەڕە. واتە هەموو کات یەکێک هەیە خۆمانی بۆ دەنوێنین، بەڵام (خۆنوێنی) کارێکی تێنەپەڕە و کەسەکە بۆ خۆی خۆنوێنە، کەسی تر لە ئارادا

نییە. بگرە عەقڵ پاڵەپەستۆ دەکاتە سەری و دەیکاتە خۆنوێن و دووری دەخاتەوە لە ئەونوێنی.

وتمان سەرچاوەی رووناکییەکە عەقڵ خۆیەتی، بیرکردنەوەی رەسەن دابەزینی هەمەکییەتی عەقڵە بۆ ناو بەشەکییەکان. کە روون نین و بەدابەزینی عەقڵ روون دەبنەوە و دەردەکەون. مرۆڤ لە دابەزینی ئەم هەمەکییەتەدا دوو ئەرکی گرینگ هەیە رووبەرووی دەبێتەوە، یەکیان ئەوەیە کە هەر بەشەکییەک کە رۆشن نییە ئەم دەیزانێت و ئاشکرا دەبێت. واتە عەقڵ دادەبەزێتە ناو ئەو بەشەکییەوە و هەقیقەت وا لێ دەکات. ئەمەش لە رێگەی پرسیاری ئەوەی کە... چییە؟

واتە لە رێگەی هەبووەوە بیر لە بوون بکاتەوە(٥٠)، جا لەم دووبارەدا مرۆڤ خۆی شتەکان دەبینێ.

هەروەک سوکرات باسی دەکات کە دوور دەکەوێتەوە لە ئاگر و لە سێبەر و لە ئایدۆلۆجیا و ئەونوێنی، بەم رێگەیە مرۆڤ خۆنوێن دەبێت و هەقیقەتی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت، جا ئەم دەرکەوتنە لە ئاستی زمان یا رەنگ یان کردار بێت ئەوا کێشە نییە.

"چەندە مرۆڤ هەبێت فەلسەفەکردن بەشێوازی دیاریکراو دەبێت"(٥١)

ئەفلاتوون ئەوە رەت دەکاتەوە کە دەرکەوتنی عەقڵ تایبەت بێت بەکۆمەڵە کەسێکەوە نەخێر، (چونکە مرۆڤایەتی لە خاوەنداریەتی بەعەقڵدا یەکسانن، بەڵام ئیتر زۆرێک هەیە رازییە بە ئاگرەکە و نایەوێت هەقیقەت ببینێت. مرۆڤیش هەیە بەسەروەریی عەقڵ مرۆڤبوونی خۆی دەپارێزێت. مرۆڤ لە حاڵەتی خۆنوێنیدا پێ دەخاتەوە ناو دڵی خۆی و دەگەرێتەوە بۆ ماڵەوە.(٥٢) لەوێدا ماڵی خۆی دەدۆزێتەوە و دادەمەزرێت. لە عەدەمدا وادەزانێت کە ئیتر ژیانی رووخاوە و مردن بەرەو ئەو دێت بەڵام کە عەقڵ دەردەکەوێت و قاچ دادەنێت لەسەر منی خۆی ئەو کاتە دەزانێت ژیان چییە و خۆی چییە و بەختەوەرییەکی گەورە دەدۆزێتەوە لەناو ئەو عەزابەدا. خۆنوێنی پرۆسەیەکی گەورە و درێژکراوە بەدرێژایی ژیانی خۆی. هەتا مردنی مرۆڤ، مردنی مرۆڤ کۆتا خۆنوێنی مرۆڤە، چونکە ئیتر ئەوە خۆیەتی دەمرێت نەک کەسی تر. لە دوای حاڵەتی عەدەمەوە مرۆڤ پاک دەبێتەوە لە سێبەرەکان و ئیتر مرۆڤ لەگەڵ ئایدیاڵ و جەوهەری شتەکاندا مامەڵە دەکات و لە

ئاستی بوونێکی کۆمەڵایەتی و ئەونوێن و ڕۆژانەوە بەرز دەبێتەوە بۆ سەر ئاستی بوونێکی بیرکەرەوە و خۆنوێن. ئەم مرۆڤە کە دنیاکان تاقی دەکاتەوە لە نێوان دوو جیهاندا دەگوزەرێت جیهانی عەقڵ و جیهانی واقیع. واقیع عەقڵانی دەکات و عەقڵانییەتیش واقیعی دەکاتەوە.

جا ئەمە فەیلەسووف بێت وەک : (سوکرات، ئەرستۆ، کانت، دیکارت، هیگڵ، مارتن هایدگەر،... تاد) یان هونەرمەند بێت وەک (ڤان کوخ) یان پیاوێکی ئاینی وەک : (قەدیس ئۆگستین و ناسری سوبحانی) یان شاعیر بێت وەک: (هۆڵدەرلین و مەحوی) گرینگ نییە لە چ فۆرمێکدا دەردەکەوێت.

واقیع لەم بارەدا چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێت کە شوێنی ژیانی مرۆڤ بێت بەدەر لەوە مرۆڤایەتی سەرگەردانە و سەراسیمە دەگوزەرێت. دوای ئەم حاڵەتە مرۆڤ ئەوە درک دەکات کە شتێک هەیە بۆی دەژیێت هەروا بێ بنەما و بێ بڕوا نەهاتووە بۆ ناو ژیان. ئەوەش بەیادی خۆمان بهێنینەوە کە عەقڵ وەک ڕووناکییەک و وەک هەمەکێک هەردەم ئامادەی دابەزینە بۆ دەرکەوتن، واتە بێ خەمە کە واقیعی بێتەوە. بەڵام ئیتر مرۆڤ هەیە زەوینە هەیە، جار هەیە مرۆڤەکە ئەوە هەڵدەبژێرێت کە عەقڵ واقیعی بکاتەوە بەڵام زەوینە لەبار و گونجاو نییە. یاخۆ زەوینە هەیە و مرۆڤ نییە. بەواقیعیکردنەوەی عەقڵ و خۆنوێنی مرۆڤ ئەوە دەدۆزێتەوە کە بۆی دەگەڕێت. ئەوەی تووش دێت کە دەیەوێت، بەڵام با بزانین عەقڵ چۆن و بە چ شێوازێک لەناو مرۆڤدا دەردەکەوێت؟ ئاخۆ چۆنایەتیی دەرکەوتنی عەقڵ چۆنە؟ مرۆڤ چۆن لەنێوان دەنگی ئەوی تر و منی خۆیدا شتەکان بناسێتەوە و لێکیان بکاتەوە؟ بەچیدا بزانێت کامە منی خۆیەتی کامە ئەوی ترە؟ عەقڵ کاتێک بەناو جەستە و دەرووندا دەڕوات بۆ دەرکەوتنی، مرۆڤ چۆن درکی پێ بکات؟

**٦- چۆنیەتیی دەرکەوتنی عەقڵ :**

ئەم ناونیشانەی سەرەوە غەدرێکی گەورەیە بەرامبەر بەعەقڵ، چونکە ئێمە ناتوانین شێواز و فۆرم و چۆنایەتی بۆ عەقڵ دیاری بکەین و بڵێین بەتەنیا لەم فۆرمەدا دەردەکەوێت...... نەخێر!

هەر بەوەدا کە چەندە مرۆڤ هەبێت ئەوەندە فەلسەفەکردن هەیە، ئەوا کۆنکرێتکردنی هەر چۆنایەتییەک بۆ دەرکەوتنی عەقڵ کارێکی پێشوەختە و

ناعەقڵانییە. چونکە عەقڵ خۆی سەروەری خۆیەتی بۆ دەرکەوتن و خۆی فۆرم دیاری دەکات. پێوەندییەکی گەورە هەیە لە نێوان رۆح و فۆرمدا.

هەرچی فۆرمە توانای ئەوەی هەیە کە ببێتە جەستە بۆ عەقڵ و دەرکەوتنی. بەڵام چۆنیەتیی دەرکەوتنی هەموو کات شیانێکە لە پێشمانەوەیە و هەر بە رووداوکردنێکی عەقڵ هەموو کات چاوەڕواننەکراوە، هەتا ساتی تەواوبوون و دەرکەوتنی. واتە بوون لە کاتی هەبووندا چۆنایەتی دیار دەکەوێت. بەڵام مرۆڤ هەردەم ئەم پرسیارە لە ناوەوەیدایە کە چۆنایەتیی عەقڵ چۆنە، بۆیە ناچارین بگەڕێینەوە ناو ئەو مرۆڤانەی (هەبووانەی) پێشتر بەم ڕێگەیەدا رۆیشتوون و چۆنایەتیی ئەوان بەدیار بخەین بە مەبەستی دەستخستنی مەعریفەیەکی لاوەکی. چونکە ئەو چۆنایەتییە بۆ کەسێکی تر دووبارە نابێتەوە واتە عەقڵ قەد لەیەک شێوازدا دووبارە نابێتەوە، چونکە عەقڵ رووناکییە و رووناکیش هەرگاف بەتازەیی لەدایک دەبێت، ئەوە نییە لە یەک شێوازدا دووبارە بێتەوە لێرەدا عەقڵ جیاواز دەبێتەوە لە شتەکانی تر.

ئەم دووبارە نەبوونەوە ئەوە نییە کە عەقڵ بەش بەش بێت و هەر جارە و بەشێکی دەرکەوێت... نەخێر! بگرە عەقڵ بۆ خۆی یەکە و زەوینەکانی جیاوازن. واتە جیاوازیی زەوینەکان و جیاوازی ئایدیالەکان جیاوازی دەخاتەوە. ئەمە تایبەتە بۆ باری دەرکەوتنی دەرەوەی عەقڵ. بۆ باری ناوەوەی مرۆڤ ئەو کاتەی عەقڵ دەیەوێت دەرکەوێت ئەم چۆنایەتییە و ئەم هەستکردنە. لای سوکرات لە شێوازی دەنگدا دەرکەوتووە. لە گفتوگۆی بەرگریدا (Apology) سوکرات باسی حاڵەتی ناوەکیی خۆی دەکات و دەڵێت:

"ڕەنگە یەکێک بپرسێت بۆچی من ئاوا خۆبەخشانە ئامۆژگاری پێشکێش دەکەم و سەری خۆم بەکاری خەڵکەوە دەئێشێنم. کەچی ناوێرم بێمە پێشەوە و ئامۆژگاریی شارەکە بکەم. خۆم پێتان دەڵێم بۆچی ئێوە گوێتان لە من بووە لە کاتی جیاجیادا لە شوێنی جۆراوجۆر باسی سروشتێک یان ئاماژەیەکم کردووە کە بۆم هاتووە. ئەوە لە یەزدانەوە بووە کە میلتۆس لە تۆمەتەکەیدا بەگاڵتە پێکردن تاوانبارم دەکات، ئەم ئاماژەیە بریتییە لە دەنگێک کاتێک بۆ یەکەمین جار هاتە بەرگوێم منداڵ بووم. ئەو دەنگە بەردەوام ڕێگریم لێ دەکات لە کردنی شتێک لەو

شتانەی دەیانکەم هەر ئەمەش رێی لێ گرتم لەوەی ببمە پیاوێکی سیاسی.."[٥٣]
لێرەدا سوکرات تەواو هۆشمەندانە باسی رەوشی ناوەخۆی دەکات و چۆنایەتیی دەرکەوتنی عەقڵ لە ناوەوەی خۆیدا بەیان دەکات.

کە پێش ئەوەی فێری کەن عەقڵ دەرکەوێت، لە ناوەوەدا وەک دەنگ عەقڵ شتەکانی خۆی بەسوکرات دەڵێت و دواییش باسی ئەوە دەکات کە ئەم (عەقڵ)ە هەردەم رێگری دەکات لەوەی شتێک بکات. سوکرات باسی ئەوە دەکات کە لە شێوازی دەنگدا هەستی بەعەقڵ کردووە و فەلسەفەکەی بە واقیعیکردنەوەی ئەو دەنگە بووە. چونکە سوکرات ئەم دەنگەی لە ژیانی خۆیدا واقیعی کردووەتەوە هەتا مردنەکەشی بەرەزامەندیی ئەم دەنگە بووە. سوکرات خۆی سەرەتا بەناو عەدەمدا رۆیشتووە، ئەوجا دەنگی راستەقینەی خۆی دۆزیوەتەوە، چونکە پێش عەدەم مرۆڤ پڕە لە دەنگی ئەوی تر، جا دەنگی کۆمەڵگە و باوک و مامۆستا و... تاد. هەموو ئەم دەنگانەش خاسیەتی ئاراستەکردنیان هەیە، کە مرۆڤ ئاراستە دەکەن بۆ هەر کردارێک یان گوفتارێک. حاڵەتی عەدەم حاڵەتی بێدەنگکردنی ئەوانی ترە لەناو مرۆڤدا و دواتر بیستنی دەنگی ڕاستەقینەی خۆتە. واتە مرۆڤ خۆی قسەکەرە و خۆشی گوێگرە.

سوکرات دەڵێت ئەمە لە یەزدانەوەیە و دواتر باسی ئەوە دەکات کە من هەردەم بەقسەی ئەم دەنگەم کردووە هەر باشیشم بۆ هاتووە. سوکرات باسی خۆنوێنی دەکات، کە مرۆڤ پاک دەبێتەوە لە ئەوانیتر و هەموو کات شتەکان بەدروستی ئەنجام دەدات. چونکە یەکانگیر دەبێتەوە لەگەڵ عەقڵدا و دواتریش ئەم رەوشە یەکانگیربوونەوەیە لەگەڵ خاڵقدا (خوا). دواتر سوکرات باسی رووداوی مردنەکەی دەکات. "بەڵام ئێستا لە هیچ کام لەوانەی لۆمەیان کردووە شتێکی تیا نییە، کە سروشەکەم (دەنگەکە) دژم بوویێت چ شتێک وەربگرم تا ببێتە روونکردنەوەی ئەم بێدەنگییە؟ پێتان دەڵێم ئەمە نیشانەیەکە بۆ ئەوەی چیم بەسەر هاتووە باش بووە. هەروەها ئەوانەی لە ئێمە وادەزانن کە مردن خراپە بەهەڵەدا چوون چونکە ئەگەر بەرەو خراپە بچوومایە (دەنگەکە) دژم دەوەستایەوە."[٥٤]

سوکرات زۆر بێ پەروا و بێباکە لە بەرەوچوونی بەرەو عەقڵ ئەگەر بۆ مردنیش بێت. واتە ئەگەر چوونی ئەو بۆ لای عەقڵ مردن بێت ئەوا چوونەکەی باشترە لەوەی

بمێنێتـەوە و بژیت. چونکە مـردنێک کـە عـەقڵی بێت زۆر باشـتـرە لە ژیانێک کـە واقیـعی بێت، لێرەدا ئێمـە چۆنایەتییـەکی دەرکـەوتنی عـەقڵـمـان ڕۆشن کـردەوە لە ڕێگەی سـوکراتـەوە. ئەم گـوێگرتنەش جـیـاوازە لە کـاری گـوێ، چـونکە ئەمـە هـیچ پێـوەندیی بـە گـوێوە نیـیـە. لـە زمـانی عـەرەبیـدا بە(سـمع) دەوترێت و لە کـوردیدا دەتوانین بڵێین (بیستن) و جیای بکەینەوە لە گوێگرتن.

٧- بیرەوەری و عەقڵ:

هـەر لە سـەرەتـاوە عـەقڵ خـۆی جـیـا دەکـاتەوە لە بیـرەوەری، چونکـە بیـرەوەری مـادەیە و عـەقڵ مادە نییـە. هـەروەک پێشـتـر باسـی مادەمـان کـرد کـە گـشتگیـرمـان کـرد، بیـرەوەری بەوە مــادەیە کـە تەواو لـە گـەشــەکـردن و بزاوتن کــەوتووە. وەک حیکایەتێک کۆتـا هـاتووە. گـەر جـوولـەیەکی تێدا بێت ئەوا لـە دووبارەبوونەوەیدایە. وەگـەرنا بیـرەوەری گـەشـە نـاکـات و هـیچ بەرەو پێشـچـوونێکی تێدا نییـە، بەڵام بۆ عــەقڵ مــادە نـیـیــە و نـاکــرێت بوترێت مــادەیە. چـونکە عــەقڵ هـەردەم لە بـزاوتن و دەرکـەوتندایە. دیـارە کـە عـەقڵ دەردەکـەوێت لە فـۆرمـێکدا، ئەوە فـۆرمـەکـەیە کـە دەوەسـتـێت و دەبێـتـە مــادە، بەڵام عــەقڵ نـایەتە نـاو ئـەم بەمــادەبوونەوە، چونکـە ناتوانین ئەم عـەقڵە بـدۆزینەوە لەناو ئەو مادەیەدا، بەڵام هـەر عـەقڵیشـە دەرکەوتووە چونکە عـەقڵ ئەو چۆنایەتـیی خسـتـووەتەوە، واتە عـەقڵ مـادە نییـە، بەڵام چۆنایەتی دەدات بـە مـادە. کاتێک عـەقڵ بەو هەمـەکییـەتەی خۆیەوە بەشـەکی دەبێتەوە مـانای ئەوە نییە ئیتر کۆنکرێت بوو یان کەوتە ناو مادەوە... نەخێر! بگرە هـەر ئەو بنەمایە کە دەرکـەوتووە لەو فۆرمەدا. ئیمکانی ئەوەی هـەیە کە لە فۆرمـێکی تردا دەرکەوێت، واتە عــەقڵ کــۆن نابێت و هــەمــوو کــات تازەیە، کــاری مــرۆڤ بانگکردنـی ئەو هەمـەکییەتەیە بۆ ناو بەشـەکییە جیـاوازەکانی. سـوکرات لە باسـی عـەقڵدا دەڵێت: "وەک وتم یەکێک لە دوو ئەلتەرناتیڤی بەدوا دێت چ ئەگەر لە کاتی لەدایکبووندا ئەو زانینەمـان هەبوویێت و لە توێی ژیانیشـەوە بەردەوام بووبین لەسـەر زانینی. یاخـۆ دوای لەدایکبـوون. ئەوانەی وترا فـێـریان دەبین یان بیـرمـان دێنەوە فـێـربـوونیش بەتەنیا هـەر بیرهـاتنەوەیە"(٥٥)

لێـرەدا گــەر وریا نەبین تـووشـی تێکـەڵی دەبین لەوەی عــەقڵ و بیـرەوەری تێکەڵ بکەین، ئـەم دەقـەی سـوکـرات باسـی ئەوە دەکـات کـە عـەقڵ لەناو مـرۆڤـدایە و وەک

ئەندازەگیرییەک مرۆڤ خۆی تێدا دەبینێتەوە، واتە مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم خۆی و خۆی بیر دەکەوێتەوە، چونکە ئەوەی لەم ڕووتبوونەوەدا دەمێنێتەوە بەتەنیا مرۆڤ خۆیەتی و کەسی تر نییە. عەقڵ وەک کۆگا وایە، بەڵام کۆگاش نییە، چونکە ڕابردووی لە خۆیدا هەڵنەگرتووە وەک یادگە، بگرە عەقڵ کۆمەڵە شیانێکە تواناداری ئەوەی هەیە بێتە دی و نەشیەتە دی کاتێک مرۆڤ پشتگوێی دەکات. جا لێرەدا عەقڵ جیا دەبێتەوە لە یادگە، عەقڵ بنەماکانی تێدایە و توانای ئەوەیان هەیە لە فۆرمی جیاجیادا دەرکەون، بەڵام یادگە بیرەوەریی تێدایە و ئەویش توانای دەرکەوتنی هەیە وەک دووبارەبوونەوە و خەیاڵگۆڕکێ و بەخەیاڵداهاتن و خەیاڵکردن و... تاد. بۆیە ناتوانین عەقڵ بە مادە بزانین، بەڵام مادە هۆیەکە بۆ دەرکەوتنی عەقڵ. جا دەرکەوتنی عەقڵ خۆی سەرداره کە لە چ چۆنایەتییەکدا دەردەکەوێت. جا دوو ڕێگە لە بەردەم مرۆڤدایە، یان ئەوەتا مرۆڤ شوێن چۆنایەتییەکە دەکەوێت و وادەزانێ بەدووبارەکردنەوەی ئەم فۆرمە کارێکی عەقڵیی کردووە. یان ئەوەتا لەناو ئەم چۆنایەتییەدا پرسیاری ئەو بەشە نادیارە دەکات و بەشوێن ئایدیالی ئەو فۆرمەدا دەڕوات، کە بەداخەوە مرۆڤ هەموو کات ڕێگەی یەکەمی هەڵبژاردووە و بەمەش ئایدۆلۆجیا هاتووەتە ئاراوە. پاڵەوان و فەیلەسووف و مۆسیقارەکان هەردەم کراونەتەوە و ئایدیال و دووبارە کراونەتەوە، بەڵام نەپرسراوە ئەوەی ئەوانی کردە ئەو شتە چییە..... ؟

چونکە هەردەم چۆنایەتییەکانی ئەوان لە بەرچاو گیراوە و بنەما و جەوهەرەکان وەلا نراون. ئەم دووبارەنەبوونەوەی عەقڵ لەناو فۆرمێکدا نهێنیی پاراستنی خۆیەتی. لە حاڵەتی عەدەمدا شەڕێکی گەورە دەکەوێتە نێوان عەقڵ و بیرەوەرییەوە، چونکە عەقڵ بیرەوەری دەردەکات و پاشەکشەی پێ دەکات، ئەم چۆڵبوون و هەڵوەرینە بەمانای ئەوە نییە بیرەوەری لەناو دەچێت نەخێر! هەروەک هەندێک لە زانایانی دەروونناسی پرۆسەی کوشتنی بیرەوەری ئەنجام دەدەن، کە بیرەوەریی نەخۆشەکانە. بۆ ئەوەی کێشەی خۆیان لە بیر بکەن، ئەوە نەک هەر ڕێگەی عەقڵ نادات دەرکەوێت بگرە مرۆڤ سەرگەردان دەکات. لە عەدەمدا بیرەوەری ئیمکانی دووبارە گەڕانەوەی هەیە، بەڵام ئەمجارە بەپێی یاساکانی عەقڵ خۆی ڕیز دەکاتەوە لەناو یادگەدا. بەمەش مرۆڤ تێ دەگات لە ڕابردووی خۆی، جا ئەوەی عەقڵییە دەمێنێتەوە وەک تێگەیشتن و خیبرەیەک. ئەوەشی عەقڵی نەبووە مرۆڤ هەوڵ

دەدات وەک یەکەمین جار مامەڵەی لە تەکدا بکات و تێی بگات. کاتێک ئێمە زمان لە کۆمەڵگەوە فێر بووین. ئەمە بەو مانایە نا، کە کۆمەڵگە خوڵقێنەری زمانە. چونکە توانای خوڵقانی زمان لەناو مرۆڤدا هەیە، بەڵام سەرەتا ئێمە لەناو کۆمەڵگەدا فێری زمان دەبین. ئەم زمانە لەناو یادگەماندا هەیە و بەو شێوازە خۆی ریز دەکات کە تەبایە لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵگە و سیستەمی زماندا. کە خۆی لە سێنتاکس و هەموو ئەو یاسایانە دەبینێتەوە کە زمانەکە هەیەتی.

ئەم زمانە سەرتاپا کەرەستەیە جا گەر هاتوو مەبەست و ئامانجمان ئاراستەی ئەم زمانە کرد، ئەوا زمانمان بەکار هێناوە و بەپێی ئەو مەبەستە ریزی دەکەین و دەری دەبڕین، بەڵام کاتێک عەقڵ دێتە ناو زمانەوە ئەوا ئاراستەی ئەم کەرەستەیە دەگرێتە دەست و ئەو کاتە مرۆڤەکە لە جیهانی عەقڵیدا دەژیت و ئەم ژیانە وا دەکات گوزارشت لەو حاڵەتە بکات. لێرەدا سەرلەبەری سیستەمی کۆمەڵگا و سیستەمی زمان لێک هەڵدەوەشێنێت و مرۆڤ یان زمان دادەهێنێ یان بەپێی عەقڵ ئەو زمانە ریز دەکاتەوە.

فەلسەفە و شیعر ئەم وەزیفەیە ئەنجام دەدەن، جا لێرەدا بەردەوام شەڕێک هەیە لە نێوان بیرەوەری و عەقڵدا ئەویش شەڕی دەرکەوتنە، چونکە شکان و فرێدانی بیرەوەری قورسترین کاری مرۆڤە. ئەمەشە وا دەکات حاڵەتی عەدەم حاڵەتێکی پڕ لە یەئس و نائومێدی بێت و مرۆڤ تەواو بکەوێتە ناو بێ هیوایی و بێزارییەوە، هیچ دەربەست نەبێت بەرامبەر بەخۆی و بە کۆمەڵگە. لە پاڵ ئەمەشدا بیرەوەری وەک جەمسەرێک و وەک ڕێڕەوێک عەقڵ دەبێت بەناویدا بڕوات هەتا واقیعی بێتەوە، مرۆڤ هەر دەبێت بەناو بیرەوەریدا بڕوات و ئەودیوی بیرەوەری ببینێت. ئەمەش بەکۆمەکی عەقڵ دەبێت، مرۆڤ هەتا بەناو ئەم شارە مردووەدا نەڕوات و سەفەر نەکات ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە. ئەودیوی بیرەوەری نزیکبوونەوەیە لە مێتافیزیکای مرۆڤ. بیرەوەری یاخۆ سایکۆلۆجیا یەکەمین ڕێڕەوە کە عەقڵ بەناویدا دەڕوات. ئەوجا دادەبەزێتە سەر جەستەی بایەلۆجی. ئەو کاتە عەقڵ دێتە ناو جیهانی هەستییەوە، لەم تیۆرەوە تێ دەگەین کە چ دەروون چ جەستە بۆ خزمەتی عەقڵ هەن و مرۆڤ ئامانجێکی ئەنتۆلۆجی و عەقڵیی هەیە. نەک ئامانجێکی غەریزی و دنیایی. بەڵام ئەمڕۆ غەریزە و دنیا مرۆڤ بەڕێوە دەبەن و عەقڵ وەلانراوە، بۆیە مرۆڤ ون بووە و خۆی نادۆزێتەوە. چونکە بەم ڕێگەیە مرۆڤ

ئەونوێنە و لە ماڵەکەی خۆی دوور دەکەوێتەوە. ئیتر شتەکان هەردەم دووبارەن و مرۆڤ بەرەو نائومێدی دەڕوات کە هیچ ئامانج و ئەنجامی نییە. بەڵام مرۆڤ ئەوە دەزانێت کە دەبێت عەقڵ واقیعی بکاتەوە. تێ دەگات کە کارێکی هەیە و تووشی نائومێدییەکی ڕەش نابێت.

### ٨- فەلسەفە و عەقڵ:

لە تەواوی ئەم کتێبەدا تاکە ترسێک هەمانبوو، باسکردنی ئەم بابەتە بوو ئێستا لەناویداین، چونکە هەردوو چەمکی سەرەوە هەمەکین و سنووریان نییە و هیچ شتێکی لێ ڕۆشن نابێتەوە لەسەر سنوورەکانیان. هەر بۆیە لە بەردەم ئەم هەمەکییەتەدا ئێمە کۆمەڵێک ڕێگەمان هەیە و ڕێگەکەش فرە ڕێگەیە. هەر ئەمەشە تووشی دڵەڕاوکێ و ترسمان دەکات، چونکە نازانین چۆن بڕۆین و لەناو ئەو هەموو ڕێیەدا دڵنیا بین کامەیان دەچێتەوە سەر عەقڵ.

بەڵام تاکە ڕێگەش ئەوەیە لەناو خۆماندا ئەم پرسیارە بکەین و پرسیارەکەش هێندە هەمەکی و سەراپاگیر بێت سەرجەمی فەلسەفە لەخۆ بگرێت و هەموو کێشە فەلسەفییەکان بگرێتەوە. بەم فرە ڕێگەیەش دڵخۆشین چونکە چانسی ئەوەمان هەیە بکەوینە ناو فەلسەفەوە و ڕێگە پێدراوین بەو شێوازەی خۆمان نزیک بینەوە لە فەلسەفە و حەقی ئەوەمان هەبێت ئەو پرسیارە بکەین کە فەلسەفە چییە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ناکرێت یەکڕاست و سەربەخۆ بێت، چونکە پێویستی بەماندووبوون و بڕینی ڕێگە هەیە. ئێمە هەوڵ دەدەین ئەوەندەی توانامان هەیە ئەم پرسیارە بکەین. خۆ گەر نەشمانتوانی ئەوا داوای کۆمەک لە فەیلەسووفەکان دەکەین. ئێمە باسی ئەوەمان کرد عەقڵ وەک شیان خاوەنی توانای دەرکەوتنە. هیچ جارێکیش بەو شێوازەی دەرکەوتووە دەرناکەوێتەوە، چونکە عەقڵ لاسایی ناکرێتەوە، بگرە عەقڵ کاتێک دەردەکەوێت کە مرۆڤ لە حاڵەتی بەدەنگەوەچوون بێت بۆ عەقڵ. جا ئەوە دیارە هەر جارە و عەقڵ دەردەکەوێت لە شوێن و زەمەنی جیادا دەردەکەوێت، ئەم پەرشبوونەی عەقڵ جیاوازە لە پەرتەوازەبوون. چونکە پەرتەوازەبوون شتەکان بەش بەش دەکات و خۆی نادۆزێتەوە، بەڵام عەقڵ بەش بەش نابێت و خۆی دەنوێنێتەوە. بۆیە کە دەڵێین فرە ڕێگەیە، چونکە فەلسەفە هەرجارە و لە بەردەم ڕێگەیەکدایە و هەرجارەی لە بەردەم مرۆڤێکدایە. گوتەی

(یەک هەمووە) Einess Ahes دروستە لێی بکۆڵینەوە، ئەم گوتەیە هەمان گوتەکەی هیگڵە (ئەوەی عەقڵییە واقیعییە) ئەم دوو گوتەیە هەردووکیان لەسەر ئەوە بینا کراون کە عەقڵ لەناو هەموو کایە جیاوازەکاندا هەر خۆیەتی و شتێکی تر نییە.

فەلسەفە ئەو عەقڵەیە، کە بەردەوام لەناو هەموو (هەبووەکاندا) واقیعە جیاجیاکاندا خۆی دەدۆزێتەوە. بەمەش فەلسەفە نزیک دەبێتەوە لە جەوهەری شتەکان و هەردەم بەشوێن ئەوەدا دەگەڕێن کە عەقڵییە و بەناو هەموو میتافۆر و جەستەکاندا گوزەر دەکات و پرسیاری چییەتیی شتەکان دەکات. لەم گەڕانەدا یەکەم جار ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوە بەمەش عەقڵ بالاترە لە فەلسەفە و عەقڵ بۆ خۆی جەوهەری فەلسەفەیە، بەڵام فەلسەفە دەرکەوتووترە لە عەقڵ. هەردووکیان پێکەوە خزمەتی یەکتر دەکەن، بەڵام بنەما و پنتی سەرەکیی خودی عەقڵ خۆیەتی. لە بەشەکانی تردا کۆمەڵێک زانستمان جیا کردەوە وەک ئەوەی زانستی پزیشکی تایبەت بوو بە جەستە و زانستی کۆمەڵناسی تایبەت بوو بە کەسایەتی (تاک و کۆمەڵ) زانستی دەروونناسیش تایبەت بوو بە سایکۆ، بەڵام فەلسەفە زانستی تێرامانە لە عەقڵ و دەقیقترین و لانکەی هەموو زانستەکانە، چونکە مامەڵەی فەلسەفە لەگەڵ شتەکاندا عەقڵییە و لەناو هەبووەکاندا بەشوێن عەقڵدا دەگەڕێت.

لێرەوە تێ دەگەین فەلسەفە ئەو هۆشیارییە زیندووەی مرۆڤە کە عەقڵ هەیەتی بەرامبەر بەخۆی، ئەم مەعریفە دەستکەوتووە کە بەرجەستە بووە بەدرێژاییی مێژوو خودی فەلسەفەیە. کە هیگڵ بەمێژووی فەلسەفە گوزارشتی لێ دەکات. ئەگەر بۆ رامان لە فەلسەفە لە چەمکەکەوە دەست پێ بکەین وەک ئەو ڕێگەیەی هایدگەر دەیگرێتە بەر، ئەوا مانای (فیلۆسۆفۆس)ە، بەمانای "ئەنیر فیلۆسۆفۆس عەشقی سۆفۆنە واتە فەیلەسووف عەشقی داناییە."(٥٦)

بەداخەوە کە لە کوردیدا وشەی (حەز) بەکار هێنراوە کە حەز زیاتر پێوەندیی هەیە بەجەستەوە، چونکە حەزکردن هەردەم بۆ شتێکە (حەزلێکراو) کە بەرجەستە و دیار بێت. فەیلەسووف عاشقی داناییە و داناییش شتێکە پەتییە.

"فەلسەفە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کەوا بوونی هەبوو چییە؟"(٥٧)

هایدگەر باسی ئەوە دەکات کە دەبێت کۆبوونەوە لەگەڵ فەیلەسووفەکان دەبێت "بوونی هەبووبێت"(٥٨)

نەک مێژووی لەدایکبوون و سەردەم و بارودۆخی ئەو زەمەنەی تیایدا ژیاون. هەروەک ئەمرۆ لە زانکۆکانی ئێمە ئەم مێژووە بەناوی فەلسەفەوە دەخوێنرێت. فەلسەفە ئەوە نیشان دەدات کە هەرگاف عەقڵییە و شاراوەیە "گونجان لەگەڵ بوونی هەبوو فەلسەفەیە"(٥٩)

کەمێک ئەوەمان روون کردەوە فەلسەفە چۆن خۆی دەنوێنێت. جا راستی هیگڵ لە یەکەمین گوتەیدا لەبارەی فەلسەفەوە دەڵێت "فەلسەفە گوزارشتە لە سیستەم"(٦٠)

لێرەدا رەخنەیەک رووبەڕووی فەلسەفە دەکرێتەوە تێنەگەیشتنە لە چەمکی سیستەم. چونکە زۆرێک پێیان وایە دەستگرتنە بەیەک بنەماوە، ئەمەش نزیکبوونەوەیە لە تۆتالیتاریەت و خۆپەسندی و... هتد. دیارە هیگڵ هەستی بەم گومانە کردووە، بۆیە وەڵامی ئەمە دەداتەوە دەڵێت: "لە سەردەمە نوێکاندا وشەی (سیستەم) وای لێ هات کە بەخراپی بەکار بهێنرێت، وا دەزانرا واتای دەستگرتن بە بنەمایەکی تاکرەهەندەوە دەگەیێنێت، بەڵام مانای راستەقینەی سیستەم سەراپاگیرییەکی هەمەکییە Totality بەتەنیا هەر ئەمەشە سیستەمی هەق کە سەراپاگیرییەکە بە ساکارترین توخم دەست پێ دەکات. دوای ئەمەش هەر جارە کە پەرە دەستێنێ زیاتر عەینی دەبێتەوە".(٦١)

هیگڵ ئەو گومانە تێک دەشکێنێت کە باسکردنی هەقیقەت کردنەوەی دەرگەی تۆتالیتاریەتە، ئەو بیرەی ئەو رایەی هەیە خۆی ئاشکرا دەکات کە هیچ فیکر و بیرکردنەوە نازانێت و سەرپێیانە بیر دەکاتەوە، فەلسەفە بەوە سیستەمە کە هەموو کات تەبا دەبێتەوە لەگەڵ خۆی، ئەگەرچی بەمردنی خۆشی بێت. واتە گەر هاتوو فەلسەفە دەرکەوت و مرۆڤ هۆگری ئەم دەرکەوتنە بوو. بووە ئایدۆلۆجیا. ئەوا فەلسەفە هەر خۆی ئەمە تێک دەشکێنێت و دەیرووخێنێ. هەروەک حاڵەتی عەدەم کە باسمان کرد. فەلسەفە بەوە خۆی جیا دەکاتەوە لەگەڵ زانستەکاندا، چونکە ئەوان هەموو کات بەرگری لە یەک شت دەکەن، بەڵام فەلسەفە هەمەکییەتی عەقڵە لە واقیعە جیاجیاکاندا.

کاتێ دیکارت دەڵێت "من وەک ئەرخەمیدس بەشوێن یەک خاڵی جێگیردا دەگەڕێم."(٦٢)

ئەو خاڵە جێگیرە هەمەکییەتی عەقڵە کە شتەکان لەوێوە دەست پێ دەکەن.

یەکەمین بنەمایەک بۆ بەدەستخستنی فەلسەفە ئەوەیە مرۆڤ لەناو خۆیدا ئەو بنەمایە هەمەکییە بدۆزێتەوە. ئەو کاتە بکەوێتە بەردەم هەر شتێک ئەم سەرمایە گەورەیە بە شوێن چییەتیی ئەو شتەدا دەگەڕێت، گوتەی (یەک هەمووە) یەکەمین پرسیار و دوایەمین ڕێگەی گەیشتنە بەم فەلسەفەیە. فەلسەفە لێرەوە دەست پێ دەکات. بەبێ تێگەیشتن لەم گوتەیە چانسی تێگەیشتن نییە لە فەلسەفە، مرۆڤ ژیانی گەڕانە بەشوێن ئەو یەکەدا لەناو هەموەکاندا. لێرەدا فەلسەفە لەدایک دەبێت نەک خوێندن و کۆرسی فەلسەفی کە هەمووی وێنەی فەلسەفە بەرهەم دەهێنن، بەڵام ئەو گەڕانە خودی فەلسەفە بەرهەم دێنێت. بەو شێوازەی عەقڵ دەیەوێت، فەلسەفە عەقڵە لە واقیعدا و عەقڵیش فەلسەفەیە لە هەقیقەتدا.

**٩- دەرکەوتنی عەقڵ لە زەمەندا:**

دەبێت ئەوە روون بکەینەوە کەوا هەر شتێک کە دێتە ناو زەمەنەوە ئەو شتە تووشی حاڵەتی گۆڕان دێت. واتە ئەو لە سێ زەمەندا خۆی دەبینێتەوە رابردوو و ئێستا و داهاتوو. بەئاگا لەوەی عەقڵ ناچێتە ژێر باری زەمەنەوە. چونکە عەقڵ ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی نییە، واتە شتێ نییە بەشێکی رابردوو و بەشێکی داهاتوو بێت. سیفەتی پارچەبوون، وردبوون، سیفەتی ئەو شتانەن کە مادەن. مادە سەرەتا و کۆتاییی هەیە، بەڵام عەقڵ سەرەتا و کۆتاییی نییە و نایەتە ناو زەمەنەوە. چونکە گەر عەقڵ بێتە ناو زەمەنەوە ئەوا عەقڵ وەک شتێکی کۆنکرێتی لێ دەهات. دەتوانرا وەک زانست سەراپاگیر بکرێت و جڵەو بکرێت. ئەو کاتە عەقڵیش بە پرۆسەی لاساییکردنەوە دەگوازرایەوە و لە ڕێگەی لاساییکردنەوە مرۆڤ دەیتوانی عەقڵانی بێت. بەڵام عەقڵ سیفەتی گواستنەوەی نییە، چونکە گواستنەوە لەناو زەمەندایە و ئاماژەیە بۆ رابردوو و ئێستا و داهاتووی شتێک. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ فەلسەفە مێژووی عەقڵە؟ راستە فەلسەفە میراتێکی تەواو عەقڵییە. بەڵام فەلسەفە بەهەموو جۆرەکانیەوە وەک فەلسەفەی ئاکار و هونەر و... تاد، هەموو دەرکەوتەی عەقڵن بەڵام هەر لە ساتی دەرکەوتندا عەقڵ حزووری هەیە ئەویش تایبەتە بەو کەسەی وا بەدەنگ ئەم عەقڵەوە دەچێت و عەینی دەکاتەوە. بەڵام هەر دوای ئەم حاڵەتە ئەم کەسە کەوتەوە ناو یادکردنەوەی ئەمە ئەوا بۆ خۆشی دەکەوێتە ناو زەمەنەوە.

گەر نموونـەیەک وەربگریت لەسەر عـەقڵ و زەمەن ئەوا کاتێک لە بەردەم پەیکەری هونەرمـەندێکداین کـە عەقڵـییـە. ئەوە ڕوونە کـە عەقڵ چۆنـایەتیی داوە بەو پەیکەرە، بەڵام عـەقڵ وەک بەشـێک لەو پەیکەرەدا حزووری نییە، نـاتوانین بڵـێین لەم بەشـەدا هـەیە، یـاخـۆ ناتوانین لـەناو فـەلسـەفـە عـەقڵ بدۆزینـەوە و بڵـێین لە سـەرەتای ئەم ڕستەیەدا عەقڵ هەیە.

هـەر بـۆیە عـەقڵ حـاڵەتێکی نەگـۆڕی هـەیە و رەهایـە، بەم رەهایـەوە نایەتە ناو زەمـەنەوە، چونکە هـەر شـتێ بێـتـە ناو زەمـەنەوە لە رەهـایـەتیی خـۆی دەکـەوێت و بوونی وابەستە دەبێت بەبوونی شتێکی ترەوە. ئێمە وەک مرۆڤ بەردەوام جەستە و دەروونمان لەناو زەمـەندایە هەر بـۆیە ئەم دوو بەشـە بە تەنیـا ناتوانین هەبن یاخـۆ کار بکەین بگرە دەبێت بەشتی ترەوە خۆیان پێوەست بکەن.

بەڵام عەقڵ بۆ خۆیەتی و هـەر خۆشی دەنوێنێ. بۆیە غەدرێکی گەورە لە خۆمان و لە عـەقڵ دەکـەین کـە عـەقڵ بخـەینـە ناو زەمـەنەوە، بۆ هەسـتکردن بـە عـەقڵ لەناو فـەلسـەفـەدا، دەبێت ئێمـە خـۆمـان بکەوینە ناو هـەمـان حـاڵەتی بیرکـردنەوە لە ئەو شـتـە، ئـەو کـات سـیـفـەتی خـاڵقـیـیـەت وەردەگـرین و جـارێکی تر ئەو شـتـە دەخـوڵقـێنینەوە. ئەو کـاتە ئێـمـە تێ دەگـەین و تووشـی هـاوئاهـەنگی دەبین لەگـەڵ عەقڵدا. ئەو کـات ئێمـە لەو فەلسەفـەیە تێ دەگەین و واڵا دەبێت بۆمـان. واتە بوونی هەبوومـان لا مـەبەست بووە. بەڵام بەدەر لەم حـاڵەتە هـەر لەسـەر کەرەسـتـە و فۆرم دەمـێنینـەوە و چییـەتی نازانین و دەرناکـەوێت بـۆمـان. دوو زەمـەن هـەیە بۆ عـەقڵ یەکەمیان زەمەنی دەرەوەیە ئەوەی ئێمە ڕێکمان خستووە وەک ڕۆژ و ساڵ و کات... تاد، زەمەنـی ناوەوەش هـەیە، ئەوەش کاتی هـاتنی عـەقڵە بۆ ناو دنیا. ئەمـەش عەقڵ خۆی سـەردار و حاکمە لە کـاتی هـاتنی کەیە و مـرۆڤ ناتوانێت کاتی عـەقڵ پاش و پێش بخات چونکە عەقڵ باڵاترە لە هـەموو شتەکانی مرۆڤ.

**١٠- عەقڵ و کەرەستەی دەرکەوتن:**

ئەوە ئاشکرایە کـە عـەقڵ بۆ دەرکـەوتن پێویسـتی بەکەرەسـتەی گونجـاو هـەیە بۆ دەرکەوتن. عـەقڵ سـەرچاوەی ئایدیالەکـەیـە و ئایدیالەکەش کـەرەسـتـە (هـیـولا) کـە دیاری دەکات. بەگشتی ئایدیالەکە دوو کەرەسـتەی لە بەردەمدایە، ئەوانـیش واقیـع و بیـرەوەرییـە. بیـرەوەری واقـیـعـە لـەباری وێنەدا وەک (کـولتـوور و زمـان... تاد).

واقیعیش یان سروشتە یان شارستانیەتە. ئەوەندە هەیە کە عەقڵ پەتییە و بۆ عەینیبوونەوەی نیازی بە مادە هەیە.

**١١- عەقڵ و کارا:**

لەگەڵ هەبوونی کاتی هاتنی عەقڵ و هیولادا پێویستە کارایەک هەبێت بەم کارە ڕاپەڕێت، ئەویش مرۆڤە. دیارە هەموو مرۆڤێک ناچێتە ژێر باری کاراییەوە، کارا ئەو مرۆڤانەن کە ڕێڕەوی دەرکەوتنی عەقڵن لە جیهاندا.

بەدەر لەم حاڵەتە مرۆڤ لە کارایی دەردەچێت و بەردەوام کار تێکراوە. مرۆڤ لە کارتێکراویدا هەر بەزیندوویی مردووە. چونکە ژیانێک بێ عەقڵ و بێ کارایی ژیانێکە لە ئاستی ئاژەڵ، مرۆڤ لە حاڵەتی کارادا نەک کارایە و بەس بگرە کارتێکەریشە، بەڵام بێ ئەوەی هیچ مەبەست و غایەتێکی هەبێت بەم کارتێکردنە، چونکە مەبەستی تێ کەوت دەچێتە دەرەوەی عەقڵ.

**١٢- عەقڵ و ئامانج:**

تاکە کێشەیەک کە بە درێژایی مێژووی فەلسەفە تووشی عەقڵ هاتووە مەسەلەی ئامانجە، چونکە ئامانجی عەقڵ دیار نییە و هەردەم شاراوەیە. ئاشکرابوونی دەکەوێتە دوای دەرکەوتنی عەقڵەوە. هەر ئەوەشە وا دەکات ئەوانەی ژیانێکی ڕۆحی و عەقڵی هەڵدەبژێرن زۆر کەمن.

چونکە هیچ ئامانجێک دیار نییە و ڕێگەکە نادیارە، بەڵام ئەمە هەقیقەتێکی تاڵە لەبارەی عەقڵەوە. ئێمە گوتمان دوای دەرکەوتن ئامانجەکە ئاشکرا دەبێت. ئەمەش هەروەک ژیانی مرۆڤ وایە، چونکە ئێمە نازانین دەبین بە چی. دەبێت شوێن ژیانێکی ناوەکی و عەقڵی بکەوین بۆ ئەوەی بزانین چین.

ئەمە نموونەیەکی سادەیە، بەڵام لە باسی عەدەمدا ئەوەمان باس کرد کە مرۆڤ بەردەوام لە بەردەم چەند حاڵەتێکی عەدەمدایە بۆ ئەوەی عەقڵ دەرکەوێت. مرۆڤ زۆر قورسە لەسەری واز لە شتێکی حازر و بەردەست بهێنێ وەک پارە و کەسایەتیی منداڵ... تاد بۆ شتێک کە هێشتا روون نییە چییە ؟ ئەم شوێنەی عەقڵ ناوچەیەکی تاریکە لە بەرامبەر واقیعدا زانست توانای درککردنی ئەم شوێنەی نییە و عەقڵی کۆمەڵگەش بەئەفسانە و خورافە باسی دەکات.

عـەقڵ ئامـانجی هەیە، بەڵام ئامـانجـەکـانی ئەنتـۆلۆجی و نـاوەکین و مـاددی و هەستەکی نین، دیارە جار هەیە کە دەردەکەوێت و سوود و قازانج دەخاتەوە، بەڵام ئامانجـەکە ئەمـە نییـە بگرە دەرکەوتنەکەیە. ئەوروپا لە تاریکی ئەم شـوێنە لەلای کـەوتووەتە وێناکـردنی هەڵەوە، شـانۆنامـەی (شـا ئۆدیب)ی سـۆفـۆکلیس دەقـێکی عـەقڵ ئامێزە کە پاڵەوانەکانی هەردەم دەکەونە بەردەم جیهانی عـەقڵ و جیـهانی واقیع وەک ئۆدیب، کەشوێن عەقل دەکەوێت هەتا تووشی واقیع نەبێت بەڵام هەموو کات باشی بۆ دێت با کوێریش بێت.

بەڵام ئەوروپا بەدیوەکـەی تردا باسـی دەکـات و دەبیـنێ ئەویش ئەمـەیە مـرۆڤ خـۆی بداتە دەست حـەز و خـەیاڵەکانی. لە کـاتێکدا تەسلیـمـبـوونی ئۆدیب کـە لە فـۆرمی دەرەوەدا وا دیارە کە بێ مـاناییـیـە. بەڵام لە جەوهـەردا تەسلیـمـبـوونە بە خودی عەقڵ. لە پێوەندیی عـەقڵیدا مرۆڤ دڵی ئازاد دەکات و خۆی دەداتە دەست عـەقڵی. نەک جـەسـتـە و دەروون بەرەڵا بکات. وەک ئەمڕۆ ئەوروپا پیـایدا دەڕوات، بەڵام بۆچی پێوەندیی عـەقڵی هـەمـوو کـات نادیارە؟ وەک تۆیەک دەبێت سـەبری ئەوەمان هەبێت کە گەورەی بکەین، کاتێک عەقڵ بکەینە حاکمی بەشەکییەکان ئەو کات هەمەکییەتی ئەم پێوەندییە ئاشکرا دەبێت. مرۆڤ گەر خۆی دایە دەست عەقڵ ئەوا پێوەندییەکانی مرۆڤ پێوەندیی هۆشیـارین کە ناچنە شوێنێک عـەقڵ قبـووڵی نەکـات. گـەر مـرۆڤ ئەوها بڕوات ئەوا دەبێـتـە نماینگای هـەقـیـقـەت و بۆ خـۆی دەردەکەوێت، دواتریش کە بەم هێزەوە دەچێتە بەردەم کۆمەڵگە کۆمەڵگەش ملی بۆ کەچ دەکات چونکە ناتوانێت بەری ئەم رووناکییە بگرێت و بیشارێتەوە.

**١٣- عەقڵ و زەوینە:**

زەوینە ئەو بارەیە کە عەقڵ تیایدا دەست بەدەرکەوتن دەکات ئەویش حازربوون و کۆبوونەوەی هـەمـوو کاتیگۆرییـەکانی عەقڵە بۆ دەرکەوتن، واتـە زەوینە کۆبوونەوەی کاتیی هـاتن و هـیولا و کارایە، لە پێکەوەبوونی ئەم سێ تـوخمەدا دواتر ئامـانجیش ئاشکرا دەبێت و عـەقڵ دەردەکەوێت. جار هـەیـە کارا هـەیە هـیـولا هـەیە، بەڵام کـاتی هـاتن نییـە. ئەو کـات زەوینەکـە نەسـازاوە بۆ دەرکـەوتنی عـەقڵ. زەوینـە بواری کرانەوەی عەقڵە، کە دواتر ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی دەپێکێت.

بەشی پێنجەم

## دۆخەکانی مرۆڤ

دەتوانین بڵێین دۆخ ئەو حاڵەتەیە کە مرۆڤ وابەستە دەبێت بەجۆرێک لە ژیانەوە، جا ئەو ژیانە ناوەکی بێت یا دەرەکی بێت. یان بەمانایەکی تر دۆخ ئەو زەوینەیە کە مرۆڤ تێی دەکەوێت. لەناو ئەو دۆخەدا مرۆڤ تووشی حاڵەتی لێ دەرچوون یان ناوکەوتن دەبێت. ئەویش ڕاستی جۆری دۆخەکە دیاری دەکات کە مرۆڤ چی لێ بەسەردێت. بابەتی دۆخ بابەتێکی گرینگ و تەواو ناسکە، ئێمە هەوڵ دەدەین لێی بکۆڵینەوە. ئەویش بەیارمەتیی ئەوەی تا چەند توانای ئەوەمان هەیە لە ساتی نووسیندا خۆمان لە خۆمان دەرچین و هەم لەناو ئەم دۆخی نووسینەدا بین و هەم چاودێریی ئەم دۆخە بکەین و بزانین مرۆڤ چی بەسەر دێت.

دۆخەکان بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین دوو جۆرن، یان ئەوەتا ئەم دۆخە لە دەرەوەی مرۆڤ دێت و مرۆڤ بار دەکات بەخۆی و مرۆڤ تێی دەکەوێت و بەرەوپیری ئەو دۆخە دەڕوات. یان ئەو دۆخە ناوەکییە و لە ناوەوەی مرۆڤ سەرهەڵدەدات و پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێت کە داواکارییەکانی ئەو دۆخە جێبەجێ بکات. دۆخ فەزایەکی تایبەتە کە جۆرێک لە جووڵان و ڕاکێشانی تێدایە، کێشەی دۆخ ئەوەیە کاتێک مرۆڤ دۆخ وەردەگرێت لە دەرەوەی خۆی ئەوا خۆی ساز دەکات بۆ خۆبەکۆیلەکردنی ئەو شتەی دۆخەکەی دەداتێت. کێشەی دۆخ هەر مرۆڤ نییە بەرامبەر بە مرۆڤ، بگرە سروشت و واقیع و کەلوپەلەکانیش توانای دۆخ گەیێنیان هەیە بەمرۆڤ. وەک ساردیی زستان، یان گەرمیی هاوین دۆخ دەدەنە مرۆڤ و گۆڕانکاری دروست دەکەن لە مرۆڤدا. دۆخ جار هەیە لە تاکەکەسێکەوە دێت و لە فەزایەکدا گشتی دەبێتەوە. جاریش هەیە لە کۆمەڵگەوە دێت و هەموو تاکەکان دەگرێتەوە. بۆ کۆمەڵ وەک چوون بۆ ئاهەنگێک. لەو ئاهەنگەدا کە دۆخی شایی و هەڵپەڕینە مرۆڤ زۆرجار نیازی نییە شایی بکات، بەڵام کاتێک دەزانێ دۆخی

دراوەتێ و لەناو شاییدایە. ئەم دۆخە تاکەکانی ئەم شوێنە داگیر دەکات و هەریەک بۆ ئەوی تر دەبێتە سەرچاوەی دۆخەکە و دۆخەکە گشتی دەبێتەوە. مرۆڤ لەم بارەدا دەکەوێتە ژێر ئیرادەی ئەم دۆخە گشتییە و جەستە و سایکۆی دەجووڵێنرێت. جاریش هەیە یەک تاکەکەس دۆخێک گشتی دەکاتەوە وەک مەلاکان کاتێک باسی دۆزەخ دەکەن یان باسی دین دەکەن. کامە مەلا توانای بەخشینی دۆخی هەبێت ئەوە زیاتر دەتوانێت گوێگرانی بگریێنێت و بیانجووڵێنێ. گریانەکەش پێوەندیی نییە بەمانای قسەکانەوە، بگرە پێوەندیی بەو دۆخەوە هەیە کە مەلاکە ئامادەی دەکات. ئەمەش دۆخێکی سایکۆلۆجییە کە بەرامبەرەکان هەست بەگوناە دەکەن و دەکەونە ناو ئەو دۆخەوە. ئەو کاتە مەلاکە هەر قسەیەکی ئاسایی بکات لەم دۆخەدا توانای جووڵان و گریاندنی خەڵکی دەبێت. هەروەک شیعەکان کە دۆخی مردنی ئیمامی عەلی حازر دەکەن و ئیتر ئاگایان لەوە نییە کە لە خۆیان دەدەن، چونکە چوونەتە ناو دۆخەکەوە. خۆ گەر لە دەرەوەی ئەو دۆخە ئەوها لێیان بدەن هەست بەئازار دەکەن و تووشی کێشە دەبن، یان دەروێشەکان کە دەچنە ناو دۆخی شێخەکانەوە.

ئەم حاڵەتانەش حاڵەتی غایبکردنی وەعییە لەناو مرۆڤدا و مرۆڤ گێژ دەبێت. ئەم دۆخەش کەس خاوەنی نییە و هەمووش خاوەنیەتی. چونکە دۆخەکە وەک بیرەوەرییەک هەیە و دواتریش کە دەردەکەوێت هەمووان ئامادەسازییان کردووە کە ئەم دۆخە لەسەر جەستەی خۆیان دەربخەن.

خەڵکی بەتایبەت کۆمەڵگەکان توانایەکی باشیان هەیە لە دۆخ بەخشین بەیەکتر هەمووشی ئەو فێڵ و یارییەیە کە لە کۆمەڵگەدا هەیە. فێڵزانەکان ئەوانەن توانای بەخشینی دۆخیان هەیە بە بەرامبەرەکانیان. سەرەتا بەرامبەرەکە دەخەنە دۆخێکەوە ئینجا فێڵەکەی خۆیان دەکەن، چونکە بە چوونە ناو دۆخی ئەوی ترەوە مرۆڤ وەعیی خۆی لە دەست دەدات و ئەوی تر دەیجووڵێنێت.

(خەواندنی موگناتیسی) حاڵەتێکی ئاشکرا و بەرچاوی ئەم دۆخەیە. بەوەی کەسی خەوێنەر سەرەتا وەعیی خەوێنراو غایب دەکات ئەمەش بەیەک ڕێگە نییە چونکە ئەمە وابەستەیە بە بیروباوەڕی کەسی خەوێنراوەوە. کەسێکی دینپەروەر بە قورئان دەخەوێنرێت و گەر مۆسیقا بوو بە مۆسیقا یان..... هتد بەپێی

ئایدۆلۆجیای کەسەکان، چونکە ئەو شتە پیرۆزترین شتی ئەو کەسەیە و کەسی خەوێنراو خۆی دەداتە دەستی. خەوێنەریش دێت و خەیاڵ و سایکۆلۆجیای کەسی خەوێنراو ئاراستە دەکات و کاری تێ دەکات. مامەڵە و ئەخلاقیاتی ناو کۆمەڵگە زۆر خەتەرترە لە خەوی موگناتیسی وەک مامەڵەی نێوان کەسەکان، ژن و مێردەکان، عاشقەکان، سەرکردە و جەماوەر، سەرۆک و میللەت،...... هتد. کە سیفەتی خەوێنەر و خەوێنراو وەردەگرن و فێڵ لەگەڵ یەک دەکەن. بەداخەوە ڕۆشنبیری دوای ڕاپەڕین بە هەمان سیستەم هاتە کایەوە، سەرەتا دۆخیان بەخشی بەخوێنەر و نووسەرانی پێش خۆیان. هاتن لە ڕێگەی چاوپێککەوتن لەگەڵ نووسەرانی پێش خۆیان دۆخیان بەخشی بەو کەسە و باریان کرد بەخۆیان. دواتر هاتن بەناوی ڕاکردن و یاخیبوون و گۆڕانەوە دۆخێکی شەڕئامێزیان خستەوە. خوێنەریش ماوەیەکی زۆر بوو هیچی نەدیبوو ئیتر ئەم هەلەیان قۆستەوە و دۆخەکەیان پەخش کرد و حاڵەتی کەسی خەوێنەریان وەرگرت.

خەڵکیان خەواند و وەعییان غایب کرد، هەتا ئێستاش بەپێی میزاجی خۆیان خوێنەر و خەڵک ئاراستە دەکەن. ئەمەش بۆ خاتری ئەوەیە کە ئەم ڕەوتە لە ڕەوتێکی واقیعی و دیارەوە بگۆڕێت بۆ ڕەوتێکی ناواقیعی و نادیار، هەتا بەئاسانی بڕۆنە ناو خەیاڵ و سایکۆلۆجیای خەڵکەوە و خەیاڵی خوێنەر داگیر بکەن. تا گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی موقەدەس دروست کرا. ڕۆمان بووە گەورەترین خەمی خەڵک خەڵکیان کوشت لەناو حیکایەتدا و دایانبڕی لە بیرکردنەوە، بەڵام ئەم حاڵەتە هەروا ناڕوات. جار هەیە پێچەوانە دەبێتەوە. خوێنەر دەبێتە خەوێنەر و نووسەر دەبێتە خەوێنراو. واتە کە نووسەر ئەوەی قبووڵ بوو خوێنەر بخەوێنێت. دوایی ناتوانێت بەقسەی خوێنەر نەکات و ناتوانێت خۆی دەرباز بکات لە ئاراستەکانی خوێنەر، ئەمەش یارییەکی بێ مانایە کە ڕۆشنبیری ئێمە تێی کەوتووە و هیچ جیاوازیی نییە لەگەڵ یاریی مەلا و خەڵک و یاریی سەرکردە و میللەت.

ئێمە هەوڵ دەدەین زۆر بەگشتی باسی دۆخ بکەین، بەڵام بۆیە نموونەکان بۆ ڕۆشنبیریی کوردی وەردەگرین هەتا زیاتر کایەک ڕۆشن بکەینەوە کە کەمتر بەرچاوە. ئەمەش هەم بیرکردنەوەکە دەڕوات هەم نادیارێک هەیە بەدیار دەکەوێت. وەگەرنا خوێنەر دەتوانێت ئەم تیۆرە بباتە کایەی تر و شوێنی تر. لێرەوە هەوڵ

دەدەین ئیتر زۆر بەگشتی دۆخ هەڵگێڕ و داگیرکەری بکەین، بۆ ئەوەی بزانین کە سەرداریەتی و کۆیلەیەتی لە کوێدا تووشمان دەبێت و دۆخ چەند بابەتێکی هەستیار و گرینگە بۆ ژیانی ڕۆژانەمان. ئەگەرچی بابەتێکی دەست بۆ نەبردراوە بەڵام هەوڵ دەدەین کە ئەوەندەی پێمان بکرێت لەگەڵی بڕۆین، بەهیوای دۆزینەوەی بنەما یەکەمینەکانی.

١- دۆخ بەخشین:

بەخشینی دۆخ پێش هەموو شتێک ئامانجێکی لە پشتەوەیە، واتە کەسی بەخشەر هەردەم مەبەستێکی هەیە لە دۆخ بەخشین بە بەرامبەرەکەی، مەبەستەکە دۆخەکە ئاراستەی بەرامبەر دەکات. ئەگەر کەسەکە نەناسراو بێت بەرامبەر بەدەوروبەر ئەوا ماندووبوونی دەوێت هەتا بتوانێت دۆخ ببەخشێت. بەڵام کاتێک ناسراو بێت ئەوا پێشتر وێنەیەکی جێگیری دروست کردووە لە زەینی بەرامبەردا بەمەش دۆخەکە ناسراوە و هەوڵی کەمتری دەوێت. لە ڕاستیدا دۆخ بەخشین بەپێی کەسەکان دەگۆڕێت.

بەڵام زۆرترینیان بۆ ڕاییکردن و مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراوە، ئەمە ڕۆژانە لە نێوان فەرمانگەکان و شوێنە گشتییەکاندا ڕوو دەدات. کاتێک سەرۆک عەشیرەتێک کاری هەیە لە فەرمانگەیەک یەکێک لەو ترسانەی ئەو پیاوە هەیەتی ئەوەیە کە ئەو فەرمانبەرە دۆخی ئەو وەرنەگرێت و وەک کەسێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ بکات. بۆیە دێت ڕێگەی نایاسایی دەگرێتە بەر هەتا دۆخەکە بداتە فەرمانبەرەکە و کارەکەی بەئاسانی و وەک ئاغایەک بۆ بکەن.

ئەم بەخشینی دۆخە زۆر ترسناکە بۆ لێدان لە بەرژەوەندیی گشتی و بێ بایەخکردنی یاسا و ڕێساکان. کۆمەڵگەی ئێمە تا سەر ئێسقان خۆی بەدەستەوە دەدات و خۆش دەبێت لە بەرژەوەندییە گشتی و باڵاکانی. هەم سەرۆک عەشیرەتەکە ئامادەیی ئاساییبوونەوەی نییە هەم هێزی ئاراستەکەری حکوومەت شەرمن و ترسنۆکە لە بەردەم ئەم پیاوە. کێشەی حکوومەتی ئێمە ئەوەیە کە ئەو فەرمانبەرانەی ناوێت کە دۆخ وەرناگرن، چونکە سەرچاوەی کێشە و هەران بۆ خەڵک، بۆیە باشترین فەرمانبەر ئەوانەن کە دۆخی بەرامبەرەکانیان وەردەگرن و هەموو کەس ڕازی دەکەن و کەسەکان گەورەتر دەکرێن لە بەرژەوەندیی گشتی و

یاساکان. یان مەلایەک کاتێک دەچێتە شوێنێک چاوی لەوەیە هەر بەمەلا مامەڵەی لەگەڵ بکەن و کارەکەی بۆ ڕاپەڕێنن. بەمەش هەم مەلا ڕاستگۆ نییە لەگەڵ خۆی هەم حکوومەت ڕاستگۆ نییە لەگەڵ خۆیدا. ئەم دۆخ بەخشینە کۆمەڵێک مەبەستی لە پشتە کەسەکە پێش دۆخ بەخشینەکە کۆمەڵێک ڕێگە تاقی دەکاتەوە پێش کارەکە.

یان کەسی فێڵباز هەیە لە ڕێگەی نوکتە و قسەی خۆشەوە دۆخ دەبەخشێتە بەرامبەرەکان و لەژێرەوە کارەکانی خۆی دەکات. هەمان کار بەبێ ئەو دۆخ بەخشینە زۆر ئەستەمە جێبەجێ بکرێ. تەنانەت فاڵگرەوە و ساحیرەکان سەرەتا دۆخ دەبەخشنە بەرامبەرەکانیان بەهۆی لەبەرکردنی جلوبەرگی سەیر و دانانی شتی نائاسایی ئەمەش هەمووی بۆ غایبکردنی ئاگاییی کەسەکەیە و دۆخەکەی دەداتێ. یاخۆ سۆزانییەکان سەرەتا دۆخێکی ساختە دەدەنە کڕیارەکان و لەژێرەوە پارەکەی خۆی یان مەبەستەکەی خۆی جێبەجێ دەکەن، سۆزانییەکان هەموو کات دۆخ بەخشن و دۆخ وەرناگرن. خەیاڵ دروست دەکەن بۆ کڕیارەکان بەڵام دۆخی کڕیارەکان وەرناگرن چونکە ئەو کاتە یان دەبێت واز بهێنن یان دەبێت عاشق بن.

دۆخ بەخشین مەرج نییە هەموو کاتێک بەرامبەرەکە وەری بگرێت. بەتایبەت ئەوانەی کە عەقڵێن زۆر کەم دۆخ وەردەگرن. چونکە بە حزووری عەقڵ هیچ کەس ناتوانێت ئەم کەسە غایب بکات، چونکە عەقڵ هەردەم کارتێکەرە و کارتێکراو نییە. دۆخی عەقڵی جیاوازە لەم دۆخ بەخشینە، سوکرات بەردەوام کەسێکی دۆخ گەیێن بووە بەڵام بۆ ئەوە نەبووە گێژیان بکات و ئاگاییان غایب بکات. بگرە سوکرات دۆخ دەبەخشێتە بەرامبەرەکانیان هەتا ئاگاییان بەخەبەر بێت. لە ڕێگەی پرسیارەکانیەوە بەردەوام دەیەوێت کەسەکە بڕواتەوە ناو خۆی و بەخەبەر بێت و لەو دۆخە بەخەبەر بێت کە کۆمەڵگەکە زیندانیی کردووە تیایدا. مەبەستی دۆخ بەخشینی سوکرات مەبەستێکە ئەنتۆلۆجی و عەقڵییە. سوکرات هەموو کات کەسەکان بەخەبەر دەهێنێت هەتا خۆیان بن و لە دۆخی ڕاستەقینەی خۆیان بگوزەرێن. نەک بێ ئاگا و بزر بووبن لەناو کۆمەڵگەدا. بەدەر لەم دۆخ بەخشینە عەقڵییە، ئەوانیتر هەمووی بۆ کۆیلەکردنی بەرامبەرەکانە. هەروەک جۆرێک لە نووسین بەتایبەت ئەو نووسینانەی کە ڕۆشنبیری دوای ڕاپەڕین خستوویەتییەوە. هەموویان دۆخ بەخشن و خوێنەر داگیر دەکەن بە حیکایەت و کێشەی کەسی

خۆیان. هەتا ڕەوایەتی بدەن بەکێشە تاکەکەسییەکانی خۆیان و گشتی بکەنەوە.

ڕۆمان و چیرۆک و شیعر کە بابەتگەلێکی پیرۆزن ئەم ڕەوتە ناتەندروستە دێت و دەیانکاتە مەبەستی ڕاوکردنی خوێنەر. هەتا خوێنەر خۆی بەکارەکتەرێک بزانێت و بەمەش نووسەری ڕۆمانەکە دەبێتە سەروەر و خوێنەریش دەکاتە کۆیلە. ئەمە ترسناکترین فێڵی ئەم ڕەوتەیە لە خوێنەر کە هەردەم دۆخ دەدەنە خوێنەر هەتا بزری بکەن و داگیری بکەن. جیاوازیی ئەم نووسینە ئەوەیە خوێنەر دەخاتە دۆخەکانی خۆیەوە. بیرکردنەوەی داگیر دەکرێت لەلایەن نووسەرەوە. بەڵام فەلسەفە خوێنەر دەداتەوە دەست خۆی و ئاگایی بۆ دەگەڕێنێتەوە. ئێمە گەر ورد لەم ڕۆشنبیرانە بڕوانین زۆر بەئاسانی دەتوانین وێرانییەکەیان بدۆزینەوە، کە وەک ئیسلامی سیاسی جیاوازییان قبووڵ نییە و بەردەوام خەمی درێژکردنەوەی خۆیان هەیە لەسەر جەستەی خوێنەر.

**٢- دۆخ وەرگرتن:**

لەوێدا کە دۆخ دەبەخشرێت وەرگریش هەیە، وەرگر ئەوەیە کە ئەم دۆخە قبووڵ دەکات و ئامادەیە بچێتە ناویەوە، ئەوانەی دۆخ وەردەگرن زیاتر ئەوانەن کە ئاگاییان بزرە و لێرە نییە. چونکە بەگەڕانەوەی ئاگایی بۆ مرۆڤ هیچ دۆخێک ناتوانێت بێ پرسیارکردن و گومان بێتە ناو کەسەکەوە. ئەم ئاگاییەش حاڵەتی وەعییە کە مرۆڤ بەردەوام لە پرۆسەی کەشفکردنی شتەکاندایە و ڕێگە نادات هەروا بەئاسانی شتەکان بەناویدا گوزەر بکەن. وەرگرتنی دۆخ لەلایەن کەسەکانەوە بەرژەوەندی و مەبەستی تایبەتی لە پشتە (کورد) وەک گەلێک بەردەوام دۆخی وەرگرتووە لە زلهێزەکان. ئەمەریکا کاتێک دۆخی نارد کورد یەکەم نەتەوە بوو لە ناوچەکە کە دۆخی وەرگرت و لە خۆشیەوە پەخشی کرد بۆ لایەنەکانی تر. ئەم دۆخ وەرگرتنەی کورد لە قووڵایی دڵیەوە نییە، بەڵام بەرژەوەندیی سیاسیی کورد وای کردووە کە دۆخەکانی وەرگرێت. جا تا چەند ئەوە دروستە یان نا ئەوە باسێکی ترە، بەڵام کورد وەک نەتەوەیەکی بێ چەتر ئامادەکاریی تێدایە بۆ دۆخ وەرگرتن، بەدرێژاییی مێژووی خۆی بەردەوام دۆخی وەرگرتووە وەک دۆخی شیوعییەت و ئیسلامی و دیموکراسی و.... تاد.

ئەم دۆخانە کە هاتوون هەمووی بۆ سەرداریەتیکردنی ئەوروپا بووە بەسەر

ناوچەکەدا. کورد زۆر بەدڵسۆزی ئەم دۆخانەی وەرگرتووە و بەدڵ لەگەڵ دۆخەکان بووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەو چەترەی کورد دەپارێزێت هەر ئەمەشە پاڵی بە کوردەوە ناوە کە بەرەو هەموو دۆخێک بڕوات. چونکە دەیەوێت ئەویش هەبێت. بەڵام کورد حاڵەتی پەشیمانبوونەوەی هەیە. سەیر دەکەین لە کۆتاییی هەر یارییەکدا کە زانیویەتی بووە بە کۆیلە دەستی کێشاوەتەوە و گەڕاوەتەوە ناو خۆی، جا ئەمە زەرەرە یان قازانجە ئەوە باسێکی دوور و درێژە.

بەڵام ڕای ئێمە بۆ حاڵەتی دۆخ وەرگر لە کورددا ئەوەیە کورد پێویستی بەشاهیدێک هەیە بیدۆزێتەوە هەتا دان بەبوونیدا بنێت. ئەم دان پێدانانە لەناو هەمووماندا هەیە، تەنانەت کوردێک وەرزش دەکات هونەر دەکات لەوسەری دنیا دەڵێت من کوردم. هەموو دۆخ وەرگرتنەکانی کورد لەو هێزانەی دەرەوەی خۆی بۆ ئەوە بووە شاهیدێک بدۆزێتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەوروپا هەموو کات خۆی دزیوەتەوە لەو شاهێدییە و کوردی لە بیر کردووە. دۆخ وەرگرتن هەیە بەرژەوەندیی ماددیی لە پشتە، وەک قبوولکردنی دۆخی بەڕێوەبەر لەلایەن فەرمانبەرەوە. یان هاووڵاتییەوە لە پێناوی کارەکەی خۆیاندا. ئەگەرچی ناچارن چونکە گەر ئەو دۆخە وەرنەگرێت کارەکەی بۆ ناکرێت. با یاساییش بێت. بەداخەوە ئەمڕۆ حکومەتی کوردی دەرکەوتنی ڕۆحی کورد نییە چونکە کێ نەفس نزم و دۆخ وەرگر نەبێت قبووڵ ناکرێت. لە کاتێکدا بنەمای شۆڕشی کوردی لەسەر ئەمە ڕۆیی کە مرۆڤ عیزەتی نەفسی هەبێت و بە سەرشۆڕی نەژیت. بەڵام ئەمڕۆ پرۆسە و خەڵکی گەورە گەورە کار لەسەر کوشتنی کەرامەتی خەڵک دەکەن بەناوی یاسا و حزب و... تاد ئەمەش هەمووی لە ڕێگەی ئەو سەرمایە و دەسەڵاتەیە کە هەیەتی و خەڵک دەکرێت نەک دروستی بکات. ئێمە خۆمان کەرامەتی خۆمان کوشت لە پێناوی ئەمە و ئەوە و........ تاد.

دۆخ وەرگرتن هەیە بۆ ئەوەیە کە کەسەکە دوایی قەرزار ببێت یان ئەویش ناچار ببێت دوایی دۆخی ئەم وەربگرێت. ئەمەش بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەی ڕەمزی و وێنەی خۆی پێ گەورە دەکات. بەداخەوە ڕۆشنبیری دوای ڕاپەڕین زۆر کار لەسەر ئەم بنەمایە دەکات، ئەویش کەسێکی قبووڵ نییە کە دۆخی ئەو وەرنەگرێت. دەبێت سەرەتا دۆخی ئەوان وەرگریت و خۆت بدەیتە دەست ئەوان. ئەوانیش دواتر لە ڕۆژنامەنووسێکی جنێوفرۆشەوە دەتکەنە ڕۆشنبیر و دانت پێدا دەنێن و دەتکەنە

بەشێک لە جەستەی کۆمەڵایەتیی خۆیان. بەڵام ئەگەر هاتوو دۆخی ئەوانت قبووڵ نەکرد و کەوتیتە پرسیارکردن. ئەوا تاکە کارێک کە زۆر شارەزان تیایدا تۆمەت هەڵبەستنە. تۆمەتی ئەوەی لەخۆوە دەنووسێت زانستی نیت و دواکەوتوویت و..... تاد بەداخەوە ڕۆژ بەڕۆژ ئەمە پەرە دەسێنێت. لە دۆخ وەرگرتندا هەموو کات شتێک هەیە لە دەرەوەی مرۆڤەکان ئاراستەیان دەکات وەک پارە و دەسەڵات و کەسایەتی و..... تاد بەڵام دۆخی عەقڵی هەر دۆخ نییە بەتەنیا بگرە جۆرێک لە زەوینەی گونجاویشە بۆ دەرکەوتنی بوونی خۆی. لەم دۆخەدا کەسەکە خۆنوێنە بەڵام لە دۆخەکانی تردا ئەونوێنە. ئەم دۆخە سەرداریەتی و کۆیلەیەتیی تێدایە. کورد بەشوێن دۆخی عەقڵیدا دەگەڕێت کە نەکرێتە کۆیلە و زەوینەی بۆ ساز بکرێت کە دەرکەوێت. بەڵام لە کوێ و بە چی. دەبێت بڕۆینە دەرەوەی مێژوو چونکە مێژوو هیچی نییە بیخاتە سەر دۆزەکەمان.

۳- هاودۆخی:

لە باسی دۆخ وەرگرتن و دۆخ بەخشیندا باسی سەرداریتی و کۆیلەیەتیمان کرد کە یەکێک لە ئامادەبووان سەرداره و ئەوی تر کۆیلەیە. ئەمەش لە بەخشینی دۆخی یەکیان بۆ ئەوی تر بوو.

ئەوەشی لێرەدا هەیە ئایدۆلۆجیایە چونکە ڕوانینی یەکیان سەراپاگیر دەبوو بەسەر ئەوی تردا و ناچاری دیتنی دەکرد لە چاوی خۆیەوە. هاودۆخی حاڵەتی گواستنەوەی تێگەیشتنە بۆ یەکتر. واتە لەم بارەدا هەردوولا تێگەیشتن دەگۆڕنەوە و دەکەونە ناو یەک دۆخەوە لەم هاودۆخەدا بیرکردنەوە دێتە ئاراوە.

گفتوگۆی فەلسەفی حاڵەتی هاودۆخی نێوان گفتوگۆکەرانە، کە هەریەکە و لەناو دۆخی خۆیایەتی واتە دۆخێکی گشتیی هەیە ئاراستەی گفتوگۆکە دەگرێتە دەست. لە پاڵ ئەمەشدا دۆخێکی تایبەتی هەیە واتە کەسەکان لەناو دۆخی خۆیاندا لە دۆخە گشتییەکەدان. هەریەکە و بیرکردنەوەی خۆی ئاراستەی بابەتی بیرلێکراوە دەکات و یەک ئایدیا هەیە کۆمەکی لێ وەردەگرن و بەشوێن بنەما یەکەمینییەکانیدا دەڕۆن. بۆ گەیشتن بەو بنەما یەکەمینە. هەریەک لەناو خۆیدا هەست بەو بنەمایە دەکات. بەبێ ئەوەی دۆخ وەربگرن لە یەکتر. هەریەک بە شێواز و کەرەستەی خۆی گوزارشت لەو شتە دەکات. جا یان ئەوەتا سەرەتا سێبەرەکانی

ئەو شتە کەشف دەکەن یان سەرەتا بنەما هەمەکییەکە درک دەکەن و دواتر دەیبەن بەناو هەموو بەشەکی و شتە لاوەکییەکاندا بۆ ناسینەوە و ئاشکراکردن و دڵنیابوونی. هاودۆخی دەکرێت یەکێک قسەکەر و ئەوی تر گوێگر بێت بەڵام ئەو گوێگرتنە وەرگرتنی دۆخ نییە بگرە ناچارکردنی قسەکەرە بۆ گوزارشتکردن لە بنەما یەکەمینەکە، واتە کەسی گوێگر گوێ دەگرێت بۆ ئەوەی قسە بۆ خۆی بکات و قسەکەریش قسە دەکات هەتا گوێ لە خۆی بگرێت. ڕاستیی هاودۆخی حاڵەتی ڕەسەنی فەلسەفەیە. کە ئەم گفتوگۆیە کات و شوێن و کەس ئاراستەی ناکات، بگرە عەقڵ سەرپەرشتیی دەکات و ئایدیاکان ئەوە دیاری دەکەن کە ئەم گفتوگۆیە چۆن و تاکەی بەردەوام دەبێت. هەر بۆیە لەم بارەدا سەردار و کۆیلە نامێنێت وەرگر و بەخشەریش نامێنێت.

ئەم حاڵەتە پێویستی بەعەقڵی ئازاد هەیە، واتە عەقڵێک پاک بووبێتەوە لە بیرکردنەوەی بێ بنەما و کەسی. خۆشی لەزەت لەوە دەبینێت کە خەیاڵی پەرت نابێت و لەناو خۆیدا بیرەکانی خۆی دەدۆزێتەوە. گفتوگۆکانی سوکرات جیاوازییەکی هەیە ئەویش سوکرات حزووری هەیە بەڵام بەرامبەرەکانی حزووری تەواویان نییە. واتە حاڵەتی هاودۆخی دروست نابێت. بەڵام ئەم گفتوگۆیانە ناچنە خانەی دۆخ وەرگرتن و دۆخ بەخشینەوە، گەرچی سوکرات بەردەوام دۆخ دەبەخشێت. ئەم حاڵەتەشە زۆرجار بە فێڵزان و زمانزان و... تاد زانراوە، بەڵام سوکرات کاری بەوە نییە کەسەکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بگرە سوکرات دەیەوێ چییەتیی شتەکان بزانێت و تاقی بکاتەوە. نەک ئایدۆلۆجیا جەبر بکات بەسەر بەرامبەرەکانیدا، ئەوەشی سوکرات وەک براوەیەک نیشان دەدات ئەوەیە بەرامبەرەکان ناتوانن سوکرات لە دۆخی خۆی بێننە دەرەوە کە دۆخێکی تەواو عەقڵییە.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە هاودۆخی زۆر بەدەگمەن ڕوو دەدات چونکە بیریار و فەیلەسووفەکان زۆر بەتەنیا و غەریبی ژیاون. لە دوای خۆیان کەسانێک دەرکەوتوون کە ڕێگەی ئەوانیان ڕۆشن کردووەتەوە. بەڵام مرۆڤ لەگەڵ خۆی کەوتووەتە ناو هاودۆخییەوە وەک شیعر کە منی شاعیر و منی کۆمەڵایەتی بوونەتەوە بەیەک. منی شاعیر بیرکردنەوەی داوە بە منی کۆمەڵایەتی و هەردووکیان پێکەوە گوزارشتیان لە جەوهەری شتەکان کردووە. ئەم حاڵەتەش حاڵەتی هاودۆخی من و منە لە بەرامبەر یەکتردا.

٤ - **دۆخ چییە...؟**

ئێمە باسی دۆخمان کرد بەڵام ئێستا بابزانین دۆخ چییە؟ دیارە دۆخ سیفەتی گواستنەوەی وەرگرتووە بەوەی لە یەکێکەوە دەڕوات بۆ یەکێکی تر. بەم سیفەتەش دۆخ دەکەوێتە جووڵە و سیفەتی جووڵەی هەیە بەمەش دۆخ وەک مادە دەردەکەوێت. چونکە شتێکی کامڵکراوە کە لە دۆخ بەخشەوە دەڕوات بۆ دۆخ وەرگر. واتە توانای کشان و گواستنەوەی هەیە سیفەتی مادە وەردەگرێت، هەر بۆیە لە حاڵەتی دۆخ وەرگرتن و دۆخ بەخشیندا سەردار و کۆیلە هەیە. بەڵام دۆخی عەقڵی یان هاودۆخی (نێرەر و وەرگر) نییە بگرە دوو (هەبوو) هەن و دەکەونە بەردەم یەکتر و کەس سەردار و کەسیش کۆیلە نییە، بگرە هاودۆخی هەیە هاودۆخی هەستپێکردنی شتێکە لە یەک کاتدا و لە لایەنی دوو مرۆڤەوە.

هاودۆخی گواستنەوەی تێدا نییە بگرە ئاشکرابوون و دەرکەوتنە، دۆخ دوو سەرچاوەی گرینگی هەیە دەبێت باسی بکەین ئەویش سەرچاوەیەکی دەرەکی و ناوەکیی ناو مرۆڤە. سەرچاوەی دەرەکی ناو مرۆڤ ئەوەیە مرۆڤ حاڵەتی دۆخ وەرگرتن وەردەگرێت ئەم وەرگرتنە ئاماژەیە بۆ ئەوەی لە دەرەوە هاتووە. حاڵەتی ناوەکی ئەوەیە مرۆڤ دەبێتە دۆخ بەخش و دەیداتە وەرگر. بەڵام سەرچاوەیەک هەیە دەرەکییە بەڵام ناوەکی بووەتەوە. واتە سەرەتا ئەو دۆخەی وەرگرتووە دوایی دێت دەیداتەوە، ئەم حاڵەتە ڕەسەن نییە. حاڵەتی ناوەکی حاڵەتی خۆنوێنی مرۆڤە کە مرۆڤ ئەوە نییە وەک ڕێڕەوێک وابێت کە شتێک وەرگرێت و بیداتەوە.

ڕۆشنبیریی دوای ڕاپەڕین سەرەتا دۆخی ڕۆشنبیرانی عەرەب و فارس و ئەوروپای وەرگرت واتە لە دەرەوەی خۆی جەو و دۆخی فەیلەسووف و چەمک و بیر و.... تاد وەرگرت. پاشان ئەم حاڵەتەیان بۆ خوێنەر گواستەوە. بەوەی کە خۆیان خاڵقی ئەو بیرەن. بۆیە تا ئێستا بیردۆزێک، تیۆرێک نەهاتە ئاراوە، بگرە پەرتەوازەیی هەیە تا گەیشتووەتە ئەمڕۆ کە دەنگەکانی ئەم ڕەوتە خەریکی نووسینەوە و باسکردنی حیکایەت و بیرەوەرییە. چونکە هەتا شوێنێک دۆخ وەرگرتن کۆمەکی مرۆڤ دەکات. دواتر بابەتی تر و شتی تر دێن کە پێویستی بەوەیە بیر بکەینەوە نەک زانیاری بگوازینەوە. (دۆخ) حاڵەتێکی گواستراوە و جووڵاوە و شتێکە کامڵ بووە، کە توانای کشان و گواستنەوەی هەیە. بەمەش

ئایدۆلۆجیایە و دوورە لە بیرکردنەوە، چونکە بیرکردنەوە ناگوازرێتەوە. ئەوەش بەم ڕێگەیە خۆی بەمەعریفەوە خەریک دەکات ئەوە هیچ تێنەگەیشتووە لە فیکر و بیرکردنەوە. ئەوەندە هەیە دۆخ حاڵەتێکی سایکۆلۆجییە کە مرۆڤ تێی دەکەوێت، یان وەری دەگرێت یان دەیداتەوە. کە زۆر نزیکە لە ژیانی ڕۆژانەمانەوە بۆیە هەقی ئەوەی هەیە کە بیکەنە بابەتی لێکۆڵینەوە.

**٥- جۆرەکانی دۆخ:**

بەوەدا جۆری جیاوازیی ژیان هەیە، جۆری جیاوازیی دۆخیش هەیە. مرۆڤ لە ژیاندا بەناو کۆمەڵێک دۆخی جیاجیادا دەڕوات. ئەم دۆخانە هەریەکەیان وابەستەن بە بەشێکی ژیانی مرۆڤەوە و مرۆڤ داگیر دەکەن. ئەمەش ڕاستی بۆ ئەوەیە مرۆڤ ئەودیوی خۆی نەبینێت و بەردەوام بێت لەو دۆخەدا و نەیەتە دەر. ئەم دۆخانە هەمووییان حاڵەتی ڕاگوزەریان هەیە، چونکە ژیان خۆی ڕاگوزەرە. هەر دۆخە لەبارێکدا دێتە ئاراوە و پەیدا دەبێت.

بەڵام جار هەیە مرۆڤ ئیتر یەکێک لەم دۆخانە هەڵدەبژێرێت و ئامادە نییە دۆخێکی تر وەربگرێت. هەموو ژیانیشی لەناو ئەو دۆخەدا دەبێت و پارێزگاریی لێ دەکات، مۆسیقارەکان دۆخی تایبەت بەخۆیان هەیە ئەویش _ سەفەرکردنە لە نێوان واقیع و هونەردا. لەو نێوەندەدا دێن و دەچن هەر کاتێک واقیع ماندووی کردن دەچن بەرەو خەیاڵ لە ڕێگەی مۆسیقاوە ئەم دۆخە تەواو گشتی دەکەنەوە بەسەر ژیانیاندا و ئامادە نین دەستی لێ بەردەن.

جار هەیە ئەم دۆخە ناوەکییە دەرەکی دەبێتەوە و دەبێتە هۆی ناوبانگ و سەرمایە و... تاد بەمەش دەکەوێتە ناو دۆخێکی ترەوە کە دۆخی ساختەی مۆسیقارە. واتە جۆری دۆخەکان بەپێی ئیش و کاری مرۆڤەکان دەگۆڕێت. دەتوانین بڵێین چەندە مرۆڤ هەبێت ئەوەندە دۆخ هەیە. هەریەکە دۆخی خۆی هەیە بۆ ژیان. کەسانێ هەن کە فەرمانبەری و حزبایەتی.... تاد دەکەن. وەک کار وەری ناگرن بەتەنیا، بگرە وەک دۆخێک وەری دەگرن و لەناویدا دەژین. ئەم دۆخانە هەموو جیاوازن بۆ مرۆڤ پێوەندیی هەیە بەدەوروبەر و ئەوی ترەوە، مرۆڤ هەر جارە و دۆخێک وەردەگرێت. بچینە مزگەوت دۆخێک وەردەگرین بچینە بازاڕ دۆخێک. بچینە لای سەرۆک دۆخێک وەردەگرین. هەر ڕۆژە دۆخێک هەیە تێی

دەکەوین. کات هەیە کە لە خەو هەڵدەستی بەبێ هۆ دڵخۆشین یان بەپێچەوانەوە. ئەم حاڵەتانە هەروا بێ مانا و بێ هۆ نین، بەڵام ئەوە بێتاقەتی مرۆڤە کە تاقەتی پرسیارکردنی نییە لە خۆی. ئەمەش ئەم ژیانە واقیعە نالەبارەیە کە مرۆڤی بەستووەتەوە بەخۆیەوە. مرۆڤیش نایەوێت ئەوەندە بچێتە ناو قوڵاییی شتەکان، چونکە ڕاستی شتی بۆ ئاشکرا دەبێت و جار هەیە دەبێت واز بهێنیت لەو شتەی کە ساڵانێکە بینای کردووە. دۆخ هەیە ناوەکییە لە ناوەوەی مرۆڤەوە دێتە دەر و هیچ کاریگەرییەکی دەرەوەی لەسەر نییە. لێرەدا ئێمە باسی سێ جۆری دۆخ دەکەین ئەوانیش (دۆخی جەستە و دۆخی دەروونی و دۆخی عەقڵی) کە هەریەکەیان دوو دۆخیان هەیە ئەوانیش دۆخی ڕاستەقینە و دۆخی ساختەیە. دۆخە ساختەکە ئەوەیە لە دەرەوە دێت و مرۆڤ دەکاتە دۆخ وەرگر، دۆخە ڕاستەقینەکەش ئەوەیە لە ناوەوە دێتە دەر و مرۆڤ ئاراستەی دەوروبەری دەکات.

ئێمە گەر دۆخەکانمان ناسی دەتوانین مرۆڤەکانیش بناسین، چونکە مرۆڤ دەرکەوتەی دۆخی خۆیەتی. واتە کاتێک مرۆڤێک بەردەوام لە دۆخی جەستەدایە ئەوا هەموو شتەکان دەرکەوتەی ئەم دۆخەن، ژیان و ژنهێنان و نووسین و بیرکردنەوەکان هەمووی دەرکەوتی ئەم دۆخەن. لێرەدا هەوڵ دەدەین جۆرەکان جیا بکەینەوە و باسیان بکەین.

(١-٥) دۆخی جەستە:

جەستەی بایەلۆجیی مرۆڤ بەوەدا کۆمەڵێک بەشی جیاوازە و هەر بەشە و کاری تایبەتی خۆی هەیە و جیاوازە لە بەشەکانی تر. لەبەر ئەمەش جەستەی بایەلۆجی خاوەنی کۆمەڵێک دۆخی جیاوازە. دۆخی هەیە تایبەتە بەبرسێتی دۆخی هەیە بە نەخۆشی و دۆخی وەرزش و.... تاد هەریەک لەم دۆخانەش کە ڕوو دەدەن تەواوی مرۆڤەکە داگیر دەکەن و دەیخەنە ناو خۆیانەوە و مرۆڤ لەو دۆخەدا دەردەکەوێت.

بۆ نموونە گەر سەیری دۆخی برسێتی بکەین، دیارە دۆخی برسێتی دوو جۆری هەیە یەکیان برسێتییە کە لە ناوەوەی جەستە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر مرۆڤ و مرۆڤ ناچار دەکات کە خواردن بخوات. جۆری دووەمی (نەوسنی - چڵێسی) کە لە دەرەوەی جەستە دۆخەکە پەیدا دەبێت و مرۆڤەکە دەکەوێتە ناویەوە و خواردن

وەردەگرێت لە دەرەوەی پێویستی خۆی. دۆخ وەک شوێنگە وایە واتە شوێنی ڕووداوەکانە کاتێک دۆخی جەستە دەست پێ دەکات مرۆڤ لەو شوێنگەیەدا، کە دۆخەکەیە دادەنیشێت و لەوێوە سەیری شتەکان دەکات. واتە هەر شتێک کە دەکەوێتە بەرچاوی لەو دۆخەدا. ئەو دۆخە ئاراستەی بینین و سەیرکردنی ئەو مرۆڤە دیاری دەکات، کاتێک مرۆڤێک دەکەوێتە ناو دۆخی برسییەتییەوە ئەم دۆخە مرۆڤەکە ناچار دەکات لەو شوێنگەیەدا خەیاڵ بکات و بەخەیاڵیدا بێت، کە هەمووی حازرکردنی خواردنە لە شتەکاندا واتە شتەکان بەخواردن وێنا دەکات.

قۆناغی منداڵی کە جەستە تیایدا چالاکە بەردەوام شتەکان وەک خواردن دەبینێ و هەرچی بەردەست بکەوێت دەیبات بۆ دەمی و دەیخوات. ئەم دۆخە جەستەی بایەلۆجی دروستی دەکات. جا پاڵەپەستۆکە ناوەکی بێت یان دەرەکی، لە حاڵەتی یەکەمدا کە ناوەکییە جەستەی مرۆڤ دۆخ دەبەخشێتە شتەکان وەک دروستکردنی خواردن.

کە سەرەتا کەرەستەکان بەکەڵکی خواردن نایەن وەک (برنج پێش کوڵان، خوێ، ڕۆن) لەم حاڵەتەدا دۆخەکە دێتە دەر و مرۆڤ دۆخ دەبەخشێت بەکەرەستەکان و خواردنێک چێ دەکات. حاڵەتی برسیەتی دۆخ دەدات بەمرۆڤ مرۆڤیش دۆخ دەداتە کەرەستەکان. واتە مرۆڤ لەم بارەدا خەیاڵ دەداتە شتەکان. بەڵام لەباری دووەمدا کە وەرگرتنی دۆخە (نەوسنی) ئەوا خواردنێک هەیە لە دەرەوەی خۆمان و ڕامان دەکێشێت، خوارنەکە دۆخ بەخشە مرۆڤ دۆخ وەرگرە. واتە خواردنەکە خەیاڵ بۆ ئێمە دروست دەکات و ناچارمان دەکات نان بخۆین.

ڕێکلامی ناو تیڤییەکان هەمووی دۆخ بەخشین و دروستکردنی خەیاڵە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی مرۆڤەکە ناچار بێت ئەو خواردنە بخوات. ئەم دۆخ بەخشینەی ڕێکلامەکان هەمووی ڕاکێشانی مرۆڤە بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو دۆخەکەوە و دۆخەکە وەربگرێت، کە دۆخەکەی وەرگرت ئیتر ئەو مرۆڤە ڕۆژێک هەر دەچێتە ئەو خواردنگەیە. ئەمەش لە ڕێگەی زۆر دووبارەکردنەوە ئەنجام دەدرێت. چونکە زۆر جار مرۆڤ ئاگای لە خۆی نییە دۆخی دراوەتێ. کاتێک لە دەرەوەین و برسیمانە لەویادا دەچینە ئەو شوێنەی کە لە ڕێکلامدا دیومانە.

جا وادەزانێ ئەمە هەڵبژاردنی خۆیەتی بەڵام نازانێت دۆخی دراوەتێ. یاخۆ

گۆڕانی هەیە ئەوەندە لێ دەدرێت کاتێک ئاگامان لە خۆمان نییە کە هەموویمان لەبەر کردووە. بۆیە دۆخ وەرگرتن سیحری مرۆڤە لەگەڵ یەک. حاڵەتی تری جەستەیی هەیە وەک وەرزش ئەویش دوو جۆرە یەکەمیان مرۆڤەکە هەست دەکات پێویستی بەوەرزش هەیە بۆ بەهێزکردنی ماسوولکە و ژیانەوەی خانەکانی لەش و ڕزگاربوون لە خاوەخاو. لەم بارەدا مرۆڤەکە وەرزش دەکات جا یان هەر بەتەنیا یاخۆ کۆمەڵێک کەرەستەی گونجاو دروست دەکات هەتا ئاسانتر وەرزشەکە ئەنجام بدات. بۆ نموونە یەکێک دەیەوێت یاریی لەشجوانی بکات گەر هات و ئالەتی دەست نەکەوت ئەو کات دێت لە شتی تر ئەو ئالەتە دروست دەکات و دۆخ دەداتە شتەکان.

حاڵەتی دووەم کەسێک هەیە دەکەوێتە ناو کۆمەڵێک ئامێری وەرزشیی سەرنجڕاکێشەوە واتە ئامێرەکان دۆخی دەدەنێ و مرۆڤەکە حەز لە وەرزش دەکات. بەڵام ناگاتە هیچ، چونکە حاڵەتەکە ڕەسەن نییە. جەستەی بایەلۆجی دۆخی جیاجیای هەیە کە مرۆڤ ناچار دەکات دۆخ ببەخشێتە شتەکان وەک دروستکردنی کورسی، مێز، قەرەوێڵە...... هتد ئەم کەرەستانە دۆخی جەستەی مرۆڤن جەستە دۆخی بەخشیوەتە ئەم کەرەستانە.

ئەم دۆخ بەخشینەی جەستە دەتوانین بیدۆزینەوە لەو کەلوپەلانەی کە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین، دۆزینەوەی ئەم شتانە زۆر بەکەڵکمان دێت بۆ تێگەیشتن لە بابەت و شتی تر. لەویادا کورسی بۆ یەکەم کەس کە دروستی کردووە بێزار بووە ئەوەندە بەپێوە ڕاوەستێت ئەم بێزاربوونە دۆخی داوەتە مرۆڤەکە و مرۆڤەکەش دۆخی داوەتە کەرەستەی تایبەت بەو ئایدیالە. دروستکردنی ئەم کورسییە لای کەسی یەکەم زۆر جیاوازە لەوەی دوایی بەکاری دەهێنێ. کەسی یەکەم بێجگە لە ڕاحەتی جەستە ڕاحەتێکی تری چەشتووە ئەویش ئاشکراکردنی شتێکە، بەڵام کەسی بەکارهێن تەنیا ڕاحەتی جەستە دەبینێ. ئەم کارەش کە لە جەستەی بایەلۆجی دەکەوێتەوە (دروستکردن)ە، چونکە کارەکە مەبەستێکی واقیعی و دنیاییی هەیە و وەزیفەی واقیعیی هەیە بۆیە جیاوازە لە کردەی (خوڵقان) کە خودی بیرکردنەوەی ڕەسەنە.

ئەوەی ئەمڕۆ تەکنەلۆجیا بەرهەمی هێناوە کە بەشێکی زۆری وابەستەیە بە

جەستەوە ناتوانین بڵێین داهێنان و خوڵقانە. چونکە تەکنەلۆجیا بەرهەمەکانی هەمووی بەپێی پێداویستی واقیع هێناویەتە بەرهەم و ئەو شتە دروست کراوە لە کاتی بەکارهێناندا مانای هەیە. بەڵام داهێنان و خوڵقان وابەستە نییە بە بەکارهێنانەوە، بگرە رەهایە و ماناکەی لەخۆدایە. وەک کاری هونەریی رەسەن کە زیاتر عەقڵییە و واقی بووەتەوە.[٦٤] بۆیە بابەتی دۆخ بابەتێکی گرینگ و هەستیارە، مرۆڤ رۆژانە دۆخ وەردەگرێت و دۆخ دەبەخشێت. هەر بۆیە دەبێت ئاگامان لە خۆمان بێت و بگەڕێینەوە ناو خۆمان هەتا مەعریفەی ڕاست و دروست وەدەس خەین لەسەر خۆمان و بەرامبەرمان.

(٢-٥) دۆخی دەروونی:

لە باسی دۆخی جەستەدا ئەوەمان روون کردەوە کە دۆخ حاڵەتی باڵپۆشینی هەیە، کە مرۆڤ ئاراستە دەکات و لەو دۆخەدا مرۆڤ شتەکان دەبینێت. دۆخی دەروون جیاوازە لە دۆخی جەستە بەوەی سایکۆ پێویستی بەجەستە هەیە بۆ دەرکەوتن، زۆرجار هەردوو دۆخەکە پێکەوە دەکەونە ناو ئەنجامدانی کارێکەوە. بەڵام دۆخی سایکۆیی زیاتر لەناو مرۆڤدا روو دەدات. زۆرجار ئەم دۆخە ماڵی مرۆڤە بەو مانایەی مرۆڤەکە زۆربەی کاتی ژیانی لەناو ئەم دۆخە دەگوزەرێنێت. ئێمە چەند نموونەیەک وەردەگرین و لەسەر ئەم تیۆرە ئیشی لەسەر دەکەین:

نموونەی یەکەم / تاوان و تاوانکاری:

تاوانبار هەیە کە تاوان دەکات پێوەندیی نییە بە قوربانییەکەوە، واتە کەسی تاوانلێکراو هیچ پێوەندیی نییە بە تاوانبارەوە. بەڵام تاوانبار لە دۆخێکی سایکۆلۆجیادایە و دەیەوێت (بکوژێت) پێشتر ئەم کەسە بەخەیاڵ ئەم کارە ئەنجام دەدات و هەموو ئەو شتانەشی پێویستە ئامادەی دەکات. کاتێک دەکەوێتە ناو ئەم دۆخەوە ئەو کات دۆخ دەبەخشێ بەکەرەستەکان و بەو مرۆڤەی بەردەمی. بۆ نموونە ئامێرێکی وەک (چنگاڵ) کە کەرەستەی نانخواردنە، ئەم تاوانبارە دۆخی دەداتێ و دەیکاتە کەرەستەیەکی تاوان و دەبێتە (مبرز الجرمی) یان هەر ئالەتێکی تر بێت کە کەسی تاوانبار دۆخ دەداتە ئەم کەرەستانە و وەزیفەیان دەگۆڕێت، پاشان دێت کەسی تاوانلێکراو لە کەسێکی ئاساییەوە دەکاتە دوژمنی خۆی و دۆخی دەداتێ.

دیاره گەر لەم حاڵەت و دۆخەدا نەبێت ئەوا تاوانبار ناتوانێت ئەم کارانە ئەنجام بدات، بگرە ئەوە هەبوونی ئەو دۆخەیە، کەسەکە دەکەوێتە ناویەوە و ئاراستەی خۆی لە دەست دەدات و جەستەی ئەو چۆنایەتییە وەردەگرێت کە سایکۆی دەیەوێت. ئەوەی لێرەدا گرینگە ئەو دۆخ بەخشینەی کەسی تاوانبارە بە تاوانلێکراو و کەرەستەکان، دیارە ئەم نموونەیە بۆ کەسانی (نەخۆشە) کە ئەم جۆرە لە تاوان ئەنجام دەدەن. لەم بارەدا تاوانبار دۆخی جەستە و عەقڵیی بزر دەبێت و ئەم دۆخە سایکۆلۆجییە باڵپۆشینی دەکات و هەموو ئامانجی ئەوەیە کە ئەم دۆخە لە دۆخێکی دەروونییەوە بکاتە واقیعێکی دەروونی، چونکە ئەو دۆخە واقیعی دەروونی دەخاتەوە.. بینای کۆمەڵگەی کوردی واقیعێکی دەروونییە. مرۆڤ هەر لە سەرەتای لەدایکبوونەوە دەکەوێتە بەردەم کۆمەڵگە و دەکەوێتە بەردەم شەڕی خۆی و ئەوی تر. هەر جارە و دۆخێکی دەروونی دێتە ئاراوە بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بسەپێنی لەناو کۆمەڵگەدا، ڕۆیشتن بۆ هەندەران یەکێک بوو لە دۆخە دەروونییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بۆ تاکەکانی. چونکە چوون بۆ هەندەران چوون بوو بۆ ناو عەقڵی کۆمەڵگە و گەیشتن بوو بەو سەرمایە ڕەمزییەی کۆمەڵگە بەخشیبووی بە کەسی تاراوگەنشین. بۆیە ژیان لە هەندەران ژیان بوو لەناو عەقڵی کۆمەڵگەی کوردیدا، ئەم دۆخە دەروونییە واقیعێکی دەروونیی خستەوە. بەڵام کۆچکردن جیاوازە لەم حاڵەتە چونکە کۆچ و گەڕان مرۆڤەکە بەشوێن خۆیدا دەگەڕێت نەک بەشوێن دان پێدانانی ئەوی تردا. زۆربەی شەڕی مرۆڤ بۆ پارە و سەروەت و ماڵ و..... تاد هەمووی بەرهەمی ئەم دۆخە دەروونییەیە. وەگەرنا ئەو شتانە ناتوانن مرۆڤ بەختەوەر بکەن، بگرە زۆربەی بۆ چاوی بەرامبەرە. کۆمەڵگە یەکەمین وێستگەی بەرهەمهێنانی ئەم دۆخەیە، جا دەرکەوتەکانی دۆخی دەروونی زۆرن و ناتوانین سنووربەندی بکەین. ئەم دۆخە دێتە ناو ئاین، هونەر، زمان.... تاد. واقیعی دروستکردنی (تیرۆر) ئەم دۆخە دەروونییەیە کە پیاوە دینییەکان دروستی دەکەن بۆ کەسی (تیرۆریست). خەونی بۆ دروست دەکەن بە خەیاڵ. بەڵام زۆر دۆخی دەروونی هەیە کە دەرکەوت ناکات و هەر لەناو مرۆڤدا دەمێنێتەوە وەک (زیندەخەو).

نموونەی دووەم/ لەشفرۆش و لەشکڕ:

واتە سۆزانی و کەسی لەشکڕ، دیارە سۆزانییەکان بەردەوام ئەو کەسانەن کە توانای بەخشینی دۆخیان هەیە و زۆر کەم دۆخ وەردەگرن. یەکێک لە کارە سەیرەکانی سۆزانی ئەوەیە توانی ئەوەیان هەیە کە بەپێی کریارەکانیان دۆخ دروست بکەن. ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەی ببنە سەردار بەسەر کڕیارەکانەوە. هەتا هەر چییان وت بیاندەنێ. واتە کڕیار هەردەم کۆیلەیە چونکە سەرچاوەی هێزەکە لای سۆزانییەکەیە، بەڵام ئەگەر هاتوو سۆزانی دۆخی کریاری وەرگرت دوو شیمانەی هەیە. یان ئەوەتا دۆخی یەکێک لە کریارەکان وەردەگرێت و عاشق دەبێت. سۆزانییش نابێت عاشق بێت، چونکە ئەو دەبێت هی هەمووان بێت و هی کەس نەبێت بەتەنیا، واتە ئەو هی هەمووانە و کەسی نییە. بەڵام هەموو کەسی ئەون لە کاتی سێکسدا. ئیتر دوای ئەوە سۆزانی تەنیایە و نابێت بیر بکاتەوە، بەردەوامیش دەبێت پەرت بێت و لەو دۆخەی خۆی نەیەتە دەر. هەتا بتوانێت وەک سۆزانی بمێنێتەوە و هەموو لە دەوری بن. شیمانەی دووەم وازهێنانە یان بەپێی دۆخی کڕیارەکەیە کە سۆزانییەکە چی لێ بەسەردێت، توانای بەخشینی دۆخ لای سۆزانی توانایەکی گەورەیە بەو ڕادەیەی کە گەورەترین پیاو بچووک دەکاتەوە کە قاچی ماچ بکەن. ئەم هێز و دەسەڵاتە هی بەخشینی ئەو دۆخە دەروونییەیە کە دروستی دەکات بۆ کڕیار. بەڵام ئەگەر هاتوو دۆخی بەخشی و وەرنەگیرا لەلایەن بەرامبەرەکەوە ئەوا کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە و کڕیارەکە دەبێتە دۆخ بەخش. جا سۆزانییەکە وەری دەگرێت یان نا ئەوە شتێکی ترە.

بەڵام فەزاکە لە فەزای سێکسکردنەوە دەگۆڕێ بۆ فەزایەکی تر. سێکس و تاوان زۆر پێوەندییان بە یەکترەوە هەیە و هەردووکیان سەر بەم دۆخە دەروونییەن. کە دۆخ وەرگرتن و دۆخ بەخشین بەڕێوە دەبەن، ئێمە بەم تیۆرە سەراپاگیرە دەتوانین دۆخەکان و واقیعەکان لەیەکتری جیا بکەینەوە و بناسینەوە. دۆخی دەروونی دۆخێکی ترسناک و لێکچووی دۆخی عەقڵییە. زۆر گۆرانی و ڕۆمان و چیرۆک هەن کە دەرکەوتنی دۆخی دەروونن کاتێک خوێنەر خۆی تیا دەبینێتەوە وەک هاودۆخییەک دروست بێت وایە، بەڵام ئەم هاودۆخییە ساختەیە چونکە وێک هاتنەوەیە لەگەڵ بیرەوەریدا و هەر دۆخ بەخشینە. چونکە کەسەکان یان ئەوەتا

خۆیان دەچنە ناو دۆخەکەوە یان حیکایەتەکە دادەمەزرێنن لە خۆیاندا. لە هەردوو بارەکەدا لێکچوون هەیە و کەسەکان بەناو یەکدا دەچن و دەبن بەیەک. جا نووسەر هەیە لێزانە لە ناسینی سایکۆلۆجیای جەماوەر و خوێنەرێکی زۆر کۆ دەکاتەوە، بەڵام بنەماکەی بۆشە. ڕۆمانی کوردی و مۆسیقا و گۆرانیی کوردی ئەم دواییە یان دەرکەوتەی دۆخی جەستەن یان دۆخی دەروونن تەنانەت ڕۆشنبیری کوردی یان ڕۆشنبیرییەکی جەستەییە یان دەروونییە. ئاسۆی ڕۆشنبیرییەکی عەقڵی زۆر تاریکە هەر بۆیە واقیعییەکانیش یان جەستەیین یا دەروونین. مرۆڤی ئێمە بێزارە لە شتەکان بێزارە لە هونەر، نووسین، ڕۆمان، گۆرانییەکان..... تاد بەردەوام غەریبەیەک هەیە مرۆڤی کورد تیای دەژیت کە شتەکان نارازی ناکەن. نەبوونی جەوهەر و نەبوونی بنەما ئەم دۆخە ناخۆشەی لێ کەوتووەتەوە. چونکە مرۆڤ لە دۆخی عەقڵی و واقیعی عەقڵیدا بەردەوام ئەوە دێتە پێش چاوی کە خۆی دەیەوێت. دۆخی دەروونی و جەستە ئارامییەکی کاتی دەدەن بە مرۆڤ، بەڵام مرۆڤ دواتر هەست دەکات شتێک هەیە نەیکردووە. نەزانین و دیارنەبوونی ئەو شتە مانای پووچی و خەیاڵپڵاوی نییە. بگرە خودی عەقڵ و بنەما لەناو ئەو هیچی و بێ مانایەدا خۆیان حەشار داوە، کە حاڵەتی عەدەمە. زاڵبوون بەسەر دۆخی دەروونیدا هەر وا شتێکی ئاسان و سادە نییە، چونکە ئیرادە و ئازایەتیی دەوێت. ئەم دۆخە وەک پەڵە هەورێک بەربەستە لە بەردەم خۆری عەقڵدا. جووڵان و لابردنی بیرکردنەوەی دەوێت و مرۆڤ دەبێت لەناو خۆیدا شتەکان چارەسەر بکات. ئەوجا لە واقیعدا چارەسەر دێتە ئاراوە. دادگەکان بەردەوام لە دەرەوە کێشەکان چارەسەر دەکەن. بۆیە سەیر دەکەین ئەم چارەسەرکردنە ڕاست و دروست نییە و بەردەوام ترسێک هەیە بۆ تێکچوون و هەڵوەشاندنەوەی. بۆیە مرۆڤ دەبێت خۆی حاکمی خۆی بێت و لەناو خۆیدا شتەکان چارەسەر بکات. ئەگەرچی ئەم چارەسەرە زۆر گرانتر و قورسترە لە چارەسەری دادگەکان، چونکە ئیرادە و ئازایەتیی مرۆڤی دەوێت.

(٣-٥) دۆخی عەقڵی:

دۆخی عەقڵی دۆخێکی تەواو جیاوازە لە دۆخەکانی تر، دۆخەکانی تر مرۆڤ کاتێک دەکەوێتە ناو دۆخەکانی ترەوە هەردەم ئەوی ترێک هەبوو بۆ ئاراستەکردنی،

بەلام دۆخی عەقلّی بەوە جیا دەبێتەوە کە دۆخ وەرگرتنی نییە، لەم دۆخەدا مرۆڤ بەردەوام دۆخ دەداتە خۆی وەک پرۆژەیەکی ناوەکیی خۆی عەینی دەکاتەوە. جا یان ئەوەتا مرۆڤ لە دۆخی عەقلّیدا سەرقاڵە بەخۆی و خۆی دەکاتە بابەتی بیرکردنەوە بۆ خۆی. یان دەکەوێتە دەرەوەی خۆی و بیرکردنەوەی ئاراستەی شتەکان دەکات. ئەویش بۆ دۆزینەوەی سیستەمی ناوەکی و بنەما یەکەمینەکان. ئەمەش عەقلّ ئاراستەبەخشە تیایدا، چونکە عەقلّ هەرگاڤ کارتێکەرە و کارتێکراو نییە.

باری یەکەمی عەقلّ ئەوەیە لەگەڵ خۆی ڕادەمێنێ و خۆی عەینی دەکاتەوە، لەباری دووەمدا عەقلّ لەگەڵ شتەکان دەکەونە ناو هاودۆخییەوە. مرۆڤ لە هاودۆخیدا هەمەکیەتی شتەکان دەدۆزێتەوە. واتە کاتێک دوو مرۆڤ دەکەونە بەرامبەر یەک هەردووکیان دەکەونە حاڵەتی هاودۆخییەوە. هەردووکیان هەمان سیستەم و هەمەکیەت دەدۆزنەوە لەناو یەکتردا. هەریەک بۆ ئەوی تر دەبێتە زەوینە و دۆخ بەخش و دۆخ وەرگر نامێنێت، لێرەدا عەقلّ خۆی دەدۆزێتەوە و شتەکان ڕێک دەخات. پاشان خۆی تەواو دەکات، چونکە مرۆڤ لە جەوهەردا پرۆژەیەکی عەقلّییە نەک پرۆژەیەکی جەستەیی و دەروونی. کاتێک مرۆڤ گەیشتە ئەو هۆشیارییەی کە بزانێت پرۆژەیەکی عەقلّییە. ئیتر ئەو مرۆڤە دەبێت زەوینەسازی بکات بۆ واقیعیبوونەوەی عەقلّ. لێرەدا ڕەشبینی و بێ ئامانجی و بێ هیوایی نامێنێ. چونکە مرۆڤ تێ دەگات کە شتێک هەیە بۆی دەژیت، هەر ئەم ژیانەش قابیلی کردنە چونکە مرۆڤ بەدەر لە هەر شتێک خۆیەتی و کەسی تر نییە. لەم بارەدا مرۆڤ هەرچی بکات ڕووداوە و هەر قسەیەکیش کە دەیکات گوتنە، چونکە عەقلّ لە پشت شتەکانەوەیە. دۆخی عەقلّی دۆخێکی ڕەمزئامێزە و مرۆڤ دەچێتە ماڵەکەی خۆی و لەناو خۆیدا شتەکان دەبینێ و دەبیستێ، بۆ ئەوەی دۆخی عەقلّی لە دۆخەوە ببێت بەواقیع تووشی کۆمەڵێک بەربەست و لەمپەڕی جیاجیا دەبێتەوە و هەروا ئاسان نییە، بەرامبەر بەدۆخی جەستە و دەروون کە واقیعیبوونەوەیان ئاسانە. لە واقیعیبوونەوەی دۆخی عەقلّیدا هەردەم ڕووداوێک هەیە ڕوو دەدات، کە شتانێک تێک دەشکێن و شتانێکی تر سەر دەردەهێنن. هەر لەبەرئەوەی کە هێندە گران و نارەحەتە زۆرێک لە ڕۆشنبیران بەوەهم و بەدرۆی دەزانن. بگرە بە ئەفسانەی دەزانن. لە ڕاستیدا ئەوە ڕاستە کە ئێمە واقیعی عەقلّمان نییە لەسەر ئاستی کۆمەڵگە و حکومەت. بەلام شیانێکە بۆ ئەوەی ڕوو بدات. لە هونەردا لە

مۆزیکدا هەیە لە فەلسەفەشدا کە تەواو مەیدانی عەقڵە هەیە. جیاوازیی فەلسەفە لەگەڵ هونەرەکاندا بەگشتی ئەوەیە فەلسەفە تەنیایە. چونکە عەقڵ هەر خۆی بۆ خۆی لە زماندا دەردەکەوێت و زمانەکەش تەواو عەقڵییە و جیاوازە لە زمانی ئاسایی. بەڵام هونەرەکانی تر بەوێنە و بەکەرەستە گوزارشت لە عەقڵ دەکەن واتە بینراون. بەڵام فەلسەفە بیستراوە، ئەمەش جێگیر نییە چونکە ئەفلاتوون لەناو ئەفسانە و حیکایەتدا گوزارشتی لە فەلسەفە کردووە، کە زیاتر بینراوە و وێنەیە. بەڵام عەینینەبوونەوەی عەقڵ لە واقیعدا سستیی مرۆڤە چونکە مرۆڤ زیاتر مەیلی بەوەیە کە ژیانێکی حەیوانی و غەریزی بژیت. فەیلەسووفەکان کەسانێک بوون هەموو کات لە زەوینەسازی بوون بۆ ئەوەی دۆخی عەقڵی لەناویاندا دەست پێ بکات و ئەوانیش لە دۆخەوە بیکەنە واقیع. ڕازیبوونی مارتن هایدگەر بەسەرۆکی زانکۆ بۆ ڕزگارکردنی زانکۆ بوو. مردن و ژیانی سوکرات هەر بۆ ئەم بنەمایە بوو، دۆخی عەقڵی هەردەم دۆخێکی کارتێکەرە بەڵام بەمانای داگیرکردنی ئەوی تر نا! بگرە ڕاکێشانی ئەوی ترە بۆ ئەوەی عەقڵ لەناویدا دەرکەوێت، هەم بۆ خۆی و هەم بۆ بەرامبەر. ئەوەی سوکرات دەیکات لەناو گفتوگۆکاندا بردنی هەمەکیەتی عەقڵە بەناو کایەکانی (شیعر و سیاسەت و ئەخلاق و... تاد) و هەموو ئەو کایانەی سوکرات لە ماوەی ژیانیدا تاقی کردووەتەوە. ژیانی سوکرات تەواو عەقڵی بووە. هەر بۆیە زۆرجار دەوترێت فەلسەفەکەی ژیانیەتی. مرۆڤ کاتێک دەڕواتە ئەودیو دەروونی خۆی و بەعەدەمدا دەڕوات ئیتر زۆر بەئاسانی دۆخە عەقڵییەکانی خۆی دەناسێتەوە. ئەوەش دەدۆزێتەوە کە خۆشبەختی لەو دۆخەدایە. مرۆڤ پاک دەبێتەوە و دانایانە دەژیت. نەک زیرەکانە، چونکە دانا وادەزانێت هیچ نازانێت بەڵام زیرەک خۆی بە زۆر شت دەزانێت، کەسی دانا فێر دەبێت و مەعریفە دەستەبەر دەکات زیرەک وەردەگرێت و دەداتەوە. بەڵام بەختەوەریی ڕاستەقینە گەیشتنە بە جەوهەر. لەم گەیشتنەدا مرۆڤ خۆی دەدۆزێتەوە چونکە پێشتر ون بووە. هونەرمەندی ڕاستەقینە و بیرکەرەوەی ڕاستەقینە لەوەدا نییە کە جەماوەری زۆری هەیە و زۆر دەخوێنرێتەوە، بگرە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە عەقڵ عەینی دەکەنەوە و هەرگاف ژیانێکی دووبارەنەکراو دەژین، ئەوانەن کە خۆنوێن نەک ئەونوێن. ئەمەش دۆخی عەقڵی دەیبەخشێتە مرۆڤ. بەئاگا لەوەی کە دۆخی عەقڵی ناوازەیە و کەم ڕوو دەدات. بەڵام زۆر بەجێ دەهێڵێت و زۆر دەبەخشێت کە هی

خۆیەتی بە تەنیا. ئەم کەم ڕووداوانە و ناوەزمیەشی دەکەوێتە سەر مرۆڤ کە تا چەند بەدەنگەوەچوونی هەبووە بۆ بەدەنگەوەهاتنی عـەقڵ. ئەوەندە فـێـر دەبێت و زۆر دەیبینێ. لێرەدا مرۆڤ زەمەن و تەمەنی خۆی تێ دەپەڕێنێت و دەچێتە ناو عالەمی جیاجیاوە بەڕاستی سەفەر دەکات. چونکە فێر دەبێت و گەورە دەبێت و پرۆژەی عـەقڵی خۆی تەواو دەکات. پەشیمانیش نییە لـەوەی دەیکات و دەیڵێت. فەلسـەفە بەواقیـعیکردنی دۆخی عـەقڵـییـە. فـەلسـەفـە لەویادا گـرینگە کـە تیـۆری ژیان و شـیمـانەکانی لەخۆ گرتووە. چونکە عـەقڵ سـەرچاوەی تیـۆرە هەمـەکییـەکانە. ئەم تیـۆرانە لەسـەر بنەمای عـەقڵیی خۆیان پێشـان دەدەن وەک سیستـەمێکی عەقڵی سەراپاگیر، کە لە بنەمادا یەک جەوهەر و یەک بنەمای سەرەکییە. بەڵام بـەوەشدا کـە مرۆڤـەکان جـیاوازن و لە یەکتـر ناچن، هەریەکـە توانایەک و چۆنایەتییـەکی جـیـاوازی هەیە بۆ دەرکـەوتن. جـیـاوازیی فـەلسـەفـەکـان جـیـاوازیی توانا و چۆنایەتییـەکانە. بەڵام لە جـەوهەردا هـەمـوویان یەکن ئـەویش فـەلسـەفـەیە. کـە بەواقیعیکردنی دۆخی عەقڵییە. عەقڵ توانایەکی بێ شوماری هەیە لە دەرکەوتن لە زەمـەن و لە فۆرمی جیاجیـادا. بۆیە هیچ جێگەی سـەرسوڕمـان نییە کە فـەلسەفە ڕۆژێک لەوپەڕی دنیادا بەشێوازێکی تر و جۆرێکی تر لەناو زمانێکدا سـەرهەڵبدات کە زمـانێکی زۆر لاوەکی و ناوچەییشە. چونکە هەمـوو زمانەکان بێ جیاوازی وەک یەکن و هیچیـان لەوی تریان کەمتر نییە. فەلسەفە زۆرجـار چاودێریی عەقڵ دەکات لەناو مێژوودا، بۆ ئەوەی تەواو لە هەمـەکیـەتی عـەقڵ تێ بگات، چونکە لە مێژوودا هـەرجارە و عەقڵ بەشێوازێک دەرکەوتووە.

**٦- ونبوون و دەرکەوتنی دۆخەکان:**

باسکردنی دۆخـەکان یەکێکە لە بـابەتە گرینگەکانی سـایکۆلۆجیـا و فـیکر، کە زۆرتر هەڵدەگرێت لـەوەی ئێمە لەو سـەرەباسانەدا ئاماژەمـان پێ داون. چونکە هـەر جۆرە بۆ خـۆی کۆمەڵێک بەشی لێ دەبێتـەوە بەڵام ئێمە وەک سـەرەتا ئەم بابەتەمان لە بابەتێکی شـاراوە خستـە ناو پرۆژەی بیرکردنەوە. بەئومێدی ئەوەی دەرگـەیەکی نوێ بکەینـەوە بەسـەر بیرکردنەوەمـاندا. چونکە بـیرکردنەوە زۆر دەوڵەمـەند و فرە بابـەتە و زۆر شت هـەن کـە هێـشـتـا نـەک هەر ڕۆشنبـیـری کـوردی بگرە دیدی مرۆڤـایەتی پەی پێ نەبردووە. ئەمـەش دەگـەڕێتـەوە بۆ خـەمسـاردیی مـرۆڤ چونکە

ئەم بابەتە بابەتێکی گشتییە و وابەستە نییە بە یەک مرۆڤ و یەک کۆمەڵگەوە بگرە هاوبەشە و هەمومان تیایدا بەشدارین. هیوادارم ئەم نووسینە بەشێک بێت لەو پرۆژە گرینگەی کە پێویستە بێتە ئاراوە. لەم باسەدا (بزربوون) و (دەرکەوتن)مان هەیە کە پێچەوانەی یەکترن بزربوون بۆ حاڵەتی شتێکە کە هەیە بەڵام شاراوەتەوە و دەرناکەوێت. واتە بزربوون جیاوازە لە (نەبوون) نەبوون شتێکە نییە، بەڵام (بزربوون) شتێکە جارێ لێرە نییە و شیمانەی دەرکەوتنی هەیە. وەک عەقڵ کە دەرنەکەوت مانای ئەوە نییە کە نییە. بەڵکو هەیە بەڵام لەباری بزربووندا هەیە. عەقڵ کە دەردەکەوێت خۆیەتی دەردەکەوێت و بزریش دەبێت هەر خۆیەتی پاشەکشە دەکات، بۆیە دەرکەوتن جیاوازە لە (پەیدابوون)، پەیدابوون شتێکە دروست کراوە وەک ماشێن، ماشێن پەیدا بووە پێش حاڵەتی پەیدابوونیشی بزر نەبووە، بگرە نەبووە. بۆیە دەبێت ئاگامان لە تێگەیشتنی ئەو دوو چەمکە هەبێت بۆ ئەوەی دواتر بەهەڵەدا نەڕۆین. دۆخەکانی مرۆڤ هەر لە جەوهەردا هەن و هەر لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤ دەست دەکەن بەدەرکەوتن و گەشەکردن. وەک دۆخی جەستە و دەروون. بۆیە جەستە کۆمەڵێک ڕێکخەری هەن کە مرۆڤ ئاگەدار دەکاتەوە کەی برسیەتی کەی تینوویەتی..... تاد. دەروونیش ڕێکخەری هەیە مرۆڤ ئاگەدار دەکاتەوە لە شتەکان هەروەها دوای هەرزەکاری دۆخی عەقڵی دەست پێ دەکات لەناو مرۆڤدا. ئەوەی گرینگە کە ئەم دۆخانە هەریەکە دۆخی ڕاستەقینەیان هەیە و سیستەمێک هەیە کە کاتی هاتنیان دیاری دەکات کە ڕێکخستنەکە هەر لەناو خۆیاندایە. بەڵام دۆخی ساختە هەیە کە دەستکاریی سیستەمەکە دەکات و کاتەکان پاش و پێش دەخات. وەک پێشتر باسمان کرد وەک نەوسنی و..... تاد یان تووڕەبوون و ئایدۆلۆجیا کە مرۆڤ خۆی نییە و ئەوی ترە، هەموو ئەمانە بۆ خۆیان کاتی خۆیان دەزانن کەیە. بەڵام مرۆڤ بێ ئارامە و دێ دەستکاریی دۆخەکان دەکات. هەروەک زانستی تەکنەلۆجیا دەورێکی گرینگی گێڕاوە لە دروستکردنی دۆخی ساختە بۆ مرۆڤ. وەک ئەوەی لە تیڤییەوە شتەکان وەک وێنە نیشانی چاوی مرۆڤ دەدات. ئەم چاوە وای لێ دێت ئیتر چێژ لە سروشتی ڕاستەقینە نەکات و چێژ لە وێنە بکات. ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ مانای شتەکانی گۆڕیوە، بەشێوازێک هەر ڕووداوێک ڕاگەیاندن نەیکاتە ڕووداو نابێتە ڕووداو. هەر بۆیە ئەمڕۆ پارەیەکی خەیاڵی سەرف دەکرێت لە ڕاگەیاندندا، چونکە بووەتە

ماناگەیێنی شتەکان. ئەمە دۆخێکی ساختەیە دەدرێتە جەستە و سایکۆ کە دواتر هەردووکیان زەرەرمەند دەبن. یان ئەو خواردنانەی کە دەستکاری کراون لەلایەن زانستەوە کە دواتر هەمووی دەبنە هۆی نەخۆشی، ئەوە جگە لە کوشتنی تام و بۆنی جەوهەری شتەکە، چونکە زانست هارمۆنییەتێک هەیە لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا دێت دەستکاریی دەکات و شتەکان دەگۆرێت. ئەمرۆ نەخۆشیی سەیر سەیر سەر هەڵدەدەن هەمووی بەرهەمی دەستکاریکردنی ئەو هارمۆنییەتە ناوەکییەیە لەناو سروشتدا . کە جەستەمان تووشی نەخۆشی دێت وەک زیادکردنی موو بەخواردنی مریشکی دەواجن. یان کزبوونی چاو بەهۆی تیڤی یان بزواندنی ئارەزووی سێکسی لە رێگەی وێنەی تیڤییەکانەوە کە جەستە خۆی ئامادەگیی تێدا نییە و دۆخێکی ساختەی بۆ دروست دەکرێت و دواتر باجەکە جەستە دەیدات. کە زەرەرەکە سێلایەنەیە بۆ نموونە چاو جگە لە خۆی لە بەشێکی سایکۆدا گرینگە و لە بەشێکی کاری عەقڵیشدا وەزیفەی خۆی هەیە، بۆیە هەموو دۆخە ساختەکان بەزەرەری مرۆڤ کۆتاییی دێت. چونکە لە دۆخی راستەقینەدا ئەو رێکخستنە تایبەتەی کە هەیە لە نێوان دۆخەکاندا تەواوکەری یەکترن. چونکە کاتی تایبەت هەیە مرۆڤ لە دۆخی جەستەدایە دواتر دەروون یان عەقڵی، ئەم دەرکەوتن و بزربوونی دۆخە بۆ خۆیان لەناو یەکدا یاسا و هارمۆنییەتیان هەیە، بەڵام بەدەستکاریکردن جار هەیە مرۆڤ دۆخی جەستەی هەیە ئیتر دێت دەست دەداتە کاری عەقڵی. کە بەمە مرۆڤەکە ناتوانێت شتەکان بەدروستی ببات بەرێوە. پاشخستن و پێشخستنی دۆخەکان بەپێی دۆخە ساختەکان کە لە دەرەوەی مرۆڤ دێن زۆر زەرەرمەندن، چونکە شتەکان کامڵ ناکات و بەنیوەناچڵی جێیان دەهێڵێت. بەگشتی زانست دەورێکی خراپی هەیە لەم کارەدا وەک مۆبایل، مۆبایل قسەکردن نییە لەگەڵ کەسی بەرامبەردا بگرە قسەکردنە لەگەڵ وێنەی ئەو کەسەدا کە لە یادگەدا وەک بیرەوەری هەیە. جا یان ئەوەتا دەیناسین و وێنەکەی حازر دەکەین. یا نایناسین و وێنەیەکی بۆ دروست دەکەین، ئەویش لە رێگەی قسەکردنەوە وێنەکە دێت، کێشەی ئەم وێنە دروستکردنە ئەوەیە ئێمە دەکەوینە ناو وێناکردن و خەیاڵکردنەوە. کە دوورمان دەخاتەوە لە ناسینی کەسەکە. کاتێک دەبینین وێنە دروستکراوەکە تێک دەشکێت و ئەو زەمەنەی تێپەریوە مانای نامێنێت. دۆخی ساختە خەتەر و ترسناکە بۆ مرۆڤ کاتێک دەستکاریی رێکخستن

و قـانوونەکانـی مـرۆڤ دەکـات، چونکە ئەو کـاتە مـرۆڤ تـام لە شـتـەکان ناکـات و بەخـەیاڵ لە شـوێنێکە و بە واقـیعیش لە شـوێنێکی ترە. هەروەک ئەو مـامـۆسـتـایەی کە لەگەڵ قوتابیدا هـاودۆخ نییـە لێرەدا نە مامـۆسـتـاکە هەست بە حـزووری قوتابی دەکـات نە قـوتابیش هەست بەحـزووری مـامـۆسـتـا دەکـات، بگرە فـێڵ دەکەن لەگەڵ یەک قـوتابییـەکە جـەسـتـەی خـۆی نیـشـانی مـامـۆسـتـا دەدات و بە خـەیاڵیش لە دەرەوەیە. مــامـۆسـتــاکـەش ئازادی وەردەگـرێت لەوەی کـە هـەرچی هەیە بـەناوی زانسـتـەوە بیـڵێت. ئەم دۆخـە سـاخـتـانە زۆر زیانی گـەورەی لە شـتـەکـان داوە وای کـردووە هیـچ شتێک لە شوێنی خـۆی نەبێت. مـرۆڤ هـەیە بیست سـاڵە مامـۆسـتـایە هـەسـتی نیـیـە کـە مـامـۆسـتـایە، بیـست سـاڵە زەواجی کـردووە هـەسـتی بـە هیـچ نەکردووە. بگرە بەخـەیاڵ ژیاوە تەنانەت بە خـەیاڵ سـێکسـیی کـردووە. مـرۆڤی دانا ئەوەیە ئەم دۆخانە دەناسێتەوە و هـەروا بەئاسـانی و بەسادەیی تەسلیمی دۆخەکان نابێت، دۆخی ساختەی بیرکردنەوەش هەیە ئەویش ئایدۆلۆجیایە کـە ڕێگە دەگرێت لە دەرکەوتنی عەقڵ. چونکە یـەک جۆر ئایدۆلۆجیا نییە هـەموو شـتێک ئیمکانی بە ئایدۆلۆجیا بوونی هـەیە. هەموو ئایدۆلۆجیایەکیش بۆ ئەوەیە مرۆڤ بیـر نەکاتەوە و عـەقـڵی بـەکـار نەهێنێ، ئایدۆلۆجـیـای دینی نـاهێـڵێ جـەوهـەری دین ببـینین، ئایدۆلۆجیـای حزبی ناهـێڵێ جـەوهـەری سیـاسـەت ببینین، ئایدۆلۆجیـای فـەلسەفە ناهێـڵێ جـەوهـەری فـەلسـەفە بزانـین. ئایدیۆلۆجیـا فـێری تەمـبـەڵیـمـان دەکـات و شـتـەکـانمان بەحـازری دەداتێ و زۆر سـادە پێناسـەی شـتـەکـان دەکـات. بەڵام لە بیـرکـردنەوەدا عـەزاب و مـاندووبوون هـەیە. ئایدۆلۆجیـا دوای ئـەوەی بیـرکـردنەوەی مـرۆڤ داگـیـر دەکـات، ئەوجـا دادەبەزێتـە سـەر دەروون و جـەسـتـەی بایەلۆجی. بۆ نموونە ئایدۆلۆجیایەکی دینی کاتێک دەبێتە ئایدیالی مرۆڤ دواتر دێتە ناو دەروون و دەسـتـکاریی تەبیـعـەتی دەکـات و حـەزی سـاخـتـەی بۆ دروست دەکـات و ڕقی ساختەش دروست دەکات، وەک بەحەرام زانینی هـونەر و فیلم و مۆسیقا و..... تاد پاشـان لێـرەش دێتـە خـوار و دەچێـتـە سـەر جـەسـتـەی بایەلۆجی. کە شـێـوازی دەمـوچاوی وەک کـارەکـتـەری ناو حیکایەتـە دینییـەکان لێ دەکـات، بەمـەش دۆخی ساخـتە دەداتە جـەستـەی و کەسەکە منی خۆی بزر دەبێت و ئەوی تر حـزوور پەیدا دەکـات لەسـەر بیـرکـردنـەوە و دەروون و جـەسـتـەی. ڕۆشنبیـری دوای ڕاپـەڕین کـە دۆخی ڕاسـتـەقینەی هـەیە. بەڵام کـردیانە دۆخـێکی سـاخـتـە بۆ خـوێنەر و بووە بە

ئایدۆلۆجیا و منی کەسەکانی کوشت. چووە ناو بیرکردنەوەی خەڵک و ڕاگەیاندن و ڕۆژنامــە و ڕاگـەیاندنەکـانەوە پاشـان چووە نـاو خـەیاڵی خـەڵکەوە و دەسـتکاریی تەبیعەتی کرد. کە خوێنەر هەوڵی بەکارەکتەربوونی ناو پاڵەوانی حیکایەتەکانی ئەوانی هەیە. پاشان جەستەی بایەلۆجیی خوێنەریش گۆڕانی بەسەر داهات. وەک هەڵگرتنی جـانتـا و سـەکـسـوک و..... تاد هەندێک لەو ئەتەکێتانەی کە بوونەتە سیمـای ڕۆشنبیر و ڕۆژنـامـەنووس. کە ئەمـانە دەکرێت بۆ هەندێک کەس دۆخی ئاسـاییی خۆیان بێت، بەڵام ئەم دۆخـە گشتی بووەوە و دۆخی سـاختـەی وەرگرت. لەمەش ترسناکتر ئەم ئایدۆلۆجیایە بووە بنەمـا و ئەساسـی پێوەندیی کەسەکان بە یەکـتـرەوە، وەک هـاوڕێیـەتی و هـاوسـەرکاری و پرۆسـەی فیکری و.... تاد. زۆرن ئەوانەی لەناو ئەو دۆخـە ساختـەیەدا بوونـەتە هاوڕێ و هاوسـەر و هـاوبیـری یەکتر، بەڵام تووشی کـارەسـات بوون و بەخـەیاڵ دەژین لەگەڵ شـتـەکاندا. ترسـناکیی ئەم ڕەوتە لەوەدا بوو مـانـای شـتـەکانیان فـاسـد کرد. فـەلسـەفـەیان قێزەون و فیکریان ناشـیـرین کرد، تـا ئەو ڕادەیەی شـتـەکـان بوونەتـە نەریت و بیـرکـردنـەوە زیز بوو. ئێستاش خوێنەر بێزارە و هیچ هیـوایەکیش نییە. تاکە هیوایەک ئەوەیە بگەڕێینەوە ناو خـۆمـان و لەنـاو خـۆمـاندا ئەو ڕۆشنـاییـیـە بدۆزینەوە. لە سـەرەتاوە دەست پێ بکەینەوە و بۆ یەکەمین جار مامەڵە بکەین لەگەڵ شتـەکاندا و پرسـیـاری چییـەتیی شتەکان بکەینەوە سەرلەنوێ. لەناو خۆماندا ئەو ئومێدە لە بیرکراوە بدۆزینەوە.

دۆخی سـاختـە ڕێکخسـتنەکانی ناو مـرۆڤ تێک دەدات چونکە عـەقڵ و سـایکۆ و جەسـتە دەمی تایبەتییان هەیە بۆ دەرکەوتن و بزربوون، کە ئەم دەمە ڕاسـتـەقینەیە بەسـەرچوو مرۆڤیش دەکەوێتە ناو خەیاڵەوە و بـەهـەقیقی شتەکان نابینێ. گەڕانەوە بۆ ناو عـەقڵ و برینی دۆخـە سـاختـەکان یەکـەمین هەنگاوە بـۆ خـۆنوێنی مـرۆڤ، لە دۆخی ڕاستەقینەدا شتەکان خۆیانن دەردەکەون، بەڵام لە دۆخی ساختەدا شتەکان نین بگرە وێنا دەکرێن. واتە ئەوە عـەقڵ نییە دەردەکەوێت بگرە ئەوی ترە لەناوماندا بوونی هەیە. ئەو دۆخـە سـاخـتـانەیە دنیـای بێ مـانا کـردووە، شـتـەکانی کردووەتە سێبەر و شتی هەقیقی نەماوە. بۆیە مـەحوی لەبەر هیچی دنیـا کە بووەتە زەوینەی دۆخی ساختە بۆ شتەکان دەڵێت:

"دنیـــا تیـــا ترۆیە، مـــەوەســـتـــە تیـــا، برۆ
کێ مـــایەوە تیـــا، کـــە نەبوویێ تیـــا، ترۆ

دنیـــایەکـــە دوو ڕۆژە نەوازش بکا، ســێـــیـــەم
ڕۆژی گـــودازشـــە، ئەمـــەتە داکی ســێـــبـــەڕۆ
ڕووترش و ڕووخـــۆشـــە لە رووێکا، لە یەک دەمـــا
قـــەهـری درۆیە، مـیـــهـری درۆ، هـەردوو هەر درۆ
پشـــتی کـەدا بە پشـــتـــەوە، بۆ پشت شکاندنە
ئەمـــڕۆ خـــودا شـــوکـرتە، ســـبـــەینێ براله ڕۆ
پیــری نەمـــامی باغی جـوانیــمـی کـردە پووش
تـازەم درەخـــتی تووڵـی ئەمـــەل دەردەکـــا چرۆ
گــەردن کـەچی چڵـێکە ســەرئەفـرازیە گــوڵـی
بروانە، چاوەکــەم، کــە لـەســـەر چاوە جـێی بڕۆ
"مـەحوی" بە (مـوتوا) وە کە لـە مـردن ببی نەجات
ڕوياندنت لە پێـــشـــە، لە پێـــشـــا وەرە بڕۆ"(٦٦)

**٧- دۆخی عەقڵی وەک سەرەتای خۆنوێنی مرۆڤ:**

مـرۆڤ لەناو دۆخـەکـانی جـەسـتـە و دەروونـدا، بەهەمـوو دۆخـە تايبـەتيـەکـانی خۆيانەوە پـاشـان ژيانی مـرۆڤ لە نێوان واقـيع و خـەياڵيدا لەسـەر ئاسـتی دۆخ و لەسـەر ئاستی واقيع مرۆڤ لە بەردەم ئەونوێنيـدايە و ئەوی تر سـەرتـاپای ژيانی داگـير دەکات. ئەوی ترە بڕياری ژيانی دەدات و شـتێک نامـێنێتـەوە بەناوی (من). ئەوەی هەيە لەناو فەزای گشتی و کۆمـەڵگەدا دەتوێتەوە. مرۆڤ دوور لە کۆمـەڵگە و ئەو فەزايە بۆی نييە بژی و بير بکاتەوە. ئەوانەی کە هـەموو کات غـەمگين و هـەموو کات هەست بە تەنيايی دەکەن. ڕاسـتی ئەم مـرۆڤـانە پلـەيەک بەرزترن لەوانەی کە لەناو کۆمـەڵگەدا دەتوێنـەوە و هيچ نين جگە لە دەفرێک بۆ هـەڵگرتنی ئەوی تر. وەک يادگەيەک کولتوور و عادەت و هەموو ئەو شـتانەی کۆمـەڵگە دەيداتە تاک هـەڵدەگرن لە خـۆياندا. ئەوانـەی کـە ئەونـوێنن چ وەک دۆخـەکـانی دەروون و چ وەک واقـيع و ژيانی خەياڵی هيچ کێشەيان نييە. تا ئەو شوێنەی کە ڕووبەڕووی شتێک دەبنەوە و کۆمـەڵگە بەفريايان نايـەت، کاتێک ئەم کەسـە تووشی کێشـە دەبێت و کێشـەکە ناوەکی دەبێتـەوە کـۆمـەڵگە نـاتوانێت لە نـاوەوە چارەسـەری ئەم کـێشـەيە بکات،

چونکە کۆمەڵگە و ئەو فەزا گشتییانە. هەردەم بەعەقڵێکی هەستەکی کار دەکەن و توانای بینینی ناوەوەی مرۆڤیان نییە. ناتوانن لەو شوێنەدا کۆمەکی کەس بکەن. ئەم کەسە لەو بارەدا هەست بە تەنیایی دەکات و هەست دەکات شتەکان بێ مانان.

کەسانێک هەن هەر لە سەرەتاوە بەتەواوی ناچنە ناو شتەکانەوە بەردەوام پێیەکیان لە دەرەوەی شتەکانە. واتە لە بیرکردنەوەدان. ئەم حاڵەتە حاڵەتێکی ڕەسەنی مرۆڤە، بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەڵگە پەی بەم شوێنە نابات هەرگاڤ مرۆڤ وابەستە دەکات بەدەرەوەی خۆی و ڕێگەی گەڕانەوەی لێ دەگرێت. ئەم تەنیایی و غەریبییە تەنانەت زانستی دەروونناسی بە نەخۆشیی دەزانێت. هەروەها ڕێنوێنیی مرۆڤ دەکات کە زۆر بیر نەکاتەوە، چونکە تووشی قەلەق و گومان دەبێت. بۆیە دێت ئەم کەسە دەباتە گەڕان و سەفەر جا ئەو کەسانەی ئەم حاڵەتەیان بە قورسی گرتووە هەست بەبێ مانایی شتەکان دەکەن، ئەمەش لە دەرەوە دێت کە ئەوەندە دەتوێتەوە لەناو کۆمەڵگەدا تا ڕۆژێک لە کێشەیەکدا هەست دەکات کە خۆی نییە و چەند تەنیایە و بێ ئیرادەیە. چونکە شتەکانی لە خۆیەوە هەست پێ نەکردووە. خۆی نەبووە چاکەی کردووە یان خراپەی کردووە. چونکە مرۆڤ بوونی ئەوەیە خۆنوێن بێت، خۆنوێنی درێژەدانە بەعەقڵی و دابەزینیەتی بۆ ناو واقیع. واتە کە چاکە دەکات چاکەکە لەبەر خودی خۆیەتی و هیچ ئامانج و سوود و بەرژەوەندیی لە پشت نییە و چاوەڕێی ئەنجامەکە ناکات چییە. ئەمە خۆنوێنیە و ئەونوێنی نییە. ئەو خۆشییەی ئەو کەسە دەیچێژێ لەو کاتەدا زۆر گەورەترە لەوەی چاکەی لەگەڵ کرابێ. ئەم خۆشییە خۆبینینەوەی مرۆڤە لە چاوی خۆیەوە، واتە خۆی خۆی دەبینێ و تووشی حاڵەتی سەرسوورمان و کەوتنەوە ناوخۆی دێت. ئەم کەسە خۆش دەژیت گەر بەردەوام بێت.

بەڵام بۆ ئەوانەی ئەونوێنن هەردەم لەبەر عەیبە و ترس و مەبەست و.... تاد چاکە دەکەن. ئەو خۆی نییە هیچ خۆشی نابات لەو شتانەی کە دەیکات. کارەساتەکەی لەویادایە کە شتەکان مانای نامێنێ لەلای. هەتا ئەو ڕادەیەی ژیان بێ مانا دەبێت لەلای. ئینجا سەرباری ئەمە کێشەکانی تریش دەبنە سەربار وەک کێشە کۆمەڵایەتی و دەرەکییەکان. ئەم کەسە تا شوێنێک دەڕوات ئینجا هیچ چارەسەریشی نییە، چونکە شوێنێک نییە جگە لەوەی کۆمەڵگە دروستی کردووە.

ئیـتـر تووشی کـاردانەوە دەبێت وەک (شـەڕ، بوورانەوە، لەبەرخـۆوە قـسـەکـردن، گەشکە.... تاد).

ئەم نەخۆشییانە کە زانستی دەروونناسی حاڵەتەکانی کۆنترۆڵ کردووە. مرۆڤ لەم بارەدا سـەری لێ دەشـێـوێت و نازانێ چی بکات. بوورانـەوە و گـەشکە و ئەو حاڵەتانە هـەمووی خۆغایبکردنی کەسەکەیە لەخۆی و لەو کێشەیە. جا لە واقیعدا بێت یان لە یادگـەدا. زۆرجـار مـرۆڤ لەناو یادگـەیدا دەکـەوێتـە شـەڕ لـەگـەڵ نەیارەکـانی و ئەم بارە دەرکـەوت دەکـات و کـەسـەکـە لە واقـیـعـدا ئەم شـەڕەی لێ بەدیار دەکەوێت، وەک دەست جووڵاندن و قسەکردن و... تاد.

ئەو کـەسـە لەناو حـیکایەتی یادگـەی خـۆیدا دەژی بەڵام ئیـتـر ئەوەندە هیـلاکـە خەیاڵ و واقیع تێکەڵ دەکات. ئەم حاڵەتانە هـەمووی خۆونکردنی مرۆڤە. ئەو مرۆڤە ناتوانێت لەو ڕەوشـتـەی خـۆی تێ بگات و کۆمـەڵگەش چاوی ئەم شـوێنە نابینێت بۆیە کـەسـەکە تەسلیم دەبێت. بەتایبەتی لە کۆمـەڵگەی ئێمـەدا دەکەوێتە بەردەم دەوروبەری جـیـاواز ئەوانیش (پزیشکی دەروونی) و (شـێخ و مـەلاکـان)ن، کـە بەداخـەوە هەردوو تەیارەکە مـرۆڤ مـاڵوێران دەکات. پزیشکەکـان وەک نەخـۆش مـامـەڵەی لەگەڵ دەکەن. شێخـەکانیش جنۆکەی تیا دەبینن. کەسـەکەش بەرگەی نەمـاوە و تەواو تەسـلیم دەبێت و دەکـەوێتـە بەردەم هەردوو بـەرەکە. کـێشـەی ئەم کـەسـانە زیاتر سـایکۆلۆجـیـیـە بەڵام پزیشکە نـەزانەکـانی ئێـمـە مـامـەڵە لەگەڵ جـەسـتـەی بایەلۆجـیـیـان دەکـەن. وەک دەرمـان و کـارەبا و... تاد لە ڕێگەی وێرانکردنی یادگەی کەسـەکەوە دێن بیرەوەرییـەکانی دەکوژن و سفری دەکەنەوە ئیتر کەسەکە هیچی بیر نامێنێ.

بەداخـەوە ئـەم کـارە بکوژانەی پزیشکەکـان دەیکەن بەناوی زانسـتـەوە هـیـچی کەمتر نییە لە کوشتنی مرۆڤێک. مرۆڤ خاوەنی بیرەوەریی منداڵی و گەنجی و... تاد بەڵام دێن هـەمووی دەکوژن لە پێناوی کوشتنی یەک بیرەوەریدا. بۆ خـۆشـیـان باش دەزانن کـە هیچ نازانن و ئەو زانسـتـەشـیـان وەرگرتووە لەسـەر سـیـقـەی ناو زانکۆکان نەک خۆیان کەشفیان کردبێت.

نەخۆشیی دەروونی پێوەندیی بەجەستەوە نییـە، تەنانـەت فرۆید وەک یەکەمین دامـەزرێنەری زانسـتی دەروونناسی یەکـەمین کـارێک کـردی جـیـاکـردنەوەی

سایکۆلۆجیا بوو لە جەستەی بایەلۆجی. ئەوەشی ڕاگەیاند کە دەروونناسی دەبێت لەسەر سایکۆ کار بکات نەک جەستە. لێرەدا پرسیارێک هەیە گرینگە بیورووژێنین ئەویش ئەوەیە بۆچی شێخەکان سەرکەوتووترن لە چارەسەرکردن لە پزیشکەکان؟ سەرکەوتوویی شێخەکان لەوەدایە مامەڵە لەگەڵ باوەڕ و بیرەوەریی کەسەکان دەکەن نەک جەستەی بایەلۆجی. بیرەوەریی کەسەکان ناکوژن، بەڵکو دێن لە ڕێگەی ئەو باوەڕەی کە هەیەتی کە وەک بیرەوەرییەک لە یادگەیدا هەیە. ئەم بیرەوەرییە گەشەی پێ دەدەن و باڵاپۆشیی پێ دەکەن بەسەر تەواوی یادگەدا. واتە لە جیاتیی ئەو بیرەوەرییەی کە پێشتر ژیانی تێک داوە دێن ئەمە دەپووکێننەوە و بیرەوەرییەکی تر گەشە پێ دەکەن. لە ڕێگەی قورئان و ژیانی پێغەمبەرەکان و..... تاد.

کەسەکە ئەم بیرەوەرییە کە شێخەکان بەهێزی دەکەن و دەرەکیی دەکەنەوە کەسەکە وەک هێزێک وەری دەگرێت و دەیکاتە قەڵغانێک بۆ بەرگری لە کێشەکان، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم شتانە قەڵغان نین بەڵام کەسە وا دەزانێت. نازانێ کە لە ڕاستیدا هیچ ڕووی نەداوە و هیچ تێگەیشتنێک نییە بۆ کێشەکان. ئیتر بەم هێزە ئایدۆلۆجییە دێتەوە ناو کۆمەڵگە و خۆی یەکسان دەکاتەوە لەگەڵ کۆمەڵگە و ئەویش قبووڵی دەکات، ئیتر وا دەزانێت چاک بووەتەوە.

ئەم حاڵەتانە لەژێرەوەڕا حاڵەتی ڕەسەنی ناو مرۆڤن، بەڵام لەبەرئەوەی شتێک نییە ناوی ناوەوە بێت لای ئێمە مرۆڤ وەک شتێکی سەیروسەمەرە و ترس لێی دەڕوانێت. ئەم حاڵەتە گەر مرۆڤ تێی بگات سەرەتای هەنگاونانی مرۆڤە بۆ ئەوەی لە ئەوی تر ڕزگاری بێت. کە شێخ بە (جنۆکە) و پزیشک بە نەخۆشیی دەزانێت. ئەم حاڵەتە سەرەتایەکی باشە بۆ بیرکردنەوە، کە مرۆڤ تاقەتی ژیانی نامێنێت. هەروەک دیکارت دەڵێت "تێڕامانی دوێنێ پڕ لە گومانی کردم، بەشێوەیەک ناتوانم لەناو خۆمدا بیانسڕمەوە و ڕێگەیەکیش نادۆزمەوە بۆ چارەسەرکردنیان. وەک ئەوەی لە ناکاو کەوتبێتمە نێو ئاوێکی زۆر قووڵ بۆیە زۆر حەپەسام و نەمتوانی نە لەسەر ئاوەکە و نە لە بنی ئاوەکە خۆم بگرمەوە"(٦٧)

دیکارت جوان باسی ئەو حاڵەتە دەکات کە کەسەکە نە لەسەر زەوییە و ناشگاتە شوێنێک، بەڵام تاکە ڕێگەی ڕاستەقینە خودی فەلسەفەیە. کە مرۆڤ وەعی دەکات

بەخـۆی و دەیگەیەنـێ بەخـۆی و لە ئەوی تر ڕزگـاری دەکـات. ئەگـەرچـی ئەم ڕایە قورسە بەڵام هەقیقەتە.

فـەلسـەفـەیە کـە کۆمـەکی مـرۆڤ دەکات و مـرۆڤ کـە تووشـی حـاڵەتی عـەدەم دێت دواتر کە دێتەوە ناو کۆمەڵگە خۆنوێنە، شتەکان بۆ ئەو تازەن و دووبارە نین. لێرەدا کەسەکە لە دۆخی عـەقڵی تێدەگات. ڕاستیی دۆخی عەقڵی دۆخی خۆبیرکردنەوەیە، دۆخی خـۆدۆزینەوەیە. ئەوە تەنیا عـەقڵە توانای ڕزگارکردنی مرۆڤی هـەیـە و مرۆڤ ڕادەگرێت لەسـەر پێی خۆی. ئیتر ئەم کەسـە دەزانێت چی دەکات و لە حـاڵەتەکانی ناوەوەی خـۆی تێ دەگات. دۆخی عـەقڵی دەوری دەدات و لە حـاڵەتی بیرکردنەوەدا دەبێت و نهێنیی خۆی و جیهان ئاشکرا دەکات.

لە ڕاسـتیدا فـەلسـەفـە ئەو وەعیە ناوەکییـەیە، کە مـرۆڤ دەگات بە هۆشـیـاریی بەرامـبـەر بەخـۆی. نەک لەسـەر بنـەمـای سـایکۆلۆجـیـا، کـە هـۆشـیـاری لای ئەو بەتاڵبوونەوەیە. بەدەر لەوەی مرۆڤ هـەستی بە شـتـەکان کردبێت و عـەقڵی خـۆی خستبێتە کار. ئەو بەتاڵبوونەوەیەی پزیشک و شـێخـەکان دەیدەنە مـرۆڤ دۆخێکی سـاختـەیە و ئەو کـەسـە بە ئایدۆلۆجـیـا بەتاڵ دەبێـتـەوە، نـەک ڕۆشناییی عـەقڵ و تێگەیشتنی شـتـەکان مـانایان نەمێنێت بۆیە ناچارین بڵێین کە فـەلسـەفـە تاکە ڕێگەیە بۆ ڕزگـاربوونی تـاکی کـورد و دۆزەکـەشی، کـە لای لێ نـەکـراوەتەوە و بەم زانسـتـە نەتوانراوە کـورد ڕاڤـە بکرێت. بە زانسـتـەکـانی کـۆمـەڵناسی، دەروونناسی.... تاد کـورد خوێنراوەتەوە، بەڵام تا ئێـسـتـا هیچ شـیـانێک لە ئارادا نییە بە فـەلسـەفـە دۆزەکەمـان بخوێنێتـەوە. دیارە هـەوڵی ساختـە هـەیە بۆ فـەلسـەفـە بەڵام ئایدۆلۆجیـا بەرهـەم دەهێنێت و وەک ئایدۆلۆجیـاش وەری گرتووە. ئەمـە نەک هـەر ڕۆشناییی نەخستووەتە سەر شتەکان، بگرە تاریکییەکی گەورەی لەگەڵ خۆی هێناوە. هیوادارم ئەم نووسینە ڕێخۆشکەر بێت بۆ خوێنەری ئێمە و تێ بگات لەناو هـەمووماندا فەیلەسووفێک هـەیە. عەقڵێک هـەیە نیازی بەدەرکـەوتنە ئەویش لە منی خۆمان بەولاوە هیچی تر نییە.

**٨- سەفەری مرۆڤ لە نێوان دۆخەکاندا:**

ئێـمـە بەدرێژاییی ئەو باسـە جیـاوازی و جۆری دۆخـەکانمان باس کـرد. دواتر باسی جیـاوازیی ژیانەکـانمان کرد. وەک ژیانی واقـیـعی کـە جـەسـتـەی بـایەلۆجی

تیایدا چالاک بوو. لەگەڵ ژیانی خەیاڵی کە سایکۆلۆجیا چالاک بوو. لەگەڵ ژیانی عەقڵی کە خودی عەقڵ لێرەدا چالاکە.

هاوتەریب لەگەڵ ئەمانەدا دۆخەکانیش باس کران، بەڵام دۆخەکان یەکەمین ئەو پلەبەندییەن لە ژیانی مرۆڤدا چونکە ئەوە دۆخەکانن دواجار واقیعەکان دێننە کایەوە. مرۆڤ سەرەتا لەناو دۆخەکاندا دەگوزەرێ دواتر ئەم دۆخانە هەریەکەیان خاوەنی هێز و ئاراستەن کە پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێن بۆ ئەوەی ئەم دۆخانە لە دۆخێکی ناوەکی بگۆڕن بۆ ژیانێکی دەرەکی و واقیع بە گشتی ژیانی مرۆڤیش لە نێوان دۆخەکان و واقیعەکان تێپەڕ ناکات و ئیتر مرۆڤ سەفەری جیاجیای هەیە. لە نێوان دۆخی ژیانەکاندا. جار هەیە لە دۆخی جەستەوە سەفەری هەیە بۆ دۆخی دەروون و لەوێشەوە بۆ دۆخی عەقڵ، ئەم سەفەرانە یان ئەوەتا خۆی دەداتە دەستی یان خۆی ئەنجامی دەدات. جا مرۆڤەکان جیاوازن لە یەکتری. هەیە هەموو ئینتیمای بۆ ژیانی واقیعی و جەستەی بایەلۆجیی خۆیەتی. ئیتر ئەم کەسە بەردەوام لە دۆخی جەستەدایە و پارێزگاریش دەکات لە دۆخەکەی خۆی. ئەم مرۆڤە دەگەڕێت بەشوێن جۆرەکانی دۆخی جەستە و لە نێوان ئەم جۆرانەدا سەفەرەکانی خۆی دەست پێ دەکات.

وەک وەرزش و نانخواردن و گەڕان و هەموو ئەو دۆخانەی کە لە جەستە دەکەونەوە، ئەم کەسە بۆ خۆپاراستن لە دووبارەبوونەوە دێت دۆخەکانی جەستە دەگۆڕێت، لێرەدا ئەم کەسە ئامادە نییە کە دۆخەکانی تر تاقی بکاتەوە و وەربگرێت. لە ڕاستیدا دۆخی جەستە و سایکۆ پێکەوە کار دەکەن بەڵام کەسەکە ئاگای لە دەروونی خۆی نییە. بۆ کەسێک کە دۆخی دەروونی ژیانیەتی ئەمیش لەناو دۆخەکانی دەرووندا سەفەرەکانی خۆی دەست پێ دەکات وەک خۆشەویستی و شەڕ و خۆبینینەوە لە چاوی بەرامبەردا و هەوڵدان بۆ ناسراوی و ناوبانگ..... تاد. ئەم مرۆڤە دێت ئەم کایانە تاقی دەکاتەوە کە دەروونی تیایدا ئارام دەبێت و چێژ وەردەگرێت. مرۆڤ هەیە هەردووکیانی هەیە و وابەستەیە بە هەردووکیانەوە. جا هەر کەسێک لە واقیعدا دەژیت و لەگەڵ ئێمە گوێ دەگرێت و وەک جەستە حزووری هەیە. بەڵام ئەم کەسە بەخەیاڵ لە دەرووندا حزووری هەیە و لە واقیعدا ون بووە. جاریش هەیە بەپێچەوانەوە کەسەکە لە دەرووندا بزر بووە و لە واقیعدا حزووری هەیە. مرۆڤ ڕۆژانە لە نێوان واقیع و خەیاڵدا سەفەری جیاجیای هەیە

دەکەوێتە ناو کردەی خەیاڵکردن و بەخەیاڵداهاتن و خەیاڵگۆڕکێوە. جاریش هەیە هەر ساتە و لە بەشێکی بیرەوەریی خۆیدا حزووری هەیە. جاریش هەیە لە واقیعدا سەفەری خۆی دەکات و شوێنەکان تاقی دەکاتەوە. بۆ ئەوانەی ئەم دوو جۆرە لە دۆخیان هەیە بەتەنیا ناتوانن بژین و شتێک نییە ناوی (من) بێت. ئەوەی هەیە بریتییە لە کۆمەڵگە و دۆخی گشتی و ژیانی گشتی. ئەمانەش هەمووی ئەوی ترن. جا ئەم کەسە بەپێی پێوەندیی تەبیعەت و هاوڕێیەتی و هاوسەرکاری و پێوەندییەکانی خۆیان ڕێک دەخەن. بەڵام ئەوەندە هەیە ناتوانن بیر بکەنەوە هەموو بیرکردنەوەیەکیان لە چوارچێوەی عەقڵی گشتیدایە، هەردەم خاوەنی ڕای کۆمەڵگەن نەک خۆیان. هەر بۆ ژیان و واقیع و خەیاڵی ژیانێکی پڕ گرێ و گۆڵە، چونکە هەردووکیان پێویستییان بەخزمەتکردن و ڕاکەڕاک هەیە. ئەوەی واقیعییە دەبینێت لەگەڵ واقیع بڕوات هەر ڕۆژە و شتێک بێ و هەر ڕۆژە و لەسەر پەتێک یاری بکات. ئەمانەش مرۆڤ ماندوو دەکات. دەبێت مرۆڤ توانای خۆگۆڕینی هەبێت هەر ڕۆژە و بارێک وەربگرێت و بارێک فڕێ بدات. مرۆڤ لێرەدا وەک تراویلکەی لێ دێت جار هەیە دیارە و جاریش هەیە بزرە. هەمووشی لەدەست ئەوی تردایە. بۆ ئەوەی ژیانی خەیاڵی هەیە پێویستی بەقوربانیدانە، بیرەوەرییەکان یاریی پێ دەکەن و دۆخی دەدەنێ و لێی دەسێنن. واتە لە هەردوو بارەکەدا مرۆڤ خۆی نییە و بێ ئاگایە لە شتەکان نازانێ بۆ هاوڕێی فلان کەسە نازانێ بۆ مۆسیقارە بۆ.. بۆ.. بۆ.... تاد هەموو ئەم نەزانییە غیابی عەقڵە لە مرۆڤدا. هەر بۆیە ئەوەی کە ئینتیمای هەیە بۆ ژیان و دۆخی عەقڵی ئەو کەسە سەفەرەکانی خۆی دەست پێ دەکات لە نێوان ژیانەکانی جەستە و دەروون و عەقڵدا. ئەو کەسە دوورتر ڕوو دەدات و قووڵتر دەژیت. کاتێک ئەو کەسە دەکەوێتە ناو دۆخی عەقڵییەوە جەستە و دەروونیشی دۆخی عەقڵ وەردەگرن و یارمەتیی دەدەن بۆ دەرکەوتنی ئەم دۆخە وەک واقیع.

جاریش هەیە دۆخی عەقڵی بزر دەبێت و کەسەکە وەک هەر مرۆڤێکی ئاسایی دەژیت و دەکەوێتە ناو جەستە و دەروون. چونکە ئەم دوو دۆخەش گرینگیی خۆیان هەیە. گەر ئەم دوو دۆخە نەبن ژن و مێردەکان ناتوانن پێکەوە کۆ ببنەوە و سەرجێیی بکەن. چونکە گەر دۆخی عەقڵی بەردەوام بێت ئەوا جەستە و دەروون نامێنێ و غایب دەبن. جیاوازیی عەشق و زەواج لێرەدا دەردەکەوێت، عاشق و

مەعشووق ئەوانەن کە لە دۆخی عەقڵیدان و هاودۆخن کۆبوونەوەی ئەوان هەموو کات لە فەزای عەقڵیدایە. گەر هاتوو ترازان بۆ دۆخی جەستە یان دەبێتە زەواج یان خۆیان دەدۆڕێنن، بەتایبەتی گەر عەشقەکە لە نێوان ژن و پیاودا بوو. ئەمە بەو مانایە نییە کە زەواج عەشقی تیا نییە، نەخێر! زەواج پڕە لە عەشق ئەو ساتەی کە ژن و مێرد دەبنە هاوڕێ و لەیەک دەگەن.

لێرەوە مانای عەشق زۆر بەجیاواز دەکەوێتەوە لەوەی بیستوومانە. عەشق بەو مانایەی ئێمە باسی دەکەین ئەوەیە کە عاشق لەمەعشوقدا عەشقی خۆیەتی و مەعشوق لە عاشقدا عەشقی خۆیەتی. مەعشوق هەردەم باڵاترە، چونکە مەعشوق ئەو کەسەیە کە عەقڵیترە و عاشق نزمترە، چونکە هێشتا کۆت و زنجیری جەستە و دەروونی پێوە ماوە. مەعشوق عەشقی ئەو چاکەیەیە کە دۆخی عاشق دەهێنێتە دەر، عاشقیش قبووڵی عەزابی عەشق دەکات. واتە بۆ عاشق عەزاب لە ڕێگەدایە، بەڵام بۆ مەعشوق چاکە. عاشق کاتێک خۆی واڵا دەکات لە بەرامبەر مەعشوقدا لەناو مەعشوقدا ڕۆحی خۆی دەبینێ. چونکە مرۆڤ ناتوانێت سەرەتا خۆی ببینێ و پێویستی بەئاوێنە هەیە ئاوێنەکە مەعشوقە.

واتە زۆر جار پێوەندیی نێوان ژن و پیاو عەشقە و زەواج نییە و بە زەواجیش کۆتایی نایەت، بگرە ئەمە خۆدۆزینەوەی ئافرەتەکەیە بەڵام لەناو پیاوەکەدا. هەردەم پیاوان مەعشوقن و ژنان عاشق. لێرەدا هەڵەیەک هەیە نابێت ڕوو بدات ئەویش ئەوەیە. پیاوەکە دەبێت ئەوە جیا بکاتەوە کە ئەوەی ئەو ئافرەتە عەشقیەتی ئەو نییە و ڕۆحی خۆیەتی. ژنەکەش دەبێ ئەوە بزانێت کە ئەو ڕۆحی خۆی دەوێت نەک پیاوەکە. گەر توانییان ئەم یاسایە بپارێزن دەتوانن درێژە بە هاوڕێیەتییەک بدەن کە عەقڵ تیایدا حاکمە. هەموو کات لەگەڵ یەک دەبن و فێر دەبن بێ ئەوەی لەسەر ئاستی جەستە کۆ ببنەوە. دەبێت ئەوەش بڵێین کە جەوهەری زەواج عەشقە. بەڵام بەو مانایە نا، چونکە عاشق و مەعشوق دەکەونە ناو بەبیرهاتنەوەی یەکتر بەمانا سوکراتییەکەی. واتە عەشق ئەو حاڵەتەیە کە مرۆڤ دەکەوێتە ناو دۆخی عەقڵییەوە جا فەیلەسووفەکان عاشقی عەقڵی خۆیان بوون، واتە عەقڵ مەعشووقە و فەیلەسووفەکانیش عاشق. هەر بۆیە دەڵێن فەیلەسووف عاشقی داناییە واتە عەقڵە.

چونکە ئێمە لە عەقڵەوە فێر دەبین و مەعریفەمان چنگ دەکەوێت. لەسەر خۆمان و ئەوی تر. بەڵام حاڵەتی عەشق بۆ عاشق و مەعشووق سەرەتا زۆر قورسە بۆ هەردووکیان واتە عەزابێکی گەورە دەبینن لەگەڵ یەک. بەجۆرێک تووشی هاودۆخی دەبن. گەر شتێک بەبیرکردنەوەی یەکیان بڕوات هەمان شت لەویتر ڕوو دەدات. زۆر شتی نادیار و تاریک هەن ڕۆشن دەبنەوە. پاش بڕینی ئەم قۆناغە کە مەعشووق تێ گەیشت عاشق عەشقی ڕۆحی خۆیەتی نەک ئەو (ئەو وەک زەوینەیەکە بۆ لەدایکبوونی عاشق) عاشقیش زانی کە ئەوەی ئەو عاشقیەتی ڕۆحی خۆیەتی نەک مەعشووق. لێرەدا حاڵەتی لێک جیابوونەوە ڕوو دەدات. عاشق ڕۆحی دەباتەوە ناو خۆی. بگرە ئەو کە دەزانێت ئەوە لەناو خۆیایەتی و مەعشووق ئاوێنەیەکە دێتەوە ناو خۆی و مەعشووقیش زەوینە دەسازێنێ و دەرگەکە دەکاتەوە بۆ چوونەوەی عاشق بۆ ناو خۆی. لێرەدا عاشق لەدایک دەبێتەوە و پلەی بەرزتر دەبێتەوە بۆ سەر ئاستی مەعشووق و خۆنوێن دەبن. پێوەندییەکە دەگۆڕێت چونکە سەرەتا بەهۆی عاشقەوە سۆز و عاتیفە تێکەڵ دەبێت. بەڵام دواتر عەقڵ زیاتر حزوور پەیدا دەکات لە نێوان هەردووکیاندا. ئیتر عاشق پێ دەگات و تێ دەگات و لەسەر لاقی خۆی دەوەستێت. ئەم جۆرە لە عەشق پێوەندیی بەڕەگەزەوە نییە وەک مرۆڤ و خوا، سوکرات و ئەفلاتوون یان (مارتن هایدگەر) و (هانا ئارانێت) یان پێوەندیی نێوان (ئۆجەلان) و گەریلا ژنەکانی. ئەم حاڵەتە تەنیا ئەو کەسانە سەفەری بۆ دەکەن کە دۆخی عەقڵییان هەیە و دۆخێکە لە دۆخەکانی عەقڵ. بۆ زەواجیش ئەم عەشقە هەیە ئەویش حاڵەتی بزربوون و دەرکەوتنی هەیە وەک دۆخێکی عەقڵی دێت و دەڕوات. لێرەدا ئێمە بابەتێکی زۆر گرینگمان باس کرد. بەهیوای ئەوەی ئەم تیۆرە ڕێگەمان بۆ ڕۆشن بکات بۆ ئاشکرابوونی هەقیقەت لەناو هەموو کایەکانی ژیانماندا.

هەولێر – ئازادی ٢٠٠٧/١١/٢١

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- مدخل علم النفس، لندال دافيون، الطبعة الثالثة، دار ماكجروهيل للنشر، ص ٣٦٨.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٦

٣- علم النفس وتطبيقاته الاجتماعية والتربوية، د. عبدالعلي الجسماني، طبعة الاولى، دار العربية للعلوم، سنة ١٩٩٤

٤- مدخل الى الطب النفسي، د. الزين عباس عمارة، طبعة الاولى دارالثقافة، سنة ١٩٨٦

٥- نووسەر و رۆشنبیر (بەختیار عەلی) لە یەکێک لە چاوپێکەوتنەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە ئێمە کولتووری فەلسەفیمان نییە. بڕوانە (وەڵام لە رۆژگاری ونبوونی پرسیاردا).

٦- بوون لە دیدی (مارتن هایدگەردا) تەعبیرە لە عەقڵ، کە لەناو مرۆڤدا هەیە و نیازی بەوە هەیە دەرکەوێت، بەداخەوە (بوون) لە رۆشنبیری کوردیدا بە شتێک دەوترێت کە هەیە. عەقڵیش شتێکە (دەبێت) نەک (هەیە).

٧- تێرامانی میتافیزیکانە لە فەلسەفەی یەکەم، رینێ دیکارت، و: ڕێبین ڕەسووڵ، دەزگای چاپ و پەخشی ڕێبین، هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧، لاپەڕە ٦١

٨- هـ. س، ل ٥٨

٩- هـ. س، ل ٥٥

١٠- سەرەتاکانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازی، ماکس هۆر کهایمەر، و: سامان عەلی حامید، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٦١

١١- كتابات اساسية، الجزء الثاني، ماالميتا فيزيكا، مارتن هيدجر، ت: اسماعيل المصدق، المجلس الاعلى للثقافة _ القاهرة، طبعة الاولى، س ٢٠٠٣، ص ٢٤

١٢- هـ. س، ل٢٧

١٣- هـ. س، ل ٢٦

١٤- کۆتاییی مێژوو دواین مرۆڤ، فرانسیس فۆکۆیاما، و: ئیسماعیل کوردە، خانەی وەرگێران، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٨، لاپەڕە ٤٢٧

١٥- ئیگۆ و ئید، سیگمۆند فرۆید، و: یوسف عوسمان حەمەد، سەنتەری نما، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٥، لاپەڕە ٤٦

١٦- هـ. س، ل ٢٩

١٧- سـايكۆلۆژياى جەماوەر، گۆستاڤ لۆبۆن، و: ئارام جەمال سابير، مەكتەبى بير و هۆشيارى (ى. ن. ك)، چاپى يەكەم، سلێمانى، ساڵى ٢٠٠٦، لاپەڕە ٥٩

١٨- هـ. س، ل ٧٣

١٩- چەمكى (ئەوى تر) ئێمە لێرەدا وەك چەمك مامەڵەى لەگەڵ دەكەين، كە هەموو ئەو هێزانە دەگرێتەوە دەكەونە دەرەوەى مرۆڤ و بۆ ساتێك مرۆڤ ئاراستە دەكەن. دەكرێت (دەسەڵاتى سياسى، باوك، مامۆستا، مەلا.... تاد) هەموو ئەمانە ببنە ئەوى تر لە بەردەم مرۆڤدا و وەك هێزێك بچنە ناو مرۆڤەوە و ئاراستەى بكەن.

٢٠- چەمكى (ئێستا) لاى (بەختيار عەلى) باسى لێ كراوە بەڵام بەداخەوە كە ئەم چەمكەى وەك وشە بەكار هێناوە نەك چەمك. ئێمە لەسەر وتارى (بيرەوەرى و زەمەن)ى كاك (بەختيار) كارمان كردووە بە درێژى بگەڕێوە بۆ كۆوارى (ئاينده)، ژمارە ٨٦ى ساڵى ٢٠٠٩ بەناوى (ڕۆشنبيريى دواى ڕاپەڕين وەك بكوژى من) لەو لێكۆڵينەوەيەدا ئەم باسە بە تێرى باس و خواسى لێ كراوە.

٢١- (مەسعوود محەمەد) يەكێكە لە بيركەرەوەكانى كورد كە تيۆريەن لە شتەكان دواوە. بەداخەوە برادەرانى (ڕەهەند) كاتێك هاتن و وەك شەپۆلێك باڵيان كێشا بەسەر ڕەوتى ڕۆشنبيريى كورديدا هێندە خۆيان تۆخ كردووە، كە هەموو هەوڵێكى پێش خۆيان پايەماڵ كرد و، وايان لە خوێنەر گەياند پێش ئەوان هيچ هێڵێكى مەعريفى بەرچاو ناكەوێت. ئەوەى هەيە لە دەست و خامەى ئەوانەوە كەوتووەتەوە. (مەسعوود محەمەد)يش يەكێكە لەو قوربانييەى دەستى ئەوان كە بە نەريتپارێز ناوى دەبەن.

٢٢- (ناسرى سوبحانى) ئەم پياوە خەڵكى كوردستانى ئێرانە، لە ساڵانى هەشتاكانى سەدەى بيستەمدا. بيركەرەوەيەكى گەورە بووە دەسەڵاتى ئێران لە ترسى بيركردنەوە بەهێزەكەى وەك هەموو پاڵەوانێكى ترى مەيدانى بيركردنەوە لەسێدارەى دا. بابەتى بيركردنەوەكانى برێتييە لە (بوونى خوا) و تێگەيشتن لە چييەتيى مرۆڤ و سروشت كە هەر لەو سەرەتايەوە دەستى پێ كردووە كە (ديكارت)و (لابينيز) دەستيان پێ كرد و بوونە سەرەتايەك بۆ لەدايكبوونى فەلسەفە لە ئەوروپادا. ئەم پياوەش سەرەتايەكە بۆ لەدايكبوونى فەلسەفەى لاهووتى لەناو كورددا.

شاردنەوەى ئەم پياوە لەناو كايەى ڕۆشنبيريماندا دوو هۆى هەيە يەكەميان ئەوەيە كە (يەكگرتووى ئيسلامى) ئەم پياوەى كردووە بە موڵكى خۆى بەجۆرێك بەپێى سياسەت و بيركردنەوەى خۆى لە ڕێگەى بانگخوازەكانيەوە دەيناسێنێت وەگەرنا تاكە

بیرکردنەوەیەک دژ بێت بەبیرکردنەوەی (ناسری سوبحانی) بیرکردنەوەی یەکگرتووی ئیسلامییە. دووەم کەم گەڕان و ناسەلیقەیی ڕۆشنبیریی کوردیمانە ئەم پیاوەی بزر کردووە.

٢٣- بڕوانە: وتاری (سەرۆک بارزانی) لە کۆنفرانسی پێشمەرگە و کاربەدەستانی پارتیدا، ١٥ی نیسانی ١٩٦٧، گەلاڵە، لاپەڕە ١٧

٢٤- بڕوانە: (فرەنیس فۆکۆیاما)، سەرمایەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەی مەدەنی. و: کامیل محەمەد قەرەداغی، خانەی وەرگێڕان، ساڵی ٢٠٠٨

٢٥- سەرەتاکانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازی، ماکس هۆرکهایمەر، و: سامان عەلی حامید، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، ساڵی ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٢٢

٢٦- هـ. س، ل ١٢٥

٢٧- هـ. س، ل ١٢٨

٢٨- هـ. س، ل ١٦١

٢٩- بڕوانە : سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٥

٣٠- تێڕامانی میتافیزیکانە لە فەلسەفەی یەکەم، رینێ دیکارت، و: ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل، دەزگای چاپ و پەخشی ڕێبین، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧ لاپەڕە ١٢٥.

٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧.

٣٣- لێکدانەوەی خەونەکان، سیگمۆند فرۆید، و: ئاوات ئەحمەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٣، ل ٨١.

٣٤- هـ. س. پ، ل ٦٢.

٣٥- هـ. س. پ، ل ١٤٤.

٣٦- هـ. س، ل ١٤٧.

٣٧- ناسری سوبحانی لە وتارەکانیدا بەتایبەت لە وتاری (دروستبوونی ئادەم) زۆر ورد، جیاوازیی نێوان ڕۆح و نەفس ڕوون دەکاتەوە، باسی جیاوازییەکانی نێوان ڕۆح پێش ئەوەی بچێتە ناو جەستەوە لەگەڵ ئەوەی دەچێتە ناو جەستەوە دەکات. ئومێد دەکەم خوێنەر بگەڕێت بەشوێن وتارەکانی ئەم بیریارەدا و ئاگایی بخاتە سەر ئەو بیرکردنەوە عەقڵییەی ئەم پیاوە دینی پێ ڕاڤە دەکات.

٣٨- کانت یەکێک لە نووسراوەکانی بەناوی (پرۆژەیەک بۆ ئاشتیی جیهانی) باسی پێوەندیی نێوان دەوڵەتان دەکات لەسەر بنەمایەکی عەقڵی ئەم کتێبە دواتر بووە

بنەمایەک بۆ لەدایکبوونی سیاسەتی نێودەوڵەتی.

edited by: Edith Hamilton and Huntington,Plato, Part1, page 772- 747 -Partl Cairs-39

لەگەڵ ئەم دەقەدا سوودمان لە هەردوو وەرگێڕانەکانی بەڕێزان (د. محەمەد کەمال) (سۆران عومەر حەمە، ڕێبوار قارەمانی، مەهدی حەسەن) وەرگرتووە بەڵام لەبەرئەوەی دەقە ئینگلیزییەکە وەک وەرگێڕانەکەی (د. محەمەد کەمال) ناوی بەشدارانی نەنووسیوە، ئێمە ناچار بووین کە بۆ ناوەکان دەقی دووەمی وەرگێڕانەکە وەربگرین وەک فۆرمی وەرگێڕانەکە.

٤٠- دیارە ئێمە ناتوانین جیاوازییەکی وا بدۆزینەوە لە نێوان ئەفلاتوون و سوکراتدا، بەڵام سوکرات بنەما و ماکی سەرەکیی بیرەکانی ئەفلاتوونە، ئەفلاتوون لەم دەقەدا بەتەنیا وەک ریکۆردەرێک هەیە و سوکرات دەگوازێتەوە بۆ ئێمە.

٤١- بۆ ئەم کێشەیە و باسکردنی ناکردن و بیرەوەری بگەڕێوە بۆ وتاری (رۆشنبیریی دوای ڕاپەڕین وەک بکوژی من)، گۆواری (ئاینده) ژمارە (٨٤)ی ساڵی ٢٠٠٩ لاپەڕە ٣٥- ٥٤.

٤٢- (وجود- بوون) لای هایدگەر خودی عەقڵە کە وەک تواناداریی هەیە لە مرۆڤدا و نیازی بەدەرکەوتن هەیە لە جیهاندا.

٤٣- كتابات اساسية، الجزء الثاني، ما الميتا فيزيكا، مارتن هيدجر، ت: اسماعيل المصدق، المجلس الاعلى للثقافة _ القاهرة، طبعة الاولى، س ٢٠٠٣، ص٣٣

٤٤- هـ. س. پ ل ٣٤.

٤٥- هـ. س. پ ل ٢٥.

٤٦- هـ. س. پ ل٢٤.

٤٧- هـ. س. پ ل٢٣.

٤٨- هـ. س. پ ل ٢٣.

٤٩- هـ. س. پ ل ٢٣.

٥٠- هـ. س. پ ل٢٢.

٥١- (موجود- هەبوو) بوونە لە حاڵەتی دەرکەوتندا، ئەمەش عەقڵە لە جیهانی هەستیدا.

٥٢- مارتن هایدجر، ما المیتافیزیکا، ص ٤٣.

٥٣- بڕوانە کتێبی (گەنج و قەیرانی ماڵ) یەکێک لە کتێبەکانی ئێمەیە. لەوێدا باسی (ماڵ) دەکەین و ئەوە دەوروژێنین کە ماڵی ڕاستەقینەی مرۆڤ لە کوێیە، ئەم کتێبە بەداخەوە نەهاتە ناو کایەی ڕۆشنبیرییەوە، چونکە ڕێکخراوی تواناسازیی لاوان

چاپیان کردووە، کەمتەرخەم بوون لە بڵاوکردنەوەی.

٥٤- بڕوانە: تێڕامانی میتافیزیکانە لە فەلسەفەی یەکەم، دیکارت، کە باسی بەتاڵبوونەوەی مرۆڤ دەکات لەو شتانەی لە دەرەوەی مرۆڤەوە هاتوونەتە ناو مرۆڤەوە.

٥٥- پۆزش، ئەفلاتوون، و: ئاوات ئەحمەد، چاپ و ئۆفیسی دەزگای سەردەم، ساڵی ٢٠٠٢، سلێمانی، ل ٥٨-٥٩.

٥٦- هـ. س. پ، ل ٨٠.

٥٧- فایدۆن، ئەفلاتوون، و: ئاوات ئەحمەد، چاپخانەی رەنج، ساڵی ٢٠٠٣، سلێمانی، لاپەڕە ٤٢.

٥٨- ئەمە چییە، فەلسەفە؟ مارتن هایدگەر، و: د. حەمید عەزیز، کۆواری رامان، ژمارە ١١٢ ساڵی ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٣٤.

٥٩- هـ. س. پ ل ١٣٥.

٦٠- هـ. س. پ ل ١٣٥.

٦١- هـ. س. پ ل ١٣٨.

٦٢- مێژووی فەلسەفە، هیگڵ، و: عیرفان مستەفا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٥، لاپەڕە ١٩٩.

٦٣- هـ. س. پ، ل ١٩٩.

٦٤- تێڕامانی میتافیزیکانە لە فەلسەفەی یەکەم، رینێ دیکارت، و: رێبین رەسووڵ، دەزگای چاپ و پەخشی رێبین، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، لاپەڕە ٥٥.

٦٥- بڕوانە: کۆواری (ئایندە). (تێڕامان لە هونەری شێوەکاری)، ژمارە ٨٦، ساڵی ٢٠٠٩، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، لاپەڕە ٦-٢٣

٦٦- دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم چاپی دووەم، ل ٢٥٣

٦٧- رینێ دیکارت، تێڕامانی میتافیزیکانە لە فەلسەفەی یەکەم، و: رێبین رەسووڵ، دەزگای چاپ و پەخشی رێبین، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ل ٤٣.

